# ژیاننامەی پێغەمبەری پێشەوا بە هۆنراوە

هۆنینەوەی

فەرهاد جەوهەر برادۆستی

ئامادەکردنی

دلێر علی حمید

2007



# ژیاننامەی

# پێغەمبەری پێشەوا

# بە هۆنراوە

هۆنینەوەی

فەرهاد جەوهەر برادۆستی

ئامادەکردنی

دلێر علی حمد

٢٠٠٧

ناوی کتێب:-

ژیاننامەی پێغەمبەری پێشەوا بە هۆنراوه

هۆنینەوەی:- فەرهاد جەوهەر برادۆستی

ئامادەکردنی بۆ چاپ :- دلێر علی حمد

پێداچوونەوەی زانستی:-مامۆستا نۆشیروان قادر حمد

پێداچوونەوەی ئەدەبی:- دلێر علی حمد

تایپ و هەڵەگری و نەخشەسازی :- دلێر علی حمد

ڕێنووس و خاڵبەندی:- هیوا أحمد عصاف

تیراژ:- ١٥٠٠ دانه

نۆبەتی چاپ:- چاپی یەکەم ٢٠٠٧

چاپخانەی ڕۆشنبیری / هەولێر

.............................................................

﴿ لەسەر ئەرکی خێرخوازان چاپکراوە﴾

خودا پاداشتی خێریان بداتەوە و نموونەیان زۆربکات

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٦٩)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

# سوپاس و پێزانین

* سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە کە هێز و توانای پێ بەخشیم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

* سوپاس بۆ هاوسەرە خۆشەویستەکەم و منداڵە خۆشەویستەکانم کە هەردەم پشت و پەنام بوون و بەبێ هاوکاری ئەوان هیچ کارێکم لەدەست نایا.

* سوپاس بۆ مامۆستا (نۆشیروان قادر حمد) کە هەستا بە پێداچوونەوەی زانستی و بابەتیانەی ئەم ژیاننامەیە.

*سوپاس بۆ کاک (دلێر علی حمد) کە لە هەموو قۆناغەکانی نوسین و چاپکردنی ئەم ژیاننامەیە هاوکاری کردم.

* سوپاس بۆ کاک (هیوا أحمد عصاف) کە ئەرکی خاڵبەندی و رێنوسی خستە ئەستۆی خۆی.

* سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بە نووکە قەڵەمێك ، یارمەتیەکی ماددی، تەنانەت بە قسەیەکیش هاوکاریان کردووم لە نوسین و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە .

دووبارە سوپاس بۆ خودا

# پێڕست

# ژیاننامەی ئەم ژیاننامەیە

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على خير خلقه محمد (ﷺ )و على آله و صحبه و التابعين الى يوم الدين و بعد

خوێنەری بەڕێز بۆ ئەوەی تۆش ئاگاداری هەندێك لەو قۆناغانە بیت کە ئەم ژیاننامەیەی پێدا ڕۆیشتووە تاوەکو بەم شێوەیەی ئێستای گەیشتۆتە بەردەستت ، حەزدەکەم تۆی بەڕێزیش کەمێك لەم بەسەرهاتانە بزانی.

ناسینم لەگەڵ کاك (فەرهاد) دووساڵ تێپەڕی نەکردبوو، ڕۆژانە سەردانیم دەکرد، زۆربەری جارەکان هەرچەند تەوای ڕۆژ بەیەکەوە بووین، شەویش سەردانم دەکرد، هەر کاتێك بمویستایە دەمتوانی بیدۆزمەوە، چونکە ئەو لەسەر (کورسی گەڕۆك) بوو، نەیدەتوانی زۆرلەماڵ دوور بکەوێتەوە، منیش تازەسەرەتای لاوێتیم بوو و گوڕ و تینێکی باشم هەبوو . هەردووکمان تامەزرۆی باس و خواسی ئەدەبی بووین، نە ئەو کەسێکی تری بۆ ئەم مەبەستە دەست دەکەوت، نەمنیش. من کۆمەڵێك دیوانە شیعری شاعیرانی کۆن و کتێبی ئەدەبیم لەخۆم خڕکردبوونەوە، ئەویش بەهرەیەکی شیعری خۆڕسکی ڕانەهێنراو و پەروەردە نەکراو، زۆربەی کاتمان بەپێداچوونەوەی شیعرەکانی ئەو بەسەر دەبرد، چونکە ئەو بەشێوە زاری خۆی شیعری ئەدەنووسی، کە برادۆستیە.

ڕۆژێك لەڕۆژەگەرمەکانی هاوینی ساڵی ١٩٩٨ ز، دەمەوئێوارە چوومە لای کاك (فەرهاد)، دوای چاك وچۆنی دە تا پازدە لاپەڕە شیعرێکی دایە دەستم و وتی:- بیانخوێنەوە، بزانە چۆنن ؟ منیش سەیرم کردن، هەرچەندە هەندێك کەم و کوڕیان هەبوو بەڵام شیعری باش بوون. کاك (فەرهاد) نیازی وابوو سەرجەمی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بە دوو هۆنراوەی درێژ بنوسێتەوە, سەرەتا پلانەکە تەنها دوو هۆنراوە بوو، هۆنراوەیەکیان لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتایی جەنگی (بەدر) و هۆنراوەی دووەمیشیان لە جەنگی (ئوحد)ەوە تاوەکو کۆتایی، بەڵام ئەوە ئەچووە سەر، ڕۆژ بە ڕۆژ

هۆنراوەی یەکەم درێژتردەبوو، ناچار بووین دا بەشمان کرد بۆ چەند بابەتێکی سەربەخۆ وەك بناغەیەك بۆ ئەم ژیاننامەیە. کارەکە ڕێڕەوی خۆی وەرگرت ، کاك (فەرهاد) بە پشت بەستن بە کتێبی (ژیانی پێغەمبەری مەزن ) لە نوسینی شێخی پارەزانی و بە هەمان زنجیرەش، بابەتەکانی دەنووسی و منیش لەگەڵ خۆم دەمبردنەوە ماڵێ و بەراوردم دەکردن لەگەڵ لەگەڵ هەشت نۆ سیرەی عەرەبی ، کەم و کوڕی و زیادیەکانم بە پێی توانا دەسکاری دەکرد.

تان و پۆی تەواوی ئەم ژیاننامەیە لە دەوروبەری ناوەڕاستی ساڵی ۲۰۰۱ ی زاینی تەواو بوو و کاك (فەرهاد) خۆی لە چاپکردنی خۆش کرد و لە ڕێگایەك دەگەڕا کە چاپی بکات، بەلام من لەوە دەترسام کە کتێبێك لەسەر ئەم بابەتە و بەم قەبارەیە وا بە سووك و سانایی بلاوبکرێتەوە، بۆیەش هەزار شێر و ڕێویم هێنایەوە تا بڕوا بە کاك (فەرهاد) بهێنم جارێ بیر لە چاپکردنی نەکاتەوە و هێشتا ماوەیەتی ساف و لوس بکرێت و گرێ و گۆڵی ئەدەبی و زانستی کەم بکرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لەسەر ئەوە ڕێك کەوتین کەمێش چاپکردن دەستنوسەکە پێشانی چەند کەسێکی شارەزا بدەین. هەرچۆنێك بێت سەرەتا دەستنوسەکەمان نارد بۆ لای مامۆستا (وەرزێر) سوپاس بۆ جەنابی کە دوای دوو سێ مانگ، دەستنوسەکەی بە نزیکەی بیست لاپەڕە تێبینیەوە بۆ ناردینەوە، منیش بە لەبەرچاو گرتنی تێبینیەکانی جەنابی مامۆستا (وەرزێر) دووبارە بەسەرجەم دەستنوسەکەدا چوومەوە و بەنیزنی کاك (فەرهاد) گۆڕانێکی باشم تێیدا کرد، چونکە کاك فەرهاد سەرپشکی کردبووم لە گۆڕینی هەر شتێك لە دەسنوسەکەدا کە بە نەگونجاوم زانیبا، ئەگەر خۆشم نەمتوانیبا شتێکی باشتری لە جێ دانێم ئەوا بەیەکەوە دادەنیشتین و دەمانگۆڕی. سەر لەنوێ کاك (فەرهاد) خۆی لە چاپکردن خۆش کردەوە بە بیانوی ئەوەی کە گۆڕانکاریەکی باشمان تێداکرددوە و ئێستا شیاوە بۆ چاپ، ئەم جارەشیان توانیم ببمەوە ڕێگر و بۆ ماوەیەکی تریش چاپکردنی دوا بخەم، دوای ئەوە

کاك فەرهاد دەستنوسەکەی ناردە لای برادەرانی ( کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامی کوردستان)، ئەوانیش ڕای خۆیان لەسەر نوسی، کە پێویستە هەندێك گۆرانکاری تێدا بکرێت بەرلەوەی چاپ بکرێت، ئەمەش پاڵپشتێکی باش بوو بۆ ڕایەکەی من.

دیسان دەستنوسەکە بۆ ماوەیەکی تر کەوتەوە لای، ڕۆژانە خەریکی دەبووم، لە لایەنی شیعری و (کێش و سەروا)وە پێیدا دەچوومەوە و هەوڵم دەدا هەندێك لە کەم و کوڕیەکانی پڕبکەمەوە، هەرچی لایەنە زانستی و بابەتیەکەشی بوو تەنها دەمتوانی پەنا ببەمە بەر ئەو (سیرە) عەرەبیانەی کە لەبەر دەستمدا بوون، هەر لەو ماوەیەدا دەستنوسەکەم پیشانی چەند برادەرێکی تریش دا کە سەرەداوێکیان هەم لە سیرە و هەم لە شیعریش دەزانی و سوودم لە بیر و ڕای ئەوانیش وەرگرت. لە بەرئەوەی بابەتەکە زۆری خایاند کاك (فەرهاد)یش وەکو جاران لەسەر چاپکردنی سوور نەما، دواتر بە هیممەتی چەند برادەرێك سەرجەمی دەسنووسەکە دووبارە بە خەتێکی جوان نوسرایەوە.

لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٦ی زاینی کاك فەرهاد کەوتە بیری چاپکردنی یەکەمین کۆمەڵە شیعری خۆی کە هەمان ساڵ بە ناوی (ڕێگای هۆشمەندی) بڵاوکرایەوە، لەگەڵ کاك (فەرهاد) شیعرەکانمان گوڵبژێرکرد و چەند برادەرێکی دەستخەت جوان شیعرەکانیان دووبارە نوسینەوە و بەرهەمەکە ئامادە بوو بۆ چاپ، ئەمەش نزیکەی چوار مانگێکی خایاند بەمەش وردە وردە چاپکردنی ئەم ژیاننامەیە دوورتر دەکەوتەوە و منیش کاتێکی زیاترم دەستکەوت بۆ چەند بارە خوێندنەوە و بەسەرداچوونەوەی ، بەڵام بڵاوبوونەوە (ڕێگای هۆشمەندی) و پێشوازی کردنی گەرمی لەلایەن خوێنەرانەو دووبارە کارەکەی لە من ئاڵۆز کردەوە و ڕیسەکەی لێ کردەمەوە خوری، ئەمجارەیان تووشی (ئەمری واقیع) بووم و ناچار دەست لە دەست و هێز لە خودا، شانمان دایە بەر چاپکردنی ئەم ژیاننامەیە. لێرە دەمەوێ هەڵوەستەیەك بکەم و هۆی ترس و دوودڵی خۆماتن بەرامبەر چاپکردنی

ئەم ژیاننامەیە پێ بڵێم، کە بۆچی نزیکەی پێنج ساڵ بوومە بەربەست لە چاپکردنی، بۆ ئەمە پشتم بە دوو خاڵ بەستبوو،
یەکەمیان ؛من گاڵتەم بەزیرەکی خوێنەری کورد نایا و پێم وایە هەر هەڵە و کەم و کوڕی و لاوازییەکی ئەدەبی لە بەرهەمێکدا هەبێت ، زۆر بە ئاسانی هەستی پێ دەکات، بۆیە هەر بەرهەمێك تا پێش چاپکردن زیاتر لە بێژینگ و کەو بدرێت و هەڵە و کەم و کوڕی کەمتر بکرێتەوە باشترە و زیاتر لە ڕەخنە دوور دەکەوێتەوە و بەرهەمێکی تەواو تری لێ دەردەچێت.
خاڵی دووەمیشیان ، کە ئەومیان زۆر گرنگترە و ئێستاش هەر لێی دەترسم ، ئەوەیە کە نوسینەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر مەسەلەیەکەی ئاینی زۆر هەستیارە و هەر هەڵەیەکی بابەتی و زانستی بکەیت زۆر لەسەرت دەوەستێت، هەم لە دونیا و هەم لە قیامەتیش، زۆریش زەحمەتە بتوانی بە هۆنراوە هەموو ئەو وردەکاریانە باس بکەی کە لە ژیاننامە پەخشانیەکاندا نووسراون، یان زۆر جار ناچار دەبی لایەنی زانستی بابەتە بکەیتە قوربانی لایەنە ئەدەبی و کێش و سەروا , کە ئەمەش لەوانەیە وات لێبکات ڕاستی بابەتەکە بەتەواوی نەپێکیت و تەواوی مەبەستەکە نەگەیێنیت.
بۆ ساغکردنەوەی لایەنی زانستی و بابەتی ئەم ژیاننامەیە بەڕێز مامۆستا (نۆشیروان قادر حمد) ڕەزامەندنی پیشاندا کە بەسەر هەموو دەستنوسەکەدا بچێتەوە و بەراوردی بکات لەگەڵ نوێترین سەرچاوەکانی سیرەی پێغەمبەر(ﷺ) جەنابی مامۆستا بە ماوەی زیاتر لە ساڵێك سەرجەمی دەستنوسەکەی ساغکردەوە و من و کاك (فەرهاد)یش هەر شوێنێك جەنابی مامۆستا تێبینی لەسەر هەبووبێت گۆڕیمان و سەر لەنوێ دەسنوسەکە بە خەتێکی خۆش نوسرایەوە و ئامادەبوو بۆ تایپ کردن، خوێنەری بەڕێز لەوانەیە وا تێبگەی لێرە کێشەکەی من کۆتایی پێهات و هەموو شتەکان ڕێك کەوتن، بەڵام نەخێر تەواو پێچەوانەی ئەوە بوو، کاتی تایپ کردن و ڕاستکردنەوەی هەڵەکان لەسەر کۆمپیوتەر ناخۆش ترین قۆناغی ئەم پرۆژەیە بوو بۆ من، زۆربەی شەوەکان ناچار بووم تا سێی و چواری شەو خەریکی تایپ کردن و ڕاست کردنەوەی هەڵەکان بم، لەو

کاتەش ناچار بووم زیاتر لە پێنج جار سەرجەمی ئەم ژیاننامەیە بە چاوی ڕەخنەوە بخوێنمەوە، چەندین جار سێ شەو و ڕۆژی بەسەریەکەوە لە ژوور دەرنەدەهاتم و بە بەردەوامی خەریك بووم، یان لەسەر پەڕەکان، یان لەسەر کۆمپیوتـەر، دواجـار فریـاگوزاری مـن لـەوکارە دەرکـەوت، کـاتێ بـرای خۆشەویستم کاك ( هیوا احمد عصاف) ڕازی بوو بەسەرجەمی ژیاننامەکەدا بـچێتەوە و ڕێنـووس و خاڵبەندیەکـەی بخاتـە ئەسـتۆی خـۆی، سـەرەڕای دەستگیرانی خۆی بە تاقی کردنـەوەکانی ماسـتەر لـە زمـانی کـوردی، لێـرە دەمەوێ سوپاسی بکەم.

دوای ئەوەی گەیشتینە دوا بڕیار و دوا دارشتن بو سەرجەمی ژیاننامەکـە، ئەمجارەیان پێشانی کۆمـەڵێك مامۆستای ئاینیمـان دا لـە شـاری هـەولێر و ئـەوانیش دوای خوێنـدوەی، ئـەم ژیاننامەیـەان بـەکارێکی بـاش زانـی هەریەکەیان شتێکی دەست خۆشکەری لە بارەیەوە نوسی، ئەوەش کـەمێك پشووی پێ بەخشین.

خوێنەری بەڕێز: دوا شت کە حەزدەکەم باسیان بکەم چـەند شـتێکن زۆر دوودڵ بووم لە باس کردنیـان بـەلأم لـە کۆتـایی پـێم وایـە خوێنـەر مـافی خۆیەتی ئەو وردەکاریانەش بزانێ و ئەو بارودۆخەی لە بەر چاو بێت کە بەرهەمەکەی بەر دەستی تێیدا لەدایك بووە.

یەکەم: لەبەر ئەوەی کاك (فەرهاد) دووچاری نەخۆشیەك بووە کە هەردوو قاچی بە تـەواوی کـار ناکـات، هـەردوو دەستیـشی هـەر ئـەوەندەو دەجوڵێن، زۆربەی جار کاتێ کەسی لەلا نەدەبوو کە نوسینەوەی بۆ بکات پێنوسەکەی بە دەم دەگرت و پێی دەنوسی، مرۆڤیش بەم شێوەیە ناتوانێت ببینێ چـی نوسیوە، بیهێنە بەر چاوت چەندسەختە نوسین بەم شێوازە.

دووەم:- لەکاتی نوسینی ئەم بەرهەمـە نوسـەری نوسـەرەکەی ئەوەنـدە لـە ڕووی داراییەوە بێ دەسەلأت بووە کە پارەی نەبووە لاستیکێکی ڕەشکردنەوە (مساحە) بکرێت و ئەگەر هەڵەیەکی کردبا چاوەڕێ دەبوو تـا ئـەو کاتـەی منداڵ لە قوتابخانە دەهاتنەوە، بەڵکو (مساحە) یان پێبا.

سـێیەم:- لـەکاتی خـەریك بوونمـان بـە نوسـین و ڕێکخـستن و بەسـەردا چوونـەوەی ئەم ژیاننـامـەیە، زۆربەی جار خـەڵك و بـرادەران گاڵتـەیان پـێ دەکردین و بە تەوسەوە دەیانوت:- (ها چیە نەگەیشتن بەسەر مانگ، برای من واز لە پەڕ و دەفتەرۆکانە ببێنن خۆتان بە شتێکی بەسوودەوە خەریك کەن)، بیهێنە بەرچاوت چەند سەختە کارێك بکەیت و دەوو بەرەت ساردت بکاتەوە.

لە کۆتایدا ئەمە بەرهەمەکەیە و لەبەردەستت دایـە، تـۆش سەرپـشك بـە بەباش هەڵی دەسەنگێنی یان بەخراپ، پێت وایە ئەو هەموو خـۆ مانـدوو کردنە دێنێ یان نا.

دلێر علی حمد

٣١/ ئاب /٢٠٠٧ هەولێر

# بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

**الحمد لله وكفى و الصلاة و السلام على النبي المصطفى وعلى آله و صحبه و من تبعهم بأحسان الى يوم الدين و بعد**

**هەزاران سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە هەموو هێز و توانایەك لەلای ئەو سەرچاوە دەگرێ. زۆر دەمێکە بە هەموو شێوازێك حەزم لە خزمەت کردنی سیرەی پێغەمبەری خوا بووە، بەوەی کە لە توانامدا هەبووبێ کارم بۆ کردووە، لە باسکردنی ژیانی، خۆشەویست کردنی سوننەتەکانی، ئاگادارکردنەوەی خەڵك لە تایبەتمەندیەکانی وە یا هەرشتێکی تر کە پەیوەست بووبێ بە ژیانی پێغەمبەر. شاراوەش نیە کە لای موسڵمانان کە ئەمرۆکە ڕۆشنبیران و مرۆڤ دۆستان و زانایان و هەتا سیاسەتمەداران باس و خواسی زۆریان هەیە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و دان بەوە دادەنێن کەوا ئەم زاتە چ خزمەتێکی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە، تا وای لێهاتووە هەندێك بیرمەندان پێشبینی ئەوە دەکەن کە سەدەی (بیست و یەك) سەدەی پێغەمبەرە (ﷺ)، بە تا یبەتی من لئێستا لە شارە موبارەکەکەی ئەوم و بە چاوی خۆم دەبینم ئەو هەموو موسڵمانانەی کە لە سەرتاسەری جیهان بە ڕەنگی جودا و بە زمانی جودا و بە گوفتاری جودا، بە گریانەوە، بە جۆش و خرۆشەوەهەستی خۆشەویستی و نوێ کردنەوەی پەیمان دەردەبڕن لە بەرامبەر قەبری موبارەکی پێغەمبەر (ﷺ). من چەند جار لە بەرامبەر ئەوزاتە موبارەکە وتوومە:-( یا رسول الله) چیت چاندووە لە دڵ و دەروونی ئەو خەڵکە کە ئاوا بە شەوق و سۆزەوە سەدەها کیلۆمەتر ببڕن بۆ دیدارت، هەر خۆم وەڵامی خۆم دەداوە و دەمووت:- خۆشەویستی ، بەڵێ ئەو خۆشەویستیە بوو کە (رسول الله)کردیە گەورەترین هۆکار بۆ بنیاتنانی ژیاری ئیسلامی، دەك هەزارەها سەڵات و سەلامت لێ بێ ( یا رسول الله) وە( جزاك الله عنا خير ماجوزيَ نبيٌ عن امته). بۆیە دەڵێم :- جیهان ئەمرۆکە بە باسکردنی زاتی پێغەمبەر گەشەدەکا و باسکردنی ئەو زاتەیە کە بۆتە گەورەترین هۆکار بۆ بۆ نزیك**

بوونــەوەی ژیارەکــان لەیــەکتری، هــەتا لــە هونەریــشدا ئــەمڕۆ هونــەری باسـکردنتی پێغەمبـەر (ﷺ)کێبڕکێـی هونەرمەندانــە، ئـەوەتا کەسـایەتی هونەری گۆرانی وەك (سامی یوسف) کە بۆتە خۆشەویستی هەزاران گەنج و لاو لە سەرتاسەری جیهان. هەمووشمان دەزانین کە بەشی زۆری وشەکانی پێهەڵگوتنە بە بە سەر پێغەمبـەر(ﷺ). وەهەروەها ئێستا لەسـەر تۆری ئینتـەرنێت دەیان سایت کراوەتـەوە، دەیـەها زانـای پسپۆڕ لەسـەر ژیـانی (رسول الله) (ﷺ) شت دەنوسن و لێکۆڵینەوە لە ژیانی ئەو زاتـە دەکـەن و وەردەگێردرێتە سەر دەیان زمان، تا ئێستا لـە جیهانـدا هـیچ فەیلەسـوف و بیرمەنـدێك، یـان سـەرکردەیەك لـە سـەرکردە ناودارەکـانی جیهـان، یـان هەرکەسـێکی بــەناوبانگ لەمانــە هیــچیان بەقــەد (موحەممــەد) (ﷺ) لێکۆڵینەوە لە ژیانیان نەکراوە، یان ژیانیان نەنوسراوەتەوە، هەتا ئەو زاتە هەموو شتەکانی ژیـانی بـە ورد و درشـتەوە هـەموو هـەمووی پارێزراوە و باسی لێوەکراوە بۆیە لەبەر ئـەو شـتانە زۆر بـە دڵنیاییـەوە دەڵێین:- ئـەم سەدەیە سەدەی ناساندن و خۆش ویستنی (رسول الله) یە (ﷺ).

پێش ساڵێك لەمەوبەر بەڕێز كاك( فەرهاد)، کە خـودای گـەورە تـەوفیقی دابوو ژیانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە هۆنراوە بنوسێ ، داوای لێ کردەکە هەڵبـستم بــە ئــەرکی (تحقیــق) لــە ڕووداوەکــان، ســاڵ و کــاتی دروســتی جەنگەکان، وە هەروەها هەر شتێك لە زیاد یـا کـەم و کـورتی بابەتـەکان و هەرشتێکی تر کە پەیوەست بێ بە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، منیـشس ڕازی بووم و دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە باسەکان ، کە خودای گەورە تە وفیقی دام پاش زیاتر لە ساڵێك وە بە پشتیوانی خودای(موتەعال)توانیم لە کارەکە تەواو ببم و ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکەم لەم شتانەی خوارەوە بوو:

١- لە ڕووی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە (عقیدە) هەر پارچەیەك لە پارچەکانی هۆنراوەکە ، یا وشەیەك لە وشەکانی یا واتایەك لە واتاکانی نەگونجاو بوبێ لەگـەڵ ئــەو بــیرو بــاوەڕەی کــە زانایــانی (ســەلەفی صــالح)ی ئــەو ئوممەتــە ئیقراریان لەسەر کردووە، ئەوا بە هاوبەشی لەگەڵ خاوەن هۆنراوە لامـان بردووە و وشەی ترمان بۆی داناوە ، ئەویش بە سوپاسەوە قبوڵی کردووە،

ئەوەشمان بە پێویست زانیبێ چ لەڕووی وشەوە یان لەڕووی بابەتی وماناکانەوە پێداچوونەوەیەك بکەین شتێکی تێدا نەبێ کە لەگەڵ (عقیدەی ئیسلامی)دا نەگونجێ.

٢- ڕوداوەکان و باس و خواسی (سیرە) پێداچوونەوەی باشی دەوێ، لەبەر ئەوە من بە وردی بە هەموو ڕووداوەکاندا چوویمەوە و هەر ڕووداوێك لە چوارچێوەی (تحقیق)ی زانایاندا جێگەی نەبووبێتەوە، یان لە ناو زانایانی(سیرە) بە زیادکراویان زانیبێت‌یان باسێك پێویستی بە تەواوکردن بووبێت کە کاك(فەرهاد) بەردەستی نەبووبێت، یان لەڕووی کات و شوێنی ڕووداوەکان وەهەر شتێك لەو بابەتانە کە پێویستی کردووە کە دەسکاری بکرێت، ئەوا دەسکاریمان کردووە و کاك(فەرهاد)یش بە سوپاسەوە هەموو دەسکاریەکانی قبوڵ کردووە لەڕووی زیادی یان کەمی بابەتەکان و لەسەر ڕێنماییەکانی ئێمە هۆنراوەکەی دوبارە داڕشتۆتەوە.

پێم خۆش بوو لێرە ئاماژە بە هەندێك لەو سەرچاوانە بکەم کە لەو لێکۆلینەوەیە بەکارم هێناون (صحيح الإمام البخاري بشرح إبن حجر- صحيح الإمام مسلم بشرح النووي – السيرة النبوية إبن هشام – السيرة الحلبية الإمام نورالدين الحلبي – الشفا بتعريف حقوق المصطفى ، قاض عياض – السيرة النبوية د. محمد الصلابي – مختصر السيرة النبوية للشيخ محمد عبدالوهاب – فقه السيرة سعيد رمضان البوطي –الرسول سعيد حوى – رجال حول الرسول خالد محمد- اسد الغابة في معرفة الصحابة إبن الأثير – العقائد الإسلامية سيد سابق ... الخ) وە دەیان سەرچاوەی تر کە خستمانەخزمەت ئەم پرۆژە موبارەکە هیواداریین کە هیواداریین خودای گەورە قبوڵی کردبێ. ئەو سەرچاوانەی کە خستومەتە بەر چاوتان کە لە سەرچوە کۆن نوەکانن لەگەڵ پوختی ئەو بەرنامانەی کە خۆم بۆ ماوەی زیاتر لە سێ ساڵە لە (ڕادیۆی یەکگرتوو) لە هەولێر لەسەر ژیان و تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر (ﷺ)کەلە جۆرەها سەرچاوە وەرم گرتووە، ئەمانە هەمووی سەرچاوەکانی بەندە بووینە بۆ پێداچوونەوە لەم پەرتووکە کە باس لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات ئومێدم وایە خزمەتێکی کەممان بە

پێغەمبەری نازدار(ﷺ) پێشکەش کردبێ و دڵنیاشم کارەکەمان کەم و کوڕی هەیە ، چاوەڕوانی هەموو تێبینیەکیش دەبین لەلایەن هەرموسڵمانێك کە بەبەڵگە پێشکەشمان دەکات و کارەکەمان ڕێکتر دەکات.

من لێرەوە ئەو کارە بەرز و دلێرەی کاك فەرهاد دەنرخێنم کە توانی کتێبخانە کورد دەوڵەمەند بکات بە زیادکردنی ئەو پەرتووکە کە لە کتێبخانەی کوردان، بەم شێوەیە نەبووە پەرتووکێك لەسەر ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) بدویّ بە شیعر و هۆنراوە, من چەندجار خوێندمەوە لەکاتی پێداچوونەوەزۆر تام و لەزەتم لێکردووە، زۆر بەئاسانی زۆربەی ژیانی پێغەمبەرت(ﷺ) بۆ باس دەکات، تکام وایە مامۆستایان و بانگخوازان خۆیان بێ بەش نەکەن لە خوێندنەوەی ئەم پەرتووکەوە نەشێ ببێتە سفرەی خێزان لە شەوانی درێژی زستان و گەنجانی لەسەر پەروەردە بکەن، هیواخوازم نوسەران و شاعیران قەڵەم باشتر بجوڵێنن بۆ خزمەتکردنی ژیان و سوننەتی ئەو زاتە موبارەکە.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە ئەم پێشەکیە، لە کاتی نوسینیدا، قەدەر وابوو کە لەبەدەم قەبری (رسول الله) (ﷺ) بینوسم، ڕەنگە خۆشم ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرم لەوە نەکردبێتەوە کە لەگەڵ تەواتو بوونی ئەم کارە پیرۆزە دەگەمە خزمەت (رسول الله) (ﷺ) و پێی ڕادەگەیێنم و لە (مەدینە)ی ئەودا و لە خزمەت قەبرە موبارەکەکەی ئەودا ئەو پێشەکیە دەنووسم، کە ئەمانە لەڕاستیدا بوونە هەوێنی ئیلهام بۆ من بۆ ڕیزبەندکردنی ئەم وشانە، دڵنیام کە ئەمانە هەر هەمووی ویستی خوای گەورەی لەسەر بووە، کاك (فەرهاد) و منیش خوای گەورە بەختەوەری کردین بەم کارە، ئومێد دەکەم لێمانی وەرگرتبێت .

إنه نعم المولى و نعم النصير

نۆشیروان قادر حمد

مەدینەی مونەووەرە

شەوی ٢٤/٢٣ جماد الآخرة ١٤٢٨ کۆچی

بەرامبەر بە ٩/٨-٦ – ٢٠٠٧ ی زاینی

# تەنها بەناوی خواوه

ئـەم كتێبـە هـەمووی بـە هەڵبەسـتی جـوان هۆنراوەتـەوە و بابەتەكەیشی زۆر پیرۆز و پێویستە، چونكە سیرەت و ژياننامـەی پێغەمبەرێكە كە سەردار و پێشەوای هەموو پێغەمبەران و هەموو مرۆڤایەتییە و رەحمەتی خوایە بۆ هەمووان، بە یەكێك لە كتێبـە نایـاب و بـەهادارەكانی نێـو كـوردان و كوردسـتان ئـەژمێررێ و شـاكارێكە لـە بـواری خۆیـدا، كـە ئەبێتـە رەونـەق و پرشـنگ بـۆ كتێبخانـەی كـوردی و ئـەدەب و رۆشـنبیری كوردیمـان بەگـشتی و ئـەدەب و رۆشـنبیری ئیسلامیمان بـە تایبـەتی، چونكە بێجگـە لـە گرنگی و پیرۆزی خودی بابەتەكەی، بە هەڵبەستی جوان و ئاسان و رەوان هۆنراوەتەوە و زۆریش گشتگیر و فراوانە و بۆ هەموو ئاستێك دەست دەدات و پێویستە.

ئەومندەی من بزانم بەم شێوەیە جوان و فراوان و ئاسان و گشتگیرە، تـا ئێستا كاری وا شیاو و نایـاب لـە كتێبخانـەی كوردیـدا بەرچـاو ناكەوێ، بێگومانیشم شتی زۆر جوان و شیرین كراوە لەم بوارانەدا، بەڵام یان وا ئاسان و رەوان و گشتگیر نیە، یان بە چاپ نەگەیێنراوە و بەردیدی خوێنەران نەكەوتووە، یان هەر بەدەستخەتی ماوەتەوە و یـان هـەر فـەوتاوە، چـونكە سـەدان دەسـخەتی كەڵـەپیاوان و مامۆستایانی بێناز و بێناوی ئێمە تووشی نەمان و سوتان و بـەڵای تر هاتوون.

بۆیە من زۆر شادمانم بە بوونی ئەم شاكارە و ئەوهەوڵ و هیممەت و خەباتـەی ئـەم بـرا ئیمانـدارە وەفادارە پـڕ لـە بەهرەیـەم، كـاك (فەرهاد برادۆستی)، كە خۆی بۆخۆی كەسێكی كەم ئەندامە، بەڵام هیممەتی هیممەتی پیاوانە و چۆك بەرەشبینی نائومێدی دائەدا و سـاغ سـەلیمە بـێ هیممەتـەكانیش بـەئاگا دێنێتـەوە و ئـەم وتـە جوانەمان بۆ ئەسەلمێنێ كە ئەڵێت:- (همم الرجال تقلع الجبال) یان

ئەو قسە جوانەی تر کە ئەڵێت :-(رجل ذو همة تحيي أمـة) يـاخوا دەست و پەنجەی ئەو کاك فەرهادە نەرزێ و ئەم ئیشەی بۆی ببێتە کلیلی بە هەشت و بەر شەفاعەتی ئەم پێغەمبەرەی بخات (ﷺ).

م- سەيد أحمد عبدالوهاب پێنجوێنی

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

دەستنوسی کتێبەکەی کاك(فەرهاد برادۆستی)م خوێندەوە کە چەند لایەنێکی ژیانی پێغەمبەری مەزن - درودیخوای لەسەر بێت – بە هۆنراوە نوسیوەتەوە. دڵم پێی خۆش بوو چونکە بە شێوەیەکی جوان و رێك ئەنجامی دابوو، وە ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە زۆرن ئەوانەی کەمئەندام و بێ بەرهەمن، بەڵام کاك فەرهاد ئیسپاتی کرد کە پڕ ئەندام و ئەندێشەیە, ئەو کارەی ئەم زۆر لە ساغ ئەندامان پێیان ناکرێت.

بۆیە بە خۆشحاڵیەوە چەند تێبینیەکم بۆ تۆمارکرد بۆ زیاتر جوان کردنی کارەکەی، ئومێدەوارم کە ئەم کتێبە پاش چاپکردنی کەلێنێکی دیار لە کتێبخانەی ئەدەبی ئیسلامی کوردیدا پڕبکاتەوە



برأستا.

د. بشیر خلیل حداد

مامۆستای زانکۆی سەلاحەددین و

وتاربێژی مزگەوتی جلیل خیاط / هەولێر

٢٦ / جمادی الآخرة / ١٤٢٨

١١ / ٧ / ٢٠٠٧

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وكفى و صلّ الله على نبيّه المصطفى وعلى آله و صحبه ومن والاه:-
لەسەر ژياننامەی پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) ديارە بابەت و شتی زۆر نوسراوە بە شێوازی جۆراو جۆر، كە هەركەسە و ويستوويەتی بە شێوەيەك هەست و سۆز و خۆشەويستی خۆی دەربڕێ بەرامبەر بە پێشەوای مرۆڤايەتی.
بەرهەمی ئەم برا بەڕێزەمان يەكێكە لەم بابەتانە كە بەشێوەيەكی زۆر ناياب و سەرنج ڕاكێش و ڕاست و دروست دای ڕشتووە، كە من بە بەهرەيەكی خودايی تێ دەگەم ، سوودێكی زۆر گرنگی هەيە بۆ ڕۆڵە خوانەاس و تازە پێگەيشتوەكانی كوردستان، لەبەر ئەوە ئامۆژگاری موسڵمانان دەكەم ئەم پەرتووكە تەماشا بكەن و سوودی لێ وەربگرن، ئەوەكانيان لەسەر گۆش بكەن، خوای گەورە پاداشتی برای بەڕێزمان (كاك فەرهاد برادۆستی)بداتەوە، ئەم بەرهەمەی بۆ بكات بە توێشووی دوا ڕۆژی و موسڵمانانيش لێ بەهرەمەند بكات

عبدالخالق ڕوناكی
پێش نوێژ و وتار خوێن لەمزگەوتی ڕوناكی
١٧ی جەمادی يەكەم ١٤٢٨ی كۆچی

# تەنها بەناوی خوای بەبەزەیی

نوسینەوەی ژیانی هەرکەسێ بەڕاستی تۆزێ وردەکاری دەوێ و دەبێ نوسەر زۆر وریا بێ لەوەی تووشی هەڵە نەبێ، بەتایبەتی کە ئەوکەسەی لەسەر دەنوسێ زۆر لەمێژ بێ و ساڵانێکی زۆر کەوتبێتە نێوانیان چ جای ئەو ەی کە ئەو ژیانە بەشیعر و هۆنینەوە نوسرابێ، دەبێ دیسان نوسەر وریاتر بێ کە لەبر خاتری وەزن و قافیە زیادە ڕۆیی نەکا، جا خوێنەری بەڕێز ئەدی ئەگەر ئەو ژیاننامەیە ژیانی کەسێك بێت کە گەورەترین مرۆڤی سەر زەویە و بەڵکو گەورەی پێغەمبەرانیش بێت(سڵاوی خوایان لێ بێ) بەڕاستی شتێکی زۆر گرنگ و گران و پیرۆزە، چونکە نوسینی ژیانی ئەو زاتە کە کەسێکی ئاسایی نیە، هەڵبژێردراوە لەلایەن خوای گەورەوە، نوسینەکەش بە شیعر بێ مەلەوانێکی زۆر شارەزای دەوێ چونکە ئەوە دەریایەکی پان و بێ بنە.

برای شاعیر و بەتوانامان کاکە(فەرهاد برادۆستی)سەرەڕای ئەخۆشی خۆی و ناتەوای دەستەکانی زۆر بە جوانی ئەم کارە پڕبەهایەی ئەنجام داوەکە شتێکی سەرسوڕهێنەرە بەڕاستی، من زۆر سوپاسی دەکەم کە ئەو مەجالەی بۆ ڕەخساندم کە ئەم چەند دێڕەی بۆ بنوسم.

لەڕوانگەی شیعریەوە کاکە(فەرهاد) خۆی شاعیرێکی بە توانایە بەڕاستی وبێ موبالەغە، بەو کارەشی کە ئەنجامی داوە هیوادارم بەهرەی شیعری بەهێز تر بێ.

من تەماشای ئەو پەرتووکە شیعریەی (کاك فەرهاد)م کرد، بە تاکە کاری دەزانم کە بەشیعر و بە تێر و تەسەلی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) نوسرابێ بە زمانی شیرینی کوردی و لە کوردستانی ئازیز، بۆیە پێویستە لەسەر هەمووومان دوعای خێری بۆ بکەین وەدەست خۆشیشی لێ بکەین وە داوا لە خوای گەورە دەکەم کەنوکی خامەکەی تیژتر بکات بۆ نوسینی ئاوا بە پێز.

پیرەلاو

٥/شعبان/١٤٢٨ بەرامبەر ٢٠٠٧/٨/١٨

# پێشەكى

بە هاوكارى خواى بێ هاوەڵ و تاك
كە هەر هەموومان دەكاتەوە خاك

جگە لە زاتى ئەوى بەولاوە
هەر هەموو شتێك دروستكراوە

بۆ ئەوەى كۆن و لە بۆ ئەوەى نوێم
دەربارەى ژينى پێغەمبەر دەدوێم

جا داوام وايە خوێنەرى سەنگين
لە ئێوەى ژير و گوفتار وەك هەنگوين

گەر هەڵەكارم لە من ببوورن
لە هەر جێيەكن ، نزيك يا دوورن

چونكە هەر خوداى تاك و بێ وێنە
كارى بێ هەڵە و لەجێ و خاوێنە

بە هاوكارى خواى گەورە و كار تەواو
ژيانى پێغەمبەر دەخەينە بەر چاو

چونكە ئەم باسە بۆ زۆربەى خەڵك
دەبێتە مايەى قازانج و كەڵك

بە فەرمانى خواى خاوەن خوايەتى
بەديهێنەرى مرۆڤايەتى

(موحەممەد) هەرچەند نێردراوى خوا بوو
كە لەدايك بوو باوكى نەما بوو

دێتــــە ســــەر دونیـــا ســـاڵی (عـــام الفیـــل)
هێمـــــای نـــــەمانی خـــــەڵکی بەنـــــدە و دیـــل

دێنێتــــــە کــــــاوە ڕۆژێکـــــــی شــــادی
خــەڵکـــــی هەڵدەمـــــزن هـــــەوای ئــــازادی

بــەر لـــە هـــاتنی نیگـــا لـــە خـــوای تـــاك
بــەدکاری و خـــووی پـــیس زۆر بـــوو لەســـەر خـــاك

بـــەڵام کــــە نیگـــای بــــۆ دێتــــە خــــوارێ
بــــاران لــــە ئــــاگری تــــاوان دەبـــارێ

ئـــــەو پێغەمبـــــەرە لـــــەو کــــات و دەورە
بــــە پــــشتیوانی خواوەنـــــدی گـــــەورە

بـــــانگی خواناســـــــی ڕادەگــەیێنـــــــێ
خەڵکانـــــی نوســــــتوو ڕادەپــەڕێـنـــــێ

بـــــەردی بناغـــــەی کــــوفر دەردێنـــــێ
کۆشـــــکی ئیــــــسلامی دادەمـەزرێنـــــێ

چـــونکە لـــەو کاتـــە خـــەڵکی بێهـــۆش بـــوون
بـــۆ بـــەندە و بتـــان هـــەر لـــە کڕنـــۆش بـــوون

ڕۆژگـــــار پـــــڕ ببــــوو لـــــە دەرد و تـــــاڵی
تــــاوان کـــــردن و زینـــــدە بەچـــــاڵی

لـــە نـــاو خەڵکیـــدا کـــارێکی بـــاو بـــوون
هەرچـــەند کـــارێکی پـــیس و گـــڵاو بـــوون

بیر و باوەڕی بێ بەها و گەندە
وەك ؛ بەندایەتی بەندە بۆ بەندە

هەروەها ڕیبا و ماڵی یەك خواردن
داوێن پیسیەتی و كاری ڕابواردن

خواردنی ماف و هەروا خوێن ڕشتن
زۆر بوو لە ناویان بە ناهەق كوشتن

هەرچی كارێكی قەدەغەكراو بوو
لەو ڕۆژگارەدا شتێكی باو بوو

بەڵام سەروەری لێهاتوو و نازدار
بە ویستی خودای گەورە و كردگار

ئەو تاوانانە هەمووی لا دەبات
دەیخاتە ژێر پێی ، بن گلیان دەكات

خاوەن دارایی و نەدار و پێخواس
دەكاتە برا و خواویست و خواناس

هەر كارێك ئەگەر خوا بڕەنجێنێ
لە ڕەگ و ڕیشاڵ دەریدەهێنێ

تاوەكو مابوو زۆر بە دڵسۆزی
لە پێناو خودا و ڕێگای پیرۆزی

هەر بەردەوام بوو هەوڵ و خەباتی
ئێستاش گوێ بگرن لە بەسەرهاتی

من داوام وایە لە خوایە تاکە
سۆزی خۆی بۆ سەر ئەو گیانە پاکە

هەتا هەتایە هەر ببارێنێ
تاوەکو میهری پەڵە دەهێنێ

جا ئازیزانم داوامە لێتان
لەو باسە خۆشە باش بگرن گوێتان

تاکو بزانن سەروەری نازدار
لە دەست دوژمنی بێ بڕوا و زۆردار

چۆنی بینیووە دەردەسەری و ئێش
با چەند هەنگاوێك لێی بچینە پێش

زۆر بێگومان بە خوێنەری بەڕێز
سوێند بە خواوەندی بە توانا و بەهێز

هەرکەس بوەستێ دژی ئەو نووره
کاس و کەساس و لە ڕاستی دووره

بۆ خەڵكێك کەوا دڵیان خاپووره
بۆتە داردەست و کلکی چلووره

بەڵام خۆشبەختی بۆ ئەو ڕوو سووره
لە دەوری بۆتە پەرژین و شووره

## باسی لە دایك بوونی (موحەممەد) (ﷺ)

بـــە هاوكـــاری خـــوای بـــەرز و بەخـــشندە
باســـــی پێغەمبـــــەر چـــــاكترین بەنـــــدە

تازەیـــــە و گەرچـــــی كـــــەمێك كـــــۆن بـــــووە
باشـــــە بیـــــزانین ئـــــاخۆ چـــــۆن بـــــووە ؟

لـــــە دایـــــك بـــــوونی ســـــەروەری جیهـــــان
بـــــا ســـــەرنجی دەیـــــن بـــــە دڵـــــی فـــــراوان

(ســـــیرە )نوســـــانیش زۆریـــــان نوســـــیوە
گـــــەلێك خـــــەڵكانی ڕاســـــتگۆیان دیـــــوە

هەڵـــــەی تیانییـــــە خـــــودا نەخواســـــتە
وەك تیـــــشكی خـــــۆری پرشـــــنگدار ڕاســـــتە

پـــــێش ئـــــەوەی ســـــەروەر بێتـــــە دونیـــــاوە
زۆر هێمـــــای بـــــوونی بـــــە چـــــاو بینـــــراوە

ئەوســـــا بەویـــــستی خـــــودای میـــهرەبـــــان
ئـــــەو ڕۆژە داهـــــات بێتـــــە نـــــاو جیهـــــان

ئـــــەوجا نـــــەخۆش كـــــەوت خـــــاتوو ئامینـــــە
دایكـــــــی (رحـمـةللعالمیـــــــن)ـــــــە

چـــــونكە بـــــزاردەی خواوەنـــــدی تاكـــــە
دەبـــــێ بـــــە دایكـــــی نوێنـــــەری چـــــاكە

بۆیـــــە هەرهـــــەموو كـــــردە و ڕەوشـــــتی
جـــوان و پەســـند بـــوون تێكـــڕا بـــە گـــشتی

كەوتـــــە ســـــەر كـــاتی بـــوونی منـــــداڵی
پێـــنج ســـەد و حـــەفتا و یەكـــەمین ســـاڵی

لـــە دایـــك بـــوونی (عیـــسا) پێغەمبـــەر
ڕونـــاكی گـــەردوون پێـــشەوا و ســـەروەر

چـــاوی هـــەڵێنا لـــەو كـــات و دەمـــە
لـــــە بـــــەیانی دا ، ڕۆژی دووشـــــەممە

دوای (٦٣) ســـــاڵ لـــــە ڕۆژی دووشـــــەم
خـــوا دەیباتـــەوە بـــەبێ زیـــاد و كـــەم

ڕەبیعـــی یەكـــەم ، بیـــستی مـــانگی ئـــاب
هاتـــە ســـەر دونیـــا هـــەتیو و بـــێ بـــاب

ویـــستی خوداوەنـــد لەســـەری وابـــوو
(موحەممـــەد) كـــە بـــوو بـــاوكی نـــەمابوو

پـــەنجا و ســـێ ســـاڵ پـــێش كۆچـــی مەدینـــە
بـــوو بـــە ڕونـــاكی بـــۆ ئـــەم زەمینـــە

بـــوو بـــە هێمایـــەك كـــەوا یـــەكجاری
لـــە ڕیـــشە دەركـــا تـــەختی زۆرداری

ئـــەو كاتـــە دونیـــا مۆڵگـــەی تـــاوان بـــوو
كـــار بەدەســـت بـــێ داد ، ملـــهوڕ ، نـــەزان بـــوو

(إبــــن إســـــحاق )ی دڵ پــــــڕ لـــــــە ئیمــــــان
دەگێڕێتـــــــەوە لــــــــە (ئامینـــــــە خـــــــان)

لـــــە كـــــاتی بـــــوونی ســــەرداری پێـــــشڕەو
خـــــاتوو ئامینـــــــە بینیویـــــــەتی خـــــەو

نـــــورێكی بینـــــی بـــــە چـــــاو بـــــە چـــــاكی
(بُــــصری)ی بـــــە جـــــارێ كــــردە ڕونـــــاكی

ئـــــیتر لـــــــەو ڕۆژە تـــــــاكو كۆتـــــــایی
دوژمنـــــــی ئـــــــەو و ڕێبـــــازی خـــــوایی

لـــــە هەوڵدانـــــــە بـــــە هــــــەموو شـــــێوە
تـــــاوەكو ڕاســـــتی نــــــەڕوا بـــــەڕێوە

چــــــونكە مرۆڤـــــی بێـــــشەرم و یـــــاخی
ژەنــــگ و ناپـــــاكی چــــۆتە نــــاو نـــــاخی

بـــــەڵام خـــــوا ئەمـــــەی بـــــە جیهـــــان بەخـــــشی
بـــــۆ ڕێگـــــای ڕاســـــت و بـــــۆ پـــــەیام پەخـــــشی

دڵان بـــــــە میهـــــــری خـــــــوا بـــــــشواتەوە
شـــــــەوی تـــــــاریكیش ڕوون بكاتـــــــەوە

* * *

(ابـــــو لهــــــب)یـــــش ؛ مــــــامی پێغەمبــــــەر
نـــــە ئاگــــای هـــــەبوو نـــــە بـــــاس و خەبـــــەر

(ســـــومیبە) ناوێـــــك بەنـــــدەی بـــــوو لـــــەو كـــــات
خێـــــرا مزگێنـــــی بـــــوونی بـــــۆ دەبـــــات

کـــه (ابـــو لهـــب) پێـــی گـــەیی مـــوژده
دڵخـــۆش بـــوو کەوتـــه ســـەرلێوی خەنـــده

بۆیـــه هـــەر بـــەهۆی دانـــی مزگێنـــی
ئـــازادی دەکـــا و چـــاکه دەنـــوێنی

بـــه ویـــستی خـــودای پـــەروەردگاری
بـــه ســـەر ڕۆژگـــار هـــات زۆر گۆڕانکـــاری

بـــه باپیریانـــدا مـــوژدەکی وا خـــۆش
نـــا خۆشـــی ژینـــی کـــردن فـــەرامۆش

بـــه ویـــستی خـــودای ئاسمـــان و زەوی
کـــه هاتـــه دونیـــا لـــه مـــاڵی ئـــەوی

چـــاوی هـــەڵێنا بـــه دونیـــای کـــاتی
یـــاخوا ســـەر و ســـەر چـــاومان هـــاتی

چـــەند مـــانگ بـــەر لـــەوەی بێتـــه دونیـــاوه
(عبـــدالله)ی بـــاوکی مـــردووه و نـــەماوه

کـــاتێ (موحەممـــەد) چـــاوی هەڵـــدێنێ
کـــەس (عبـــدالله )یـــان لـــه بـــیر نـــامێنێ

بـــەهۆی (موحەممـــەد) خـــەم و پەرۆشـــی
لەســـەر خزمـــانی گـــۆڕا بـــه خۆشـــی

زۆر بـــێ ئاگـــا بـــوون لـــەو چـــاك و پاكـــه
کـــه خۆشەویـــستی خواوەنـــدی تاكـــه

(عبـــــدالمطلب )چـــــوو بـــــە خێرایـــــی
کـــــە بـــــاپیری بـــــوو بـــــۆ پیرۆزبایـــــی

لـــــە دایکـــــی پـــــاکی پیرۆزبـــــایی کـــــرد
بـــــە ئـــــامێزی خـــــۆی زۆر بەدەســـــت و بـــــرد

بـــــردی بـــــۆ (کعبـــــة) پێـــــی بکـــــا (طـــــواف)
سوپاســـــی خـــــوای کـــــرد بـــــە دڵێکـــــی ســـــاف

هـــــەر لـــــەوێش نـــــاوی لێنـــــا (موحەممـــــەد)
نـــــاوێکی جـــــوان و شـــــیرین و بێگـــــەرد

هەرچـــــەند نـــــەیزانی ئـــــەو نـــــاوە چـــــاکە
بەویـــــستی خـــــودای لێـــــزان و پاکـــــە

خـــــەڵکان چـــــوون بـــــۆ لای زۆر بـــــە ڕاشـــــکاوی
پیـــــاو مـــــاقوڵانی ئـــــەو دەور و نـــــاوی

بـــــە باپیریـــــان وت :- چـــــیە ئـــــەم نـــــاوە ؟
لـــــە نـــــاو ئێمـــــەدا کـــــەی ئەمـــــە بـــــاوە؟

ئـــــەم نـــــاوە ســـــەیرە یەکـــــەمین جـــــارە
کـــــە گوێیـــــان لـــــێ بـــــێ خـــــەڵکی ئـــــەم شـــــارە

( عبـــــد المطلـــــب ) وتـــــی :- پـــــێم چـــــاکە
هەرچـــــەند نـــــاوێکی بـــــێ وێنـــــە و تاکـــــە

مـــــن هیـــــوام وایـــــە نـــــاوێکی وا جـــــوان
سوپاســـــی بکـــــرێ لـــــە ئـــــەرز و ئاسمـــــان

کردیـــان بـــە خۆشـــی و کردیانـــە ئاهــەنگ
ئاهـــەنگیان گێـــڕا بـــە جـــوانترین ڕەنـــگ

پــــــڕ بەختەوەریــــــە ڕێبـــــازی تـــــاکی
هـــــەزاران ســـــلاو لــــە گیـــانی پـــاکی

بــــەهۆی کــــــردەوە و ڕێبـــــازی چـــــاکی
شـــــەوەزەنگی شـــــووم بۆتـــــە ڕونـــــاکی

## دایەنی موحەممەد(ﷺ)

لەوســـــــەردەمەدا لـــــــە دورگـــــــەی عـــــــەرەب
تایەفـــــــەی خـــــــاوەن رەســـــــەن و نەســـــــەب

ئـــــــەوەی هـــــــەیانبا منـــــــداڵی ســـــــاوا
دەبـــــــوو هـــــــەیانبێ مەبەســـــــتێکی وا

کـــــە بـــــەکرێ دایـــــەن بگـــــرن گـــــەلێك جـــــار
منـــــــداڵیان ببـــــــەن بـــــــۆ دەرەوەی شـــــــار

مـــــاوەی چـــــەند ســـــاڵێك لـــــە لادێ و لـــــە دەشـــــت
تـــــا گـــــەورە دەبـــــوو و جـــــوان خـــــۆی دادەڕشـــــت

تایبـــــەت ئەوانـــــەی لـــــەناو شـــــار دەژیـــــان
تێکـــــەڵ بـــــوون لەگـــــەڵ خـــــەڵکی بازرگـــــان

منداڵـــــــەکانیان پـــــــاك دەرنەدەچـــــــوون
چـــــونکە تێکـــــەڵی زۆر خـــــەڵکی دەبـــــوون

منـــــــداڵ زمـــــــانی پـــــــاراو نـــــــەدەبوو
فێـــــــری زۆر وشـــــــەی بێگانـــــــە دەبـــــــوو

ژنـــــــانی لادێ ڕۆژێـــــــك لـــــــە ڕۆژان
بـــــــۆ شـــــــاری (مەککـــــــە) هـــــــەموو دارژان

هەریەکـــــــە و کۆرپـــــــەك ببـــــــەن بـــــــۆ لادێ
هـــــــەتا لـــــــە هـــــــەوای خـــــــاوێنی ڕادێ

(حەليمە)ی (ئێب) سەعد بوو هۆزی
لەگەڵ (حارث)ی مێردی دڵسۆزی

بۆ منداڵ هێنان کەوتنە بیردۆزی
چوون لەگەڵ خەڵکان لەپێناو ڕۆزی

خاتوو (حەليمە) ئەو خوداناسە
بە جوانی بۆمان دەکا ئەم باسە

دەڵێ :- قاتی بوو ساڵێك لە ساڵان
نان بە زەحمەت بوو لە زۆربەی ماڵان

لەگەڵ مێردەکەم چووین لە بۆ شاری
چونکە کەساس بووین لەبەر هەژاری

خەڵکان هەر هەمووی دەچوون بۆ منداڵ
تا بەکرێ بێنن هەتا یەك دوو ساڵ

جا ئێمەش لەگەڵ ئەو خەڵکە زۆرە
بەرەو (مەککە) چووین ئەوسا بەو جۆرە

خاوەن گوێدرێژێ لاوازی وا بووین
هێندە بێ هێز بوو دوور بەجێ مابووین

دەچووینە ڕێگا زۆر بەبێ کەڵکی
هەر بەهۆی گوێ درێژ دووربووین لە خەڵکی

گوێدرێژەکەمان کە دەچووە ڕێوە
جار دەکەوتە عەرد جاریش بە پێوە

زۆر بــــە ناخۆشــــی و هــــەزار دەرد و حــــاڵ
گەیــشتین بــەو جێیــەی کــە لێــی بــوو منــداڵ

بــــەڵام ئــــەو خەڵكــــەی کــــە بــــە ڕێبــــواری
لــــە گــــەڵیان دابــــووین زوو چــــوونە شــــاری

لەپێــــشی ئێمــــە ئــــەم کارەیــــان کــــرد
منــــداڵی خــــاوەن بــــەهای باشــــیان بــــرد

منــــیش زۆر گــــەڕام لــــە دوای کۆرپەیــــەك
لــــە نــــاو بــــازاڕان هــــەموو یــــەك بەیــــەك

هەرچــــەند دەگــــەڕام بــــەتاڵ بــــوو دەســــتم
هــــەر بــــۆ (موحەممــــەد) دەبــــزوا هەســــتم

چــــونکە بــــاپیری ئــــەوهای دەخــــوازی
بەگــــــشت دایــــــەنێك نــــــەدەبوو ڕازی

بــــەڵام خــــوای گــــەورە ویــــستی ئــــەوها بــــوو
هــــەر لەبــــەر ئــــەوە بــــێ دایــــەن مــــابوو

هەرچــــەند کۆرپــــەیێ کــــەم کــــرێ و پــــوول بــــوو
بــــەڵام دڵــــم بــــۆی لــــە جولــــە جــــوول بــــوو

(حەلیمــــە) دەڵــــێ:- وتم ئــــەی (حــــارث)
بێــــنم ئــــەو کــــوڕەی بــــێ کــــەس و واریــــس

(حــــارث) پێــــی وتم :- (حەلیمــــە) یــــەك ســــاڵ
چــــۆن پێــــت دەکــــرێ شــــیر دەیتــــە دوومنــــداڵ؟

بــــەڵام تـــۆ دڵـــت زۆر بـــۆی لــــه جۆشــــه
ده هــــەڵی بگـــــره ، ئەگـــــەر پێـــت خۆشــــه

دڵـــم پـــێ خـــۆش بـــوو وتم :- بـــه هـــەرحاڵ
زۆر شــــەرمه بۆمــــان بــــه دەســـــتی بــــەتاڵ

هـــاتووین بـــۆ (مەککــــه) تـــا ببـــەین منـــداڵ
چـــۆن بـــــەبێ کۆرپـــــه بـــچینەوه مــــاڵ

دەڵـــــێ لــــەو کــــاتیش ئـــافرەتێ وابـــــووم
خـــــاوەن کۆرپـــــەکی تــــازه و ســــــاوابووم

مەمکــــــەکانی مــــــن شــــــیرێکی ئــــــاوا
تێـــــی نـــــەبوو بخـــۆن دوو کۆرپـــەی ســــاوا

بــــەڵام پـــێم خـــۆش بـــوو بـــێ ڕاڕایـــی و بـــیر
ئینجـــا هـــــەڵم گـــرت تـــا پێـــی بـــدەم شـــیر

مــــــەمکێکم خـــــسته نـــــاو زاری پــــاکی
هـــــەتا وشـــــك بـــوو خـــواردی بـــه چـــاکی

مــــــەمکێ تریـــــشم کــــه خـــسته نــــاو دەم
لەبـــــەر براکـــــەی نـــــەیخوارد زۆر و کـــــەم

کارمــــان تـــــەواو بـــــوو ئـــــیتر لـــــه شـــــاری
جـــا کەوتینـــــەڕێ بـــــه پـــــێ و بـــــه ســـــواری

گوێدرێـــــژی ژار و شــــــرمان بـــــه تونـــــدی
خێـــــرا دەیـــــبڕی ڕێگـــــا بـــــۆ گونـــــدی

ئـــازا و سوارچـــاکی لێهـــاتووی وا بـــووین
لـــه پێـــشی هـــەموو خەڵکەکـــه دابـــووین

چـــونکه (موحەممـــەد) نـــوور و ڕەحمـــەت بـــوو
ئاســان بـــوو بۆمـــان هەرچـــی زەحمـــەت بـــوو

ئـــەم کـــاره گـــەلێك ســـەر ســـوڕهێنەر بـــوو
کـــەس نەیـــدەزانی کـــه پێغەمبـــەر بـــوو

خـــەڵکی لەگـــەڵمان هـــەموو بـــه تێکـــڕا
بـــه سەرســـوڕماوی ڕادەمـــان لێکـــڕا

پێیـــان دەوتـــین :- مـــەڕۆن ، هێـــواش بـــن
جێمـــان مـــەهێڵن ، هـــاوەڵی بـــاش بـــن

هـــەر هـــی ئـــەو ســـەر نـــین ؟ بـــۆ وا لـــەو دێمـــه
بـــەزەیی ناکـــەن بـــه حـــاڵی ئێمـــه ؟

پێـــشتر چـــۆن بـــوون؟ بـــۆ ئێـــستا مەســـتن؟
هێنـــد بـــێ بـــەزەیین ، لێمـــان ناوەســـتن

(حەلیمـــه) و ( حـــارث) ئـــیتر بـــه هـــەر حـــاڵ
بـــنه کـــاتێکی کـــەم گەیـــشتنەوه مـــاڵ

لەبـــەر گـــەورەیی ئـــەو کۆرپـــەی شـــیرخۆر
بـــه چـــاویان دەدیـــت خێـــر و بێـــری زۆر

پێـــشتر ئاژەڵیـــان لاواز و پـــیر بـــوون
بـــێ هێـــز و توانـــا شـــڕ و بـــێ شـــیر بـــوون

بەڵام ڕەحمەت و خێری پێغەمبەر
هەموو ئەوماڵەی داگرت سەرانسەر

ئاژەڵ بۆ لەوەڕ دەچوون برسی و پیر
دەهاتنەوە ماڵ بە گوانی پڕ شیر

خوا لەبەر خاتر و ڕێزی (موحەممەد)
یارمەتی دەدان بێ ژمار و حەد

ئیتر چوونە ژێر باڵی هەبوونی
دەرباز بوون لەدەست قاتی و نەبوونی

کە خەڵکی لادێ دەیان دیت ئەمە
بە شوانەکانیان دەکردن گەمە

((بۆچی ئاژەڵتان وشکە ددانیان
دڵۆپە شیرێك نیە لە گوانیان

وەك شوانی ماڵی (حەلیمە خان)ی
ئێوە نازانن بکەن شوانی

شەرمە بۆ ئێوە مردن بخوازن
چونکە ئاژەڵتان هێندە لاوازن))

ئێمەی ئوممەتی باڵێی بکەین بیر
بە قوربانی بین بە گەنج و بە پیر

هەر بە منداڵی سێبوری دڵ بوو
بۆ سێبوری دڵ وەك باخی گوڵ بوو

منداڵ بوو ، بەڵام نەك وەكو منداڵ
سێ مانگ تەمەنی كەم بوو لەیەك ساڵ

بەویستی خودا ئیتر قسەی كرد
زمانی شیرین و پاكی بزەی كرد

گریان و بیانووی نەبوو ئەو چاكە
بە خششی خوا بوو بۆ سەر ئەم خاكە

هەركەسێ ئەگەر تۆزقاڵێ ژیر بێ
ئەو كۆڵنەدەرەی دەبێ لە بیر بێ

گومانیش نیە تا دنیا مابێ
نەبەردی ئەوها لە دایك نابێ

زۆر لێی نزیك بوو لەشیر كردنەوەی
نزیك بوو كاتی بۆ ماڵ بردنەوەی

كاتێك تەمەنی بوو بە دووساڵان
هەرگیز نەدەچوو بۆ ناو منداڵان

هەر لە گەشە بوو وەك ڕوناكی و نوور
ئاكاری جوانی كردبووە دەستوور

خودا یاری بوو ، بۆیە وەك نوور بوو
هەرچەند لە دایكی دڵسۆزی دوور بوو

وتی بە (حارث) ڕۆژێك حەلیمە
دەزانی ئێستا خەریكی چیمە ؟

هەرچـــــەندە دڵــــم بـــــۆی زۆر پەرۆشــــــە
بــــەڵام كــــاتی هـــــات ئـــەم جگــــەر گۆشـــە

كــــە بیبەمـــــــەوە نـــــاو گـــــەل و هــــۆزی
بیدەمـــــــەوە دەســــــــت دایكـــــی دڵـــــسۆزی

ئـــــیتر (حەلیمـــــــە) كــــە گرتــــی دەســــتی
بـــــە ســـــەریدا هـــــات دڵتـــــەنگی و پەســــتی

چـــــونكە (حەلیمــــــە) زۆر بــــاش دەیزانـــــی
لــــــە گـــــــەڵ ئەودایــــــە خۆشــــگوزەرانی

كــــە گەیـــــشت بــــە جــــێ (حەلیمـــــە)ی دایـــەن
(ئامینــــــــە) لێینــــــا رێزێكـــــــی شــــــایەن

بــــە (حەلیمـــــــە)ی وت خـــــاتوو ئامینــــــە:-
بـــــەبێ ئــــــەم كــــورە ژیــــانم وەك شـــینە

گــــــەلێ لەمێـــــزە بـــــەهۆی ئـــــەو كـــــورە
دڵـــــــم لـــــــە ئــــــاه و پـــــــەژارە پـــــڕە

(حەلیمــــــە)ش پێـــــی وت دایكـــــی ئـــــەم پاكـــــە
ئـــــاو و هــــــەوای گونـــــد باشــــتر و چـــاكە

چـــــەند ســــــاڵێكی تـــــر بیــــــدەوە دەســـــتم
ئــــەو كـــــورە بۆتــــــە هیـــــوا و مەبەســــــتم

خـــــەم مـــــەخۆ ، مــــــەڵێ شـــــوێنەكە دووره
حەیفــــە لێـــــره بــــێ ئـــــەم رووومـــــەت ســـووره

(ئامینــــــه) لـــــه قــــسەی (حەلیمــــــه) دوور بــــوو
(حەلیمــــــه)ش لەســــــەر بردنـــــەوەی ســــوور بــــوو

دایکـــــی (موحەممـــــــەد) ســــــۆزی گـــــەرم بــــوو
خــــوا ویـــستی وابـــــوو ، دڵـــــی نـــــەرم بــــوو

کــــاتێ (حەلیمـــــــه) دیـــــسان گرتیـــــه دەســـــت
(ئامینـــــــه) جۆگــــــەی فرمێـــــسکی هەڵبەســـــت

دوبـــــــاره بـــــــردی بـــــۆ شــــــوێنی جــــــاران
دووری خـــــــستەوه لـــــــه کـــــــەس و کـــــــاران

دوور خرایـــــــــەوه لـــــــــه ســـــــــۆزی داکـــــــی
تـــــاکو پـــــێ بگـــــا بـــــۆ ژیـــــن بـــــه چـــــاکی

تـــــا رابـــــێ لەگـــــەڵ ناخۆشـــــی و ئـــــازار
دوور بـــــێ لـــــه پیـــــسی و تێکـــــەڵاوی شـــــار

جگـــــه لـــــه دایکـــــی هەشـــــت ئـــــافرەتی چـــــاك
شـــــیریان داوەتـــــــه پێغەمبـــــــەری پـــــــاك

دەبـــــێ پێبگـــــات ئـــــەو تاکـــــه پیـــــاوه
چـــــونکه خوداوەنـــــد نەخـــــشەی کێـــــشاوه

ئـــــەرکێکی گـــــەوره دێتـــــه ســـــەر شـــــانی
جـــــێ بـــــەجێ نـــــاکرێ وا بـــــه ئـــــاســـــانـــــی

## باسی سینگ لەتکردنی (موحەممەد)(ﷺ)

ڕۆژان لـــەدوای ڕۆژ منــــداڵ گەشـــەی کــــرد
وای لێهـــات ، مـــەڕی بـــۆ لـــەوەڕ دەبـــرد

لەگـــەڵ براکـــەی ڕۆژێـــك لــــە ڕۆژان
بـــۆ لـــەوەڕگا چـــوون بـــە ڕەفتـــاری جـــوان

ڕێـــك و گونجـــاو بـــوون بـــرا بـــوون لـــە شـــیر
دەژیـــان لەگـــەڵ یـــەك گـــەلێك نـــەرم و ژیـــر

ئـــەو منـــداڵێك بـــوو تەمـــەنی چـــوار ســـاڵ
ئینجـــا دوور کـــەوتن لـــە ئـــاوایی و مـــاڵ

دوو فریـــشتەی خـــوا هـــاتن دەســـت بـــەجێ
تـــا کـــاری خۆیـــان ئـــەنجام دەن لـــەجێ

بـــە فـــەرمانی خـــوا هـــاتن بـــێ زەحمـــەت
تـــا لەســـەر زەوی بـــبێ بـــە ڕەحمـــەت

بـــەرگ و پۆشـــاکیان هـــەموو ســـپی بـــوو
(موحەممـــــەد) شـــــتی وای نـــــەبینیبوو

یـــەکیان لـــەوی تـــر دەپرســـێ و دەڵـــێ:
ئەمـــەیان هـــەوە ، ئـــەوی تـــر: بـــەڵێ

لـــەو کـــات و ســـاتی ئـــەم کارەیـــان کـــرد
یـــەك دوو هـــەنگاوێك (موحەممـــەد)یـــان بـــرد

کــــوڕی (حەلیمـــــه) بـــــرای پێغەمبــــەر
کــه ئەمـــەی بـیـنی ، چــۆوه مـــاڵ یەکــسەر

بـــه هـــاوار هـــاوار خێـــرا بەتونـــدی
زوو بەدەســـت و بـــرد گەیـــشتەوه گونـــدی

بـــه چـــاوی گریـــان وتـــی :- ئـــەی بـــاوه
بـــرای قوڕەیـــشیم بـــێ شـــك نـــەماوه

دوو پیـــاو لـــەناکاو هـــاتن بۆلامـــان
(موحەممـــەد)یـان بـرد ، زوو هەســـته ، ئامـــان

(حـــارث) زوو هەســـتا ، چـــوو بـــه هـــاواری
بەســـەری داهـــات پەســـتی و بێـــزاری

(موحەممـــەد)ی دیـت حـــاڵی پـــەرۆش بـــوو
بۆیـــه دڵـــی بـــۆی گـــەلێك لـــه جـــۆش بـــوو

چـــونکه لەمەوبـــەر بـــه ڕوخـــساری وا
هـــیچ نەیبینـــی بـــوو پێغەمبـــەری خـــوا

لەوکاتـــه پێـــی وت :- چـــیت لـــێ قـــەوماوه؟
ســـوپاس بـــۆ خـــودا نەچـــووی بـــەم داوه

(موحەممـــەد) فـــەرمووی :- هێنـــده دەزانم
دەمکـــــرد چـــاودێری ئاژەڵـــــەکانم

دوو پیـــاو بـــۆم هـــاتن ، گرتیـــان دەســـتم
بـــێ ئـــەوەی یـــەك تـــۆز ئـــازاردەن هەســـتم

لـــە ســـەر هـــەتا پــێ بـــەرگيان ســـپی بـــوو
داميـــان بـــە ئـــەرزا ، نـــەمزانی چـــی بـــوو

ئينجـــا بـــە جـــوانی دەســـتيان كـــرد بـــەكار
ســـينگيان لـــەتكردم بـــێ ئـــێش و ئـــازار

كـــاتێ لـــەتيان كـــرد مـــن بينـــيم بەچـــاو
شـــتێكی ڕەشـــيان دەرهێنـــا لـــە نـــاو

لەبـــەر خـــۆی دەيـــوت (يـــەكێ لـــەو دوانـــە )،-
ئـــەو شـــتە ڕەشـــە جێگـــای شـــەيتانە

ئەوســـا بـــە جـــوانی پاكيـــان كـــردەوە
دايـــان بەيەكـــدا و چـــاكيان كـــردەوە

لـــەودەم و ســـاتە لـــە ڕۆخـــی مـــن بـــوون
كاريـــان تـــەواو بـــوو ، ئـــيتر لـــێم ون بـــوون

(حەليمـــە) و (حـــارث) ئـــيتر يەكجـــاری
پـــەژارە و خـــەميان بەســـەردا بـــاری

لـــە تـــاوی ئەمـــە دەيـــان وت بـــەڵكی
كـــاری تێكردبـــێ چاوپيـــسی خـــەڵكی

جێيـــان نـــەبووەوە لـــە هـــيچ جێگايـــەك
شـــەيتان لێـــی گـــرتن هـــەموو ڕێگايـــەك

هـــەردووكيان يـــەكجار ترســـان لـــەم كـــارە
بۆيـــە هەڵدەســـتن ، چـــاريان ناچـــارە

جـــا (حـــارث) وتـــی :- ئـــاوام پـــیٚ چـــاکە
بینێرینـــــەوە ئـــــەو کـــــوڕە پاکـــــە

هەســـــتە ، بیبـــــەوە لـــــەکاتی گونجـــاو
ئاگـــــاداری بـــــە وەك بیلبیلـــــەی چـــاو

بیکـــــە باوەشـــــت ، بیبـــــەوە شـــــاری
بیگەڕێنـــــەوە بـــــۆ کـــــەس و کـــــاری

ئـــــەوەك بەســـــەرمان بێـــــت لۆمـــــە و لەکـــــە
دەســـــتی بەرنـــــەدەی هـــــەتا نـــــاو (مەککـــــە)

(حەلیمـــــە) خـــــانیش لـــــەو کـــــات و لـــــەو دەم
کەوتـــــە بیرکـــــردن بـــــە پـــــەژارە و خـــــەم

بـــــەلاّم دەســـــتی گـــــرت کەوتنـــــە ڕێگـــــا
ڕێگایـــــان دەبـــــڕی جێگـــــا بـــــە جێگـــــا

دەســـــتی لەدەســـــتی (حەلیمـــــە) دابـــــوو
جـــار لـــە پێـــشی بـــوو ، جـــاریش لـــەدوا بـــوو

کاتێـــــك (حەلیمـــــە) ئـــــاوڕی لـــــیٚ داوە
بینـــــی (موحەممـــــەد) لـــــەدوای نـــــەماوە

زۆر گـــــەڕا لـــــەدوای لـــــەو شـــــوێن و جێیـــــە
بـــــەلاّم نـــــەمیزانی ، ئـــــاخۆ لـــــە کوێیـــــە

ئـــــیتر ڕایگەیانـــــد بـــــە کـــــەس و کـــــاری
(عبـــــدالمطلب) هەســـــتا بەســـــواری

لـــــه خۆيـــــان هەرچـــــی دەســـــتی بگـــــرێ دار
لـــه دوای دەگـــــەڕان لـــــه چـــۆڵ و لـــــه شـــــار

يـــــەكێك لـــــەو خەڵكـــــه لـــــه دووری مـــــاڵان
منـــــداڵێكی ديـــــت تەمـــــەن چـــــوار ســـــاڵان

لـــــه ژێـــــر ســـــێبەری دارێـــــك وەســـــتاوه
ئـــــەويش لێـــــی پرســـــی:- ڕۆڵـــــه چـــيت نـــاوه ؟

ئـــــەو كـــــەس (وەرەقـــــەی كـــــوڕی نەوفـــــەل) بـــــوو
لـــــه ئاســـــتی ڕاســـــتی زۆر نـــــەرم و شـــــل بـــــوو

ئـــــەويش بـــــەڕێز و شـــــێوازێكی جـــــوان
ڕووی كـــــردە كـــــابرا ، ئـــــەوجا هاتـــــه دوان

مـــــن (موحەممـــــەد)م كـــــوڕی (عبـــــدالله)ی
زوو بەدەســـــت و بـــــرد (وەرەقـــــه) چـــــۆ لای

بـــــه شـــــادومانی و هـــــەروا بـــــەژيری
كرديـــــه باوەشـــــی بـــــۆ لای بـــــاپيری

لـــــەوكات بـــــاپيری زۆر بـــــه دڵخۆشـــــی
پـــــڕ بەدڵيـــــەوه داينايـــــه كۆشـــــی

بـــــردی بـــــۆ (كەعبـــــه) هەنـــــدێكی گـــــەڕان
لـــــه بـــــۆی ســـــەربڕين وشـــــتر و بـــــەران

(عبـــــدالمطلب) كـــــه بـــــاپيری بـــــوو
بـــــه بـــــەردەوامی هەرلـــــەبيری بـــــوو

لـــە گـــشت منـــداڵی خـــۆی خۆشـــتر دەویـــست
بـــەبێ (موحەممـــــەد) هیـــچی نەدەویـــــست

وتـــی :- خـــەڵك بـــێ و بـــە دوایـــدا نـــاردن
میــــــوانی کـــــردن لـــــەبۆ نانخـــــواردن

پاشـــــان بردیـــــان بـــــۆلای (ئامینـــــە)
بـــۆ لای ئـــەو دایکـــە پـــاك و شـــیرینە

خـــاتوو (ئامینـــــە)ش زۆر بـــــە دڵخۆشـــــی
گرتیـــــە باوەشـــــی و بـــــەخۆوەی گوشـــــی

لەگـــەڵ (حەلیمـــــە)ش نـــــەرمی دەنـــــوێنێ
بـــۆ مەبەســـتی خـــۆی کـــەمێ دەیـــدوێنێ

وتـــی :- (حەلیمـــە) لـــەو کـــارە دوور بـــووی
لەســـەر مانـــەوەی (موحەممـــەد) ســـوور بـــووی

(حەلیمـــــە)ش تـــــەنها هـــــەردەیوت :- بـــــەڵێ
زۆر پێـــی نـــاخۆش بـــوو ڕاســـتی پـــێ بڵـــێ

بـــــەڵام (ئامینـــــــە) وازی نـــــــەهێنا
هـــــۆی هێنانـــــەوەی لـــــەبن دەرهێنـــــا

ئـــیتر (حەلیمـــە) بـــۆ مـــاڵ هەڵدەســـتی
(ئامینـــــە) کرێـــــی دەداتـــــە دەســـــتی

## چوون بۆ (مەدینە) و مردنی (ئامینە)

سـەلامی لـێ بـێ پـڕ بـەم زەمینـە
دایکـی (موحەممـەد) خـاتوو (ئامینـە)

سـەفەرێك دەكـا ، خـوا ڕازی وابـوو
ماوەیـەكی كـەم تەمـەنی مـابوو

ویـستی ببـینێ گـۆڕی مێردەكـەی
گـوێبگرە ، ئەگـەر داوای خێردەكـەی

(موحەممـەد) لـەبۆ دایكـی دڵـسۆزی
تـا دەهـات گـەلێك زۆر دەبـوو سـۆزی

یـەكتریان گـەلێك خۆشدەویـست هـەردوو
بۆیـە كـەدایكی بـۆ مەدینـە چـوو

وتـی:- (موحەممـەد) لەگـەڵ خـۆم دەبـەم
تـاكو نیـشانی خاڵۆكـانی دەم

(خـاتوو ئامینـە) سـۆزی بـەتین بـوو
(موحەمـمـەد) لـەلای گـەلێك شـیرین بـوو

بـە دڵگوشـادی ، بـە ڕێـك و جـوانی
(موحەممـەد)ی بـرد بـۆ لای خـاڵوانی

(أم ایمـن ) لەگـەڵ ئامینـە و سـەروەر
بـەرەو مەدینـە ڕێیـان گرتەبـەر

چـــــەند ڕۆژان بـــــەپێ هـــــەر دەڕۆیـــــشتن
تـــــا بـــــە (مەدینـــــە)ی ڕونـــــاك گەیـــــشتن

خـــــزم و خـــــاڵانی پێغەمبـــــەر لـــــەو كـــــات
زۆر شـــــادومانی بەســـــەریان داهـــــات

هـــــۆزی (خـــــەزرەج) بـــــوون خـــــاڵانی ســـــەروەر
ســـــۆز و بـــــەزەیی خـــــوای بڕژێتـــــە ســـــەر

ئـــــەم ســـــێ كەســـــانە زۆر بـــــەنازداری
لـــــەوێ مانـــــەوە بـــــە میوانـــــداری

ڕۆژێـــــك (موحەممـــــەد) چـــــوو لەگـــــەڵ دایكـــــی
لـــــەبۆ گۆڕســـــتان زۆر بـــــە خـــــەمناكی

(ئامینـــــە) پێـــــی وت : كـــــوڕم ئـــــەی ڕۆڵـــــە
بناســـــە گـــــۆڕی باوكـــــت لـــــەم چـــــۆڵە

(ئامینـــــە) دانیـــــشت زۆر بـــــە پەرۆشـــــی
فرمێـــــسكی بارانـــــد تـــــا تـــــەڕبوو كۆشـــــی

باســـــی (عبـــــدالله )ی كـــــرد لـــــەبۆ كـــــوڕی
بـــــە چـــــاوی گریـــــان ، بـــــە جـــــەرگبڕی

زیـــــاتر لـــــە مانگێـــــك لـــــەوێ مانـــــەوە
جـــــا ڕازیـــــان هاتـــــە ســـــەر گەڕانـــــەوە

دوای ماڵئـــــاوایی لـــــە كـــــەس و خاڵیـــــان
كەوتنـــــەوە ڕێگـــــا بـــــچنەوە ماڵیـــــان

لــــــە ڕێ (ئامینـــــــە) لــــــە ژان و ئێـــــشا
نەخۆشـــــی بـــــاڵی بەســــــەردا کێـــــشا

(موحەممـــــەد )گیانـــــە تــــۆ دڵ و جــــەرگی
دایکــــــی شـــــیرینت نزیکــــــە مــــــەرگی

لــــە گونـــــدی(ابـــــواء) کــــە دەچـــــوونەوە
بیـــــست و ســـــێ میلێــــــك دووربوونــــــەوە

لــــــەوێ مایـــــــەوە (ئامینـــــــە)ی بــــــەڕێز
زۆر لێـــــی نزیـــــك بــــوو مردنـــــی بــــەهێز

(موحەممـــــەد)ی جــــوان تەمـــــەن شـــەش ســـاڵی
ئەشــــــکی بـــــەزەیی لــــــە چـــــاو دەمـــــاڵی

مــــــەرگ و مردنـــــی نزیــــــك بــــوو وەختـــــی
زۆر بـــێ توانـــــا بـــــوو ئـــــیتر بــــە ســــەختی

خــــوا ویـــــستی وابـــــوو کـــــەوا (مەدینـــــــە)
ببێتـــــە دوا جـــــێ لـــــــە بــــۆ (ئامینـــــــە)

( مَلَـــكُ المَـــوت) بـــێ بـــــەزەیی و بــــاك
دەریکـــــــرد گیـــــانی (ئامینـــــــە)ی دڵ پـــــاك

گۆڕیـــــان هەڵکــــــەنی بەشـــــێوەکی چــــاك
لــــە گونـــدی (ابـــواء ) ســـپاردیان بـــە خــــاك

ئـــــیتر (ئامینـــــــە) لەبــــەر چـــــاو ون بــــوو
وەك ماســــی لـــــووڵی دەریـــــای بـــێ بـــن بــــوو

لــــەو كـــات (موحەممـــەد) وا هاتـــە هەســـتی
لــــە پاشـــی دایكـــی كـــێ دەگـــرێ دەســـتی؟

ماڵئـــــاوایی كــــرد دایكـــــی بــــەڕێزی
ئـــــیتر نـــــاتوانێ بـــــچتە ئـــــامێزی

زۆر پەشـــێو حـــاڵ بـــوو ئـــەو لـــێ قـــەوماوە
دایكـــــی دڵـــــسۆزی لێـــــی دابـــــڕاوە

ئـــەو بژاردەیـــە پارچـــەیەك نـــوور بـــوو
ڕێگـــای چـــەند ڕۆژان لـــە (مەككـــە) دوور بـــوو

خـــوا ویـــستی وابـــوو (موحەممـــەد) دەبـــوا
دایكـــی جـــێ بێڵـــێ لـــە گونـــدی ( ابـــواء)

(ابـــواء)یـــان جـــێ هێـــشت بـــە داخـــی گـــران
كەوتنـــــە ڕێگـــــای چـــــۆلی بیابـــــان

گەیـــشتنەوە (مەككـــە) بـــە ســـەد دەرد و حـــاڵ
زۆر بـــە پەرۆشـــی چـــوونەوە بـــۆ مـــاڵ

ئـــیتر بـــاپیری بەوپـــەڕی ڕێـــزی
ڕێـــك (موحەممـــەد)ی گرتـــە ئـــامێزی

كـــوڕێكی جـــوان و دڵگـــر و ژیـــر بـــوو
هـــەر دەســـتی لـــە نـــاو دەســـتی بـــاپیر بـــوو

هەرلەگـــەڵ خـــۆی بـــوو ، لەگـــەڵ خـــۆی دەنوانـــد
ڕۆژێـــك بـــە ئـــازار هەســـتی نەبزوانـــد

لـــــە ژێـــــر بـــــەزەیی و ســــۆزی بـــــاپیری
هـــــەرگیز هـــــەتیوی نەهاتـــــە بـــــیری

ســــەدان ســــەلامت لــــێ بــــێ ســــەروەرمان
تــــاجی ســــەرمانی ، ئیـــسلام پـــەروەرمان

## سەرپەرشتی (ابوطالب)بۆ(موحەممەد) (ﷺ)

کـــاتێ (موحەممـــــەد) دایکـــی نـــەما بـــۆی
بـــاپیری دەیبـــات بـــۆ ژێـــر بـــاڵی خـــۆی

بـــــەڵام ئـــــەمجارەش کۆســـــتی کەوتـــــەوە
لــــــەو خۆشەویــــــستەش بەدوورکەوتـــــەوە

بـــــاپیری کـــــردی کۆچـــــی یـــــەکجاری
دیـــسان (موحەممـــــەد) مـــا بـــە هـــەژاری

بـــــەڵام پـــێش ئـــــەوەی بـــاپیری بمـــرێ
(موحەممـــــەد) تەســـلیم بـــــەمامی دەکـــرێ

(ابوطالـــــــب)ی مـــــــامی پێغەمبـــــــەر
خـــستیە ژێرســـۆزی بـــە مـــاڵ و بەســـەر

چـــونکە مامێـــک بـــوو لـــە مامـــەکانی
وەک هـــــەتوانێك بـــــوو بـــــۆ زامـــــەکانی

دایـــك ، بـــاب، بـــاپیر بـــۆ دڵ ئـــارامی
نـــەمابوون ، بـــەڵام بـــۆی مـــابوو مـــامی

ئـــەویش دەســـتی گـــرت زۆر بـــە دڵخۆشـــی
ســـــەری پـــــیرۆزی خـــــستە سەرکۆشـــــی

لـــەلای ئـــەو مامـــەی گـــەلێك بـــەرێز بـــوو
مامیـــشی مـــەردێ بـــە توانـــا و هێـــز بـــوو

دەســـــتکورت و بێمـــــاڵ بـــــەبێ دراو بـــــوو
لەگـــــەڵ ئەوەشـــــدا بـــــاوەرپێکراو بـــــوو

ئـــیتر ئـــەو مامـــە بـــە جـــوانی و نـــەرمی
بـــرازای بـــردە ژێـــر ســـۆزی گـــەرمی

لـــە گـــشت کـــوڕانی خۆشـــتری دەویـــست
دەبوایـــە لای بـــا ، دڵـــی وای دەویـــست

ســـەرەوەریش بـــەبێ بینـــینی مـــامی
ژیـــان لـــەلای ئـــەو نـــەدەما تـــامی

هـــەروا مامیـــشی تـــا لـــە ژیـــان مـــابوو
پـــشتگیری ئـــەو و دوور لـــە خـــودا بـــوو

بەنـــدەیی بـــۆ خـــوا و یەکتاپەرســـتی
بـــە دەمیـــا نـــەهات تـــا بـــەربوو دەســـتی

## یەکەم ڕۆیشتی (موحەممەد) (ﷺ) بۆ (شام)

(ابوطالــــــــب)ی خـــــــەمخۆر و دلێــــــــــر
لــــە جێگـــای بـــابی ئـــەو بـــوو بـــە چـــاودێر

چـــــاودێری دەكــــــرد بــــــە جـــوانی و چـــاكی
لـــــــە خـــــۆری گــــــەش و هێمـــــای ڕونـــــاكی

ڕۆژێـــــــك لـــــە ڕۆژان كــــــە مــــــامی ویـــــستی
بـــڕوات لـــە بـــۆ شـــام ، (موحەممـــەد) بیـــستی

كـــــــە (ابوطالـــــــب) بـــــــەنیازی شـــــــامە
پێـــی خۆشـــبوو بـــچێ لەگـــەڵ ئـــەو مامـــە

(ابوطالــــــــب)ی مـــــــامی وەك جـــــــاران
خـــۆی ئامـــادەكرد ، بـــڕوا بـــۆ كـــاروان

دەیویـــــست (موحەممـــــــەد) نـــــەڕوا لەگـــــەڵیا
هەرچـــــــەندە جێگـــــای هـــــەبوو لـــــــەدڵیا

دەیویـــست (موحەممـــــەد) لـــــە مـــــاڵ جێمـــێنێ
مەینــــــەتی و گـــــــەرمای ڕێگــــــا نـــــــەبینێ

پێـــشەوا و ســـەروەر نـــوور و ڕەحمـــەت بـــوو
دوور بـــوون لـــە مـــامی زۆر لای زەحمـــەت بـــوو

(موحەممـــــــەد) زانــــــی كــــــە دەڕوا مـــــامی
ژیـــــانیش بـــێ ئـــــەو نــــامێنێ تــــامی

چــــووه ژێـــــر بـــاری پەســـتی و دامـــــاوی
چــونکه هــەر بــە ئــەو ڕوون بــوو بەرچــاوی

بـــــەلاّم ناچــــار بــــوو بۆیــــه دوو دەســـــتی
لـــــه مـــامی نالأنـــــد تاســـۆز و هەســـــتی

بـــۆی بێتــــه جــــۆش و بـــــەزەیی بكـــات
دەســـــتی بگرێـــت و بـــۆ كــاروان بیبـــات

لـــەو كـــات تەمـــەنی دوانـــزه ســـاڵی بـــوو
ژیـــانی نـــاخۆش و پـــڕ لـــه تـــاڵی بـــوو

بـــــەلاّم مـــامی ئـــــەو چـــۆن دڵـــی دێڵـــێ
بـــڕوا لـــه بـــۆ شـــام ئـــەویش جێبێڵـــێ

جـــا كـــه ســـواری كـــرد لـــەو كـــات و دەمـــی
لا چــــوون لەســـــەری خامۆشـــی و خـــەمی

كەوتنـــــه ڕێگـــــا خـــەڵكی و خـــۆی و مـــام
(مەككـــه)یـــان جێهێـــشت ڕوویـــان كـــرده شـــام

كـــاتێ كاروانیـــــان كەوتـــــه ســـــەر ڕێگـــــا
بـــه بیابـــان و دەشـــت جێگـــا بــه جێگـــا

ڕێگـــای یـــەك مـــانگێ دوور كـــەوتن لـــه مـــاڵ
تـــا چـــوونه شـــاری (بُـــصری) بـــه هـــەرحاڵ

كێوێـــك لـــەوێ بـــوو نـــاوی (حـــوران) بـــوو
كـــه لــــه بـــەردەمی ڕێگـــای كـــاروان بـــوو

ئەشـــكەوتێك هـــەبوو لەســـەری رێـــدا
(بوحـــەیرا)ی راهیـــب دەژیـــا لەوێـــدا

لـــەو ئەشـــكەوتەدا زۆر بەسەربەســـتی
بـــە تـــەنیا و تـــاكی خـــوای دەپەرســـتی

ئـــەو (بوحـــەیرا)یـــە نـــاوی (جـــەرجیس) بـــوو
خوانـــاس بـــوو ، دژی كـــرداری پـــیس بـــوو

(بوحـــەیرا)ی راهیـــب كـــاتێ كـــە هەســـتا
لـــە پـــێش ئەشـــكەوت كـــەمێك راوەســـتا

لـــە دورگـــەی عـــەرەب ســـەرەنجی دەدا
بـــۆ مەبەســـتی خـــۆی ئـــەو رەنجـــی دەدا

دونیـــای ســـەیركرد بـــە چـــاوان دەورێـــك
دیتـــی لـــە ئاسمـــان وا پارچـــە هـــەورێك

ســـێبەری دەكـــرد لـــە ســـەر كاروانێـــك
بـــۆی بـــوو بەدیمـــەن ، جێگـــای رامانێـــك

چـــووە بـــن دارێـــك جـــا كاروانەكـــە
لـــە گەڵیانـــدا بـــوو كـــوڕە جوانەكـــە

لـــەوكات هەورەكـــە ئـــیتر رەویـــەوە
ســـێبەری نـــەما بەســـەر ســـەریەوە

بـــەڵام دارەكـــە بـــە نـــاو یەكـــدا چـــوو
ســـێبەرێ گـــەورەی لـــەبن دروســـت بـــوو

کەس هەستی نەکرد ، دار کردی سێبەر
بەویستی خودا لەسەر پێغەمبەر

بەڵام (بوحەیرا) زۆر زۆر بە جوانی
سەرنجی دەدا ، وورد لێی دەڕوانی

چونکە دەیزانی کە کەمی ماوە
ئەو پێغەمبەرەی چاوەڕێی کراوە

بۆی دەرکەوت یەکێك لە ناو کاروانە
کە پێغەمبەری کۆتا زەمانە

لەناو (ئینجیل)دا کراوە باسی
ڕای دەگەیەنێ بانگی خواناسی

(بوحەیرا) زانی کەوا تەواوە
ئیتر نەوەستا لەمە بەدواوە

بۆ مەبەستی خۆی هەمووی بانگ کردن
بەڵام بەهانەی کردە نان خواردن

کاروان بە تێکڕا هەر هەموو هاتن
فەرمان بەرداری (هوبەل) و (لات)ن

(بوحەیرا)ی ڕاهیب لە ناخ و ڕازی
زۆر لە دڵیەوە کردی پێشوازی

گەلێك بەوردی لە گشت ئەو خەڵکە
سەرنجی دەدا ، بەڵام بێکەڵکە

گـــەلێك مانـــدوو بـــوو لـــە ســـەرنجدانی
لـــەناویان نـــەبوو ڕەحمـــەت ، دەیزانـــی

(بوحـــەیرا) وتـــی :- كەســـتان نـــەماوە؟
هـــەتا بـــێ ، بخـــوا لـــەم نـــان و ئـــاوە

ئـــەو خەڵكـــە وتیـــان :- منـــداڵێك مـــاوە
لـــە بـــەر منـــداڵی نـــەمان هێنـــاوە

(بوحـــەیرا) وتـــی :- یـــەكتان بـــا بـــڕوا
هـــەتا ئـــەویش بێـــت لـــەم نانـــە بخـــوا

لـــەو كـــات و ســـاتی یـــەك یـــا دووی نـــاردن
هـــەتا ئـــەویش بـــێ لـــە بـــۆ نـــان خـــواردن

كـــاتێ هێنایـــان لـــەو كـــات ئـــەو لاوە
كـــە چـــاوی پێكـــەوت زانـــی تـــەواوە

ســـەرنجی دەدا بـــە ورد و جـــوانی
لـــە هەڵـــسوكەوت و كـــار و فرمـــانی

زانـــی خـــەڵاتی خـــوای میهرەبانـــە
یەكـــەم نیـــشانەی ئـــاخیر زەمانـــە

(بوحـــەیرا) هەســـتا بـــە دڵـــسۆزیەوە
هـــەڵێكی چـــاكی بـــۆ خـــۆی دۆزیـــەوە

چـــۆ لای (موحەممـــەد) بـــە تـــەنیا و تـــاكی
تـــا بـــۆی دەركـــەوێ بـــە جـــوانی و چـــاكی

وتـــی :- دەپرســـم مــــن لـــە تـــۆ ، بـــەڵام
تـــو (لات ) و (عـــوزا) ڕاســـت بـــدە وەڵام

(محەممـــــەد) فـــەرمووی ئەوانـــە خـــوانین
وەك خـــەڵکی دەڵـــێن ئەوانـــە وا نـــین

ئـــەو (بوحـــەیرا)یـــە ژیـــر و ڕاســـتڕەوە
بـــەو ســـوێندە پوچـــە تـــاقیکردەوە

( بوحـــەیرا ) وتـــی :- دە مـــادام وایـــە
تـــۆ بـــڕوات تـــەنها بـــە بـــوونی خوایـــە

خـــودا گەورەیـــە ، هـــیچ نـــین لـــە ئاســـتی
وەڵامـــــم دەوە گیانـــــە بەڕاســـــتی

(بوحـــەیرا)ی ڕاهیـــب جـــوان و بـــێ ترســـی
دەربـــارەی زۆر شـــت لـــەو جوانـــەی پرســـی

کـــاتێ لێـــی پرســـی ئـــەویش بـــەڕێکی
بـــە وەڵامـــی ڕاســـت یـــەك لـــەدوای یێکـــی

لای (بوحـــەیرا) بـــوون بـــاس و نیـــشانی
بۆیـــە دەســـتی بـــرد لـــە بـــۆ نێـــو شـــانی

کـــاتێ کـــە جلـــی لادەدا لەســـەر
لـــە نێـــو شـــانی بـــوو مـــۆری پێغەمبـــەر

لـــە بـــۆی بەدەرکـــەوت کـــە پێغەمبـــەرە
ڕووی کـــردە مـــامی وتـــی :- دەی وەرە

ئەوسا مامی هات بە ئەوپەڕی ڕێز
ویستی (موحەممەد) بگرێ لە ئامێز

(بوحەیرا)ش پێی وت :- جارێ بوەستە
گوێ بگرە ئاخۆ من چیم مەبەستە

کە بانگم کردی ، بزانە ، بۆیە
تاکو بزانم ، ئەمە چی تۆیە؟

وتی ڕۆڵەمە زۆر چاك بزانە
گەرچی (بوحەیرا) نەیکرد متمانە

دووەم جار پێی وت :- کوڕی برامە
زۆرم خۆش دەوێ وەك باوکی وامە

بەڵام داخەکەم باوکی نەماوە
بە هەتیویەتی هاتە دونیاوە

وتی لەو کاتەی مردووە باوکی
چەند مانگی مابوو لە زگی دایکی

(بوحەیرا)ش پێی وت گیانی ڕەوانم
ئا ئەم قسانەت بە ڕاست دەزانم

ئەوەی پێت دەڵێم هەستی لێ بگرە
لێی دوور مەکەوە ، چاك دەستی بگرە

بۆیە پێت دەڵێم ، چونکە تۆ مامی
چاودێری بکە بە بەردەوامی

دژی ئـــەو پاکـــە زێـــر و شـــیرینە
جوولەکـــە دڵیـــان پـــڕە لـــە کینـــە

ئەگـــەر بـــزانن دێـــن بـــۆ کوشـــتنی
گـــشتیان ئامـــادەن بـــۆ خـــوێن ڕشـــتنی

ئـــەوەی پێـــت دەڵـــێم ڕاســـت و ڕەوایـــە
دەبـــێ بـــە خـــاوەن باشـــترین پایـــە

خـــوا دەپـــارێزی تـــۆش بیپـــارێزە
خۆشەویـــستی خـــوای گـــەورە و بـــەهێزە

مـــامی پێغەمبـــەر زیـــاتر لەپێـــشا
بـــاڵی چـــاودێری بەســـەردا کێـــشا

قـــسەی (بوحـــەیرا) زۆر ترســـناك بـــوون
بـــەڵام زۆر ڕاســـت و دروســـت و چـــاك بـــوون

نـــەیوێرا لەبـــەر جوولەکـــەی نـــەفام
(موحەممـــەد) ببـــا لەگـــەڵ خـــۆی بـــۆ شـــام

لەگـــەڵ چـــەند بەنـــدە و خزمـــەتکارانی
ناردیـــەوە (مەککـــە) شـــوێنی جـــارانی

خـــەڵکی کاروانـــچیش وەکـــو هـــەموو جـــار
ڕوویـــان کـــردە شـــام لـــە بـــۆ ئـــیش و کـــار

## دووەم ڕۆیشتنی (موحەممەد) (ﷺ) بۆ شام

بـــــەرەی (قـــــوڕەیش) و بـــــەرەی (کینانـــــە)
لەگـــــەڵ (هـــــەوازن) ئـــــەو ســـــێ هۆزانـــــە

شـــــەڕ لـــــە نێوانیـــــان چـــــوار ڕۆژی کێـــــشا
دڵـــــی زۆر دایـــــك و باوکانیـــــان ئێـــــشا

ئـــــەم جەنگـــــە نـــــاوی جـــــەنگی(فوجـــــار) بـــــوو
پێغەمبـــــەری خـــــواش تێیـــــدا بەشـــــدار بـــــوو

کـــــە جـــــەنگی (فوجـــــار) کۆتـــــایی پـــــێ هـــــات
ئـــــارامی بـــــاڵی کێـــــشا ســـــەر وڵات

هەرچـــــەندە بـــــاڵی کێـــــشا بـــــوو کێـــــشە
کێـــــشەیەکی وا پـــــڕ لـــــە ســـــەر ئێـــــشە

بـــــەڵام بـــــە ویـــــستی پـــــەروەردگاری
بـــــاران لـــــە ئـــــاگری ئـــــەو شـــــەڕە بـــــاری

لـــــەو کـــــات و دەمـــــی ســـــەروەری ڕوو ئـــــاڵ
تەمـــــەنی ببـــــووە چـــــواردە پـــــانزە ســـــاڵ

ئـــــەو گەنجـــــە ژیـــــرە ژیـــــان پـــــڕ ڕەنجـــــە
دوور بـــــوو لـــــە فیـــــز و لـــــە لار و لەنجـــــە

پـــــاك و خـــــاوێنی و ڕاســـــتی پیـــــشەی بـــــوو
ئەمـــــەش ڕەوشـــــت و خـــــووی هەمیـــــشەی بـــــوو

مامیشی زۆر جوان دەیکرد چاودێری
برسی نەدەکرد ، دەژیا بە تێری

سەرەڕای ئەوەی زۆر خێزاندار بوو
پیاوێ دەستکورت بوو ، گەلێك هەژار بوو

ویستی برازای بگات بە ئامانج
بۆی پەیدا بکات کاری پڕ قازانج

مامی کە زانی کاری وا دەکرێ
(خەدیجە) خەڵکی بە پارە دەگرێ

(خەدیجە)ی بەڕێز دوو شووی کرد بوون
یەك لە دوای یەکتر هەردوو مرد بوون

ئەم (خەدیجە)یە ژیر و هۆشمەند بوو
داوێن پاکێکی زۆر دەوڵەمەند بوو

خێزانی یەکێ زۆر پایەدار بوو
بەهۆی ئەوەوە سەرمایەدار بوو

خەڵکانی بەرچاو لە ناو (قوڕەیشی)
بۆ شوو پێکردن دەهاتنە پێشی

(خاتوو خەدیجە) لە کەسیان ، بەلآم
بۆ مەبەستی وان نەیدابوو وەلآم

بۆی دەرکەوتبوو بە جوانی و ڕوونی
ئەوان تەماعی ماڵ گرتبوونی

بۆیــــە هەرچـــــەندە دەچـــــوون داخـــــوازی
بـــــە هــــیچ کەســــێکیان نـــــەدەبوو ڕازی

مــــامی کـــــەزانی ، وتــــــی :- وا چـــــاکە
دەســــت بـــــەتاڵ نـــــەبێ ئـــەم ڕەوشــــت پاکـــە

بـــــەم کـــاره هەســــتا کــــە ئەمـــــەی زانـــــی
بـــــە بــــرازای وت بـــــە نــــەرم و جــــوانی

پێــــی وت:- (موحەممــــــەد ) گیـــانی شـــیرینم
کـــــارێ بـــــاش هەیـــــە لێتــــــڕادەبینم

بــــۆ خــــۆت دەزانــــــی مـــــن خێزانـــــدارم
لەبـــــــەر نـــــــــەبوونی زۆر گرفتـــــــارم

تــــۆش بـــــەهرەدار و ژیــــــر و بـــــەتوانای
لـــــــە بازرگــــــانی شــــــارەزا و زانـــــای

خــــاتوو (خەدیجـــــە)ش خــــەڵکی دەنێـــــرێ
کــــاری کاروانیـــــان پــــێ ڕادەســــــپێرێ

کــــوڕی شــــیرینم تــــۆش گــــوێ بگـــره لـــێم
ئەگـــــەر پێـــــت خۆشـــــە لەگــــەڵی دەدوێــــم

وتـــــی:- تـــــۆ چــــۆنت پـــێ خۆشـــــە مامـــــە
هــــەر ئـــــەوە ڕێگـــــا و تـــــەکبیر و ڕامـــــە

بـــــە (خەدیجـــــە)ی وت مـــــامی پێغەمبـــــەر:-
خـــــاتوو (خەدیجـــــە) تـــــۆ ڕازی ئەگـــــەر

لەگـــــەڵ کاروانــــــت (موحەممـــــــەد) بـــــڕوا
ســــوودی زۆر دەکـــــەی پـــــێم بکـــــە بـــــڕوا

شـــەرت بـــێ ون دەبیـــــت لــــە ســــوود و کـــەڵك
زۆر دەســـــــت پـــــاکترە لـــــە هـــــەموو خــــەڵك

خـــــاتوو (خەدیجـــــە)ش بـــــە باشـــــی زانـــــی
(موحەممـــــــــەد) بـــــچێ بـــــۆ بازرگـــــــانی

تەمـــــەنی ســـــەروەر بیـــــست ســــاڵ بـــوو تــــوانی
پێـــــنج ســـــالآن بکـــــا کـــــاری کـــــاروانی

تەمـــــەنی ببـــــووە بیــــست و پێـــــنج ســـــاڵی
خەدیجـــــە ویـــــستی بـــــاش لێـــــی بـــێ حـــــاڵی

نۆکـــــەرێکی بـــــوو بـــــەناو (مەیـــــسەرە)
ئـــــەویش بـــــەکرێ بـــــوو ، کـــــە کاروانبـــــەرە

لـــــەکۆتا جـــــاردا (مەیـــــسەرە)ی نۆکـــــەر
کـــــردی بـــــە چـــــاودێر لـــــە ســـــەر پێغەمبـــــەر

دەیکـــــــرد چـــــاودێری زۆر لــــــە ڕەوشـــــتی
بـــــەلام ڕەفتـــــاری جـــــوان بـــــوون بەگـــــشتی

دەســـــتپاك و ژیـــــر بـــــوو ئـــــەو لاوە مـــــەردە
چـــــونکە خـــــوای گـــــەورە دەیکـــــرد پـــــەروەردە

بۆیـــــە (مەیـــــسەرە)ی کردبـــــووە چـــــاودێر
بەســـــەر ســـــەروەری پـــــاك و چـــــاکە فێـــــر

تـــا بـــۆ خەدیجـــه ڕوون بـــێ بـــه چـــاکی
چـــونکه نـــاوی ئـــەو چـــوو بـــوو بـــه پـــاکی

گەیـــشتن بـــه شـــام زوو بەدەســـت و بـــرد
کـــار و کڕینیـــان ئـــیتر تـــەواو کـــرد

زۆریـــان قـــازانج کـــرد لـــه بازرگـــانی
کـــەس نـــەبوو ، شـــانیان بـــدا لـــه شـــانی

بـــه دڵـــی گـــەش و چـــاوی ڕوونـــەوه
ڕوو بـــه ڕووی شـــاری (مەککـــه) بوونـــەوه

کـــاتێ گەیـــشتن بـــه (مـــر الظهـــران)
(مەیـــسەره) وتـــی :- (موحەممـــەد) ئامـــان

تـــۆ خێـــرا بـــڕۆ بـــەرەو مـــاڵ هـــەنگاو
نـــەوەك (خەدیجـــه) دڵـــی بێـــت تـــەنگاو

ئـــیتر (موحەممـــەد) وا بـــه هـــەر حـــاڵێ
زوو بەدەســـت و بـــرد گەیـــشتەوه مـــاڵێ

(خەدیجـــه خـــان)یـــش بەوپـــەڕی شـــەرمی
پێـــشوازی لـــێ کـــرد بـــه جـــوان و نـــەرمی

پرســـیاری لـــێ کـــرد لـــه قـــازانج و ســـوود
لەســـەر گیـــانی بـــێ هـــەزاران درووت

(موحەممـــەد) فـــەرمووی :- قازانجمـــان زۆرە
کـــەس نـــەیبینیوه ســـوودی بـــەم جـــۆرە

خـــاتوو (خەدیجـــه)ش لــــەو دەم و كـــاتی
دڵخۆشـــــتر دەبــــێ بــــەهۆی داهـــاتی

پاشـــان (مەیـــسەره) لای (خەدیجــــه خـــان)
باســـی دەســـتپاكی ئــەوی كـــرد بـــه جـــوان

وتـــــی :- ڕاهیبێـــــك لـــــه نزیكـــــی شــــام
هەنــــدێك شـــتی وت ، كردمـــــی سەرســــام

وتـــــی :- جوولەكــــــه داخیـــــان لەدڵـــــه
تینــــوون بــــه خــــوێنی ســــەری ئــــەو گوڵــــه

خـــاتوو (خەدیجـــه) كاتێـــك ئەمـــەی بیـــست
زیـــاتر لــــه جـــاران (موحەممـــەد)ی ویـــست

كەوتـــــه نـــــاو دڵـــــی ئــــەو بـــیر و ڕازه
بێتـــــه هاوســــــەری ئـــــەو لاوه تـــــازه

## شوكردنی(خەدیجە)بە(موحەممەد) (ﷺ)

خـــاتوو (خەدیجـــە) دڵـــی لـــە جـــۆش بـــوو
لـــەبۆ (موحەممـــەد) زۆری پـــێ خـــۆش بـــوو

یـــەكێكی وەك ئـــەو بـــێ بـــە هاوســـەری
بـــژین لەگـــەڵ یـــەك بـــە بەختـــەوەری

گـــەلێكی هـــەبوو لـــە ســـامان و مـــاڵ
هەرچـــەند تەمـــەنی ببـــوو بـــە چـــل ســـاڵ

خـــاتوو (خەدیجـــە) ڕۆژێـــك لـــە ڕۆژان
یەخـــەی بـــەختی خـــۆی گـــرت و ڕایهـــەژان

دەســـتە خوشـــكێكی بـــانگ كـــرد بـــە چـــاكی
ئینجـــا بـــۆی باســـكرد مەبەســـتی پـــاكی

پێـــی خـــۆش بـــوو بـــچێ ســـەروەر بـــدوێنێ
تـــا بـــۆی دەركـــەوێ ، ئـــاخۆ ژن دێنـــێ؟

دەســـتە خوشـــكەكەی هەســـتا زوو بـــە زوو
(نەفیـــسە)ی نـــاو بـــوو ، بـــۆلای ســـەروەر چـــوو

ئەوســـا دركانـــدی بـــەبێ نهێنـــی
پێـــێ ووت:- (موحەممـــەد) بـــۆ ژن نـــاهێنی ؟

ســـەروەریش فـــەرمووی :- خوشـــكی بـــەڕێزم
لـــە ڕووی دارایـــی و ســـامان بـــێ هێـــزم

(نەفیـــسە)ی هـــاوڕێی (خەدیجـــە) خـــانی
هاتـــەوە وەڵام دیـــسان بـــە جـــوانی

وتـــی :- گــــەر ژنێـــك خـــاوەن ســـامان بـــێ
ڕەوشـــــتی بـــــەرز و ئاكـــاری جـــوان بـــێ

داوات لـــــێ بكـــــات بیكـــــەی داخـــــوازی
تـــــۆ بـــــەو داوایـــــەی ئـــــەو دەبـــــی ڕازی؟

ســـــەروەریش فـــــەرمووی :- پـــێم بڵـــێ كێیـــە؟
تـــــۆ هـــــەواڵیكی زۆر ســـــەیرت پێیـــــە

(نەفیـــــسە)ش وتـــــی :- (خەدیجـــــە) خانـــــە
خزمـــــی نزیكـــــە ، خـــــاوەن ســـــامانە

ســـــەروەریش فـــــەرمووی :- بـــــەڵێ گـــــەر وایـــــە
شـــــتێكی چـــــاكە ، خـــــەڵاتی خوایـــــە

بـــــەڵام ژنێكـــــی سەرمـــایـــــەدارە
لـــــە نـــــاو خەڵكانـــــدا بەرچـــــاو و دیـــــارە

پیـــــاوی مـــــاقوڵ و بـــــەڕێز بـــــۆی هـــــاتوون
وەڵامـــــی كەســـــی نـــــەداوە خـــــاتوون

جـــــا ئەگـــــەر وابـــــێ زۆرم پـــــێ چـــــاكە
چـــــاكەی خواوەنـــــدی لێـــــزان و تاكـــــە

ئـــــیتر (نەفیـــــسە) لـــــەوكات هاتـــــەوە
هـــــەتا وەڵامـــــی خـــــاتوون داتـــــەوە

كـــــاتێ (نەفیـــــسە) بـــــۆی گێڕایـــــەوە
خـــــاتوو (خەدیجـــــە) ڕووی گەشـــــایەوە

(خەدیجـــــە)ی بـــــەڕێز زۆر شــــاد بـــوو دڵـــــی
(موحەممـــــــەد)ی لاو ببێــــــت بـــــە گـــــوڵی

تـــــازە وازیـــــــشی هـــــەر لـــــێ نــــــاهێنی
ڕۆژێکـــــی دانــــا لــــــە بــــۆ خــــــوازبێنی

بــــۆ خـــــوازبێنی چـــــوون گــــشت مامــــەکانی
هــــــەتا ڕونــــــاك کـــــەن ئاســـــۆی ژیــــانی

مــــامی (خەدیجـــــە) (عمـــــر بــــن اســــد )
لـــــەوی دەخـــــوازن لـــــەبۆ (موحەممـــــــەد)

ئـــــەویش لـــــە وەڵام وتـــــی :- بەڕاســــتی
دڵمــــان زۆر پاکــــە ئێمـــــە لـــــە ئاســـــتی

ئـــــەو کارەمــــــان پـــــێ کــــــارێکی چـــــاکە
چـــــونکە (موحەممــــــەد) ڕەوشـــــتی پاکـــــە

بەڕاســــــتی بۆمــــــان جێـــــی شـــــانازیە
خــــــاتوو (خەدیجـــــە) ئەگــــــەر ڕازیــــــە

خــــاتوو (خەدیجـــــە)ش ئـــــەوهای دەخـــــوازی
لـــــە ناخیــــــەوە زوو پێــــــی دەبــــێ ڕازی

مــــــارە کــــــرا بــــــە شــــــەرعی ئیــــبراهیم
ســــەلامی لـــێ بـــێ خوایــــە گیـــان دائــــیم

ئـــــیتر (موحەممـــــــەد) وەکـــــو هـــــەزارێك
کــــــردی بـــــەدایکی گــــشت ئیمانـــــدارێك

ئەوسا گواستیەوە بێ دەهۆڵ و دەنگ
بە شێوەکی جوان کرا بە ئاهەنگ

خاتوو (خەدیجە) عومری چل ساڵ بوو
کاتێ (موحەممەد) لە بۆی حەلاڵ بوو

پێغەمبەری خواش ڕووناکی زەمین
تەمەنی ببووە بیست و پێنجەمین

ئیتر ڕۆژێکیان بەسەردا هەڵات
بۆ یەکتر خودا کردنیە خەڵات

بە فەرمانی خوای بە توانا و غەفوور
لەگەڵ یەکدابوون ماوەیەکی دوور

لەگەڵ یەکتر بوون وەکو دوو گەنجان
تا بەهۆی مردن لێك بوون ، نەڕەنجان

بە هۆی خەدیجە زۆر دەوڵەمەند بوو
زیاتر لە جاران ڕێزی پەسەند بوو

بەڵام ئەومندەی یەك نووکە دەرزی
بەهۆی سامانی نەیکرد لووتبەرزی

هاوسەری یەك بوون تا بیست و پێنج ساڵ
پێیانی بەخشی خودا شەش منداڵ

چوار کچ و دوو کوڕ (خەدیجە) بوونی
وەکو بەهار بوون لەبۆ دەروونی

(زەینەبـــــە) و (ڕوقیـــــە) لەگـــەڵ (ام کلثـــوم)
چـــــوارەم (فاتیمـــــە) وەك گوێبیـــــستی بـــووم

(عبـــــدالله) و (قاســـــم) کوڕەکـــــانی بـــــوون
هەربـــــە گـــچکەیی کۆچـــیان کـــرد و چـــوون

کـــاتێ دوا کوڕیـــان کۆچـــی کـــرد بـــۆ گـــڵ
تینێکـــــی گـــــەرمی کـــــردە نـــــاخی دڵ

چـــــونکە (خەدیجـــــە) کـــــوڕی نـــــەمابوو
وەکـــو گـــوڵ بـــۆ نـــاو ســـیس هەڵگـــەڕابوو

ئـــــەو مەرگـــــە ســـــاتە زۆر بەلایـــــەوە
گـــران بـــوو ، بـــــەلام دڵیـــــان دایـــــەوە

باســـــی منـــــدالآن هێـــــشتا زۆر مـــــاوە
ئەگـــــەر بنوســـــین گـــــشت ئـــــەم ڕوداوە

لەمـــــە پـــــــڕدەبن چـــــەندەها پـــــەڕاو
بـــــەلام بابـــــەس بـــــێ بـــــەکورتی و تـــــەواو

# بنیاتنانەوەی (کەعبە)

(کەعبـــــە)ی ڕێـــزگیراو بەســـەنگ و ڕێــــزە
مـــــاڵی خواوەنـــــدی گـــــەورە و بـــــەهێزە

شـــــوێنێکی پاکــــــە ، ڕێـــــزی گـــــیراوە
ســــەروەر (ئیـــــبراهیم) بونیـــــاتی نـــاوە

چــــایکرد بەویــــستی ئەوخوایـــــە تاکــــــە
بـــۆ خـــوا پەرســـتی و بـــۆ کـــاری چـــاکە

هەچــــەندە (کەعبـــــە) مــــاڵی خـــودا بـــوو
دیوارەکـــــــــــانی زۆر درزی دابـــــــــــوو

جارێـــــک لـــــەجاران لافـــــاو و بـــــاران
زۆربـــــەی دیـــــواری پـــیرۆزی ڕوخـــــان

(قــورەیش)یــش ویــستیان هــەر لەوشــوێنەوە
وەکـــــو جـــــارانی بونیـــــات نێنـــــەوە

بـــــەڵام دەترســـــان بـــــە هـــــۆی ڕوخـــــانی
توشــــی ئـــازار بـــــن ، وایـــــان دەزانـــــی

(وەلیـــــد موغـــــەیرە)گـــــەلێک بـــــەجوانی
یەکـــــەم کـــــەس هەســـــتا لـــــەبۆ تێکـــــدانی

زۆریـــــش پـــــاڕاوە ئـــــەو لـــــە خوایـــــەکان
تـــــاکو پێـــــی نـــــەگا هـــــیچ زەرەر و زیـــــان

هەموو ئەو خەڵکەی لە دەور و بەری
دەیانوت :- دەبێ چی بێتە سەری ؟!

بەلآم کە (وەلید) نەیبینی هیچ ئێش
خەڵکیش وەکو ئەو هەمووی چونە پێش

کرایە چوار بەش دیوارەکانی
هەر تیرە و بەشێك لە بۆ ڕمانی

لە دوای ڕمانی ئیتر بە یەك جار
بۆ چاككردنەوەی دەستیان کردبەکار

پێغەمبەری خواش بە نەرم و نیانی
بەردی دەکێشان بۆ بونیاتنانی

بە وەستا و بەردەست زوو بەدەست و برد
دیواری ماڵی خوایان تەواو کرد

دیوار تەواو بوو هەرچوار لا بەش بەش
ویستیان دابنێن ئیتر بەردەڕەش

بەلآم لەوکاتی لە هەموو لاوە
بوو بە ناکۆکی و بوو بە ئاژاوە

لەسەر دانانی ئەم بەردە ڕەشە
بەجارێ بووە هەرا و هەڕەشە

چونکە دانانی دەبووە شانازی
بۆیە کەس بە کەس نە دەبوو ڕازی

دەمارگیریەتی لە ناویان باو بوو
دانانی بەردیش شەرەف و ناو بوو

کەمێکی مابوو کە لە پێناوی
ببێتە کێشە و جەنگی خوێناوی

(ابو امیە) یەکێ بەرچاو بوو
پیاوێکی پیر و زۆر ڕێز گیراو بوو

وتی :- ئەی خزمان گوێ بگرن جارێ
من دەدۆزمەوە لە بۆتان چارێ

واباشە یەکەم کەس لە (صەفا)وە
بە دیار بکەوێ و بێتە ئەملاوە

دەیکەین بە (حەکەم) با وەك دڵسۆزێ
ئەو چارەیەکمان لە بۆ بدۆزێ

خەڵکیش هەرهەموو بەکۆ و بەتاکە
وتیان :- ئەم ڕایە ڕایەکی چاکە

هەربۆ خوا باشە پاکی و بێ گەردی
چاکترین کەسی ئاسمان و عەردی

بەویستی خودا هات لە بۆ ناویان
خەڵکیش بەجارێ ڕوون بوو بەرچاویان

وتیان :- بەڕاستی شتێکی چاکە
(موحەممەد) ڕاستگۆ و ئەمین و پاکە

کـــاتێ (موحەممـــەد) بـــەم شـــتەی زانـــی
بەویـــستی خـــودا ، بـــەرێك و جـــوانی

شـــتێکی ڕاخـــست بـــۆ دادپـــەروەری
بـــەردە ڕەشـــەکەی دانایـــە ســـەری

فـــەرمووی :- دەی وەرن ئـــەی دڵـــسۆزەکان
ئـــەی ســـەرۆك تـــیرە و ســـەرۆك هۆزەکـــان

هەریەکـــە و گۆشـــەك هـــەڵبگرن چـــاکە
بـــەرزی کەنـــەوە بـــەرەو جێگاکـــە

خـــەڵکیش تێگەیـــشت ئـــەم شـــتە وایـــە
وتیـــان :- باشـــترین تـــەگبیر و ڕایـــە

بـــەبێ نـــاکۆکی و بـــێ گرفتـــاری
بـــەردیان بـــەرزکرد بـــۆ ســـەر دیـــواری

ئینجـــا ســـەروەری دڵپـــاك و زانـــا
بەردەکـــەی هـــەڵگرت لـــەجێی خـــۆی دانـــا

نوێنـــەری خـــودای بـــێ هـــاوەڵ و زاڵ
لـــەوکات تەمـــەنی ببـــووە ســـی و پێـــنج ســـاڵ

هـــەزاران ڕەحمـــەت لـــەو نیـــاز پاکـــە
وەکـــو قورئـــان بـــوو لـــە ســـەر ئـــەم خاکـــە

هـــیچ کەســـێك وەك ئـــەو نیـــە و نـــاتوانێ
شـــتەکان یـــەك لـــە جێـــی خـــۆی دانـــێ

هــــەر هــــەموو ژيــــانی ســــوود و كــــەڵك بــــوو
گــــەوره و مامۆســــتای هــــەموو خــــەڵك بــــوو

ئێــــستاش وەك ئــــەو كــــات هــــەر مامۆســــتايه
بــــۆ تــــاريكی شــــەو وەكــــو چــــرايه

گەرچــــی ئێــــستاكەش زۆر خــــەڵكی نــــەزان
دوورن لــــەو نــــووره ، لــــە تــــاريكی دان

## گۆشەنشینی(موحەممەد)(ﷺ) لە ئەشکەوتی (حەرا)

لـــــــەناو (قـــــــورەیش) لەســـــــەردەمی زوو
جـــۆرە رەوشـــتێك بـــاو و پەســـەند بـــوو

پیـــاوی بـــــەهۆش و لێهـــاتوو و دڵـــسۆز
هـــەبوون لـــە ناویـــان ، لـــە گـــشت تـــیرە و هـــۆز

روویـــــان دەکـــــردە ئەشـــــکەوت و دۆڵان
بـــۆ خـــوا پەرســـتن دەچـــوونە چـــۆلان

زۆری نـــــەمابوو ســـــەرداری ســـــەروەر
نیگـــای لـــە بـــۆ بـــێ ، بـــێ بـــە پێغەمبـــەر

بـــــیری کـــــردەوە و بەچـــاکی زانـــــی
پەرســـــتن بکـــــات بـــــۆ میهرەبـــــانی

ئـــەم ویـــست و رازەی لـــە نێـــو دڵ گـــەرا
کـــە بـــچێتە نـــاو ئەشـــکەوتی (حـــەرا)

(رەمـــەزان)یـــش بـــوو وەك هـــەموو ســـاڵێ
خـــواردنی بـــرد و دەرچـــوو لـــە مـــاڵێ

ئەشـــکەوتی (حـــەرا) لـــەکێوی (نـــوور) بـــوو
بـــە دووری دوو میـــل لـــە (مەککـــە) دوور بـــوو

بـــەر لـــەوەی نیگـــای خـــودای بێتـــە ســـەر
ســـــەرەنجی دەدا لـــــە گـــــشت بوونـــــەوەر

ســـــەرەنجی دونیـــای ئـــەدا بـــە جـــوانی
لـــە خوایـــەتی خـــوا نـــەی بـــوو گومـــانی

لەسەر ئایینی(ئیبراهیم)ی شیاو
خوای دەپەرستی بێ هاوتا و تەواو

دەیزانی خەڵکان بێهۆش و مەستن
بۆیە لە جێی خوا بت دەپەرستن

سەیری دەکردە جوولەکەی دڵ ڕەق
دەیدیت ئەوانیش زۆر دوورن لەحەق

ئەو خوداناسە ڕاست و حەق بێژە
زۆر بیری دەکرد لەو خەڵکە گێژە

چونکە خەڵکانی مەست و بیر خامۆش
بۆ دار و بەردان دەچوونە کڕنۆش

دەیوت :- چۆن دەبێت بەدکاری زۆردار
کەس لێی نەپرسێ و ون بێ بەیەك جار؟

لەو کات تەمەنی ببووە چل ساڵی
ئیتر نیگای خوا دەکێشێ باڵی

سڵاوی لێ بێ تا ڕۆژی دوایی
شان دەداتە بەر پەیامی خوایی

## دەستپێکردنی نیگا

سەروەر سڵاوی خودای لەسەر بێ
هەروەکو پەرژین لە دەوری وەربێ

کەوتە خەو بینین لە سەرەتاوە
خوا بە خەو بینین پیشانی داوە

گشت خەونەکانی کەم بە سەر نەچوو
وەك ڕۆژی ڕووناك بەڕاست دەرنەچوو

لەودەمی باو بوو خووی گۆشەگیری
سەروەریش دەیکرد ، بەڵام بەژیری

خوای مەزن و بەهێز وەهای دانابوو
لە بیست و یەکی (ڕەمەزان)دا بوو

لە ڕۆژی (دووشەم) لە (دە)ی مانگی (هەشت)
(شەش سەد و دە) بوو پیاوێکی پێگەشت

پێی وت :- مژدە بۆت بووی بە پێغەمبەر
بۆ (ئینسان) و(جین) تۆ بووی بە سەروەر

منیش (جبریل)م هاتووم بۆ لای تۆ
ڕەوانە کراوم لەلای خودای تۆ

لە ناو ئەشکەوتی (حەڕا) بوو سەروەر
کاتێ کە (جبریل) نیگای هێنا سەر

پێی وت :- (موحەممەد) ( إقراء) بخوێنە
فەرمووی :- نازانم وازم لێ بێنە

فـــــەرمووی :- گرتمـــــــی زۆر بــــــە بـــــەزەیی
هەنـــــــدێ ڕایگوشـــــــیم ، ئێـــــشم پێگــــــەیی

بـــــۆ جــــــاری دووەم پێـــــــی وتم دیــــــسان
منـــــیش بـــــەم جـــــۆرە بـــــۆی هاتمـــــە دوان

خوێنــــــــدەوار نیمـــــــە بۆیـــــــە نــــــازانم
ترســــــیش ڕۆیــــــشتبووە نــــاو دڵ و گیــــانم

فـــــەرمووی ئـــــەم جـــــارەش وەك جـــــاری پێـــشا
وەهـــــا گرتمـــــــی گـــــــشت گیـــــــانم هێـــــشا

فـــــەرمووی :- بخوێنــــــە لــــــە ســــێیەم جـــــاری
وتم :- مــــــن نیمـــــــە هـــــــیچ خوێنـــــــدەواری

دیـــــسان گرتمـــــی جــــــا هــــــەر بـــــەو ڕەنگــــی
گـــــــەلێکم بینـــــــی ئـــــــێش و دڵتـــــــەنگی

پاشــــــان بـــــۆمی خوێنـــــد هەنــــدێ لــــە قورئـــــان
منـــــیش لـــــەدوای ئـــــەو بـــــەزمانێکی جـــــوان

خوێنــــــدم بـــــەناوی خـــــودای کـــــار تـــــەواو
ئـــــیتر لــــێم ون بـــــوو ، نــــەما لەبـــــەر چـــــاو

جـــــا یـــــاران ئێـــــوە گـــــەر شـــــەیدای خێـــــرن
بـــــە کـــــۆ ســـــڵاوی لـــــە بـــــۆ بنێـــــرن

پێغەمبـــــــەری خـــــــوا ســـــــەروەری جیهـــــــان
وەك زینـدانییـــــەك بـــــەر بـــــێ لـــــە زینـــــدان

بــــــــە دڵەكوتـــــــــە گەڕایـــــــــــەوە مـــــــــاڵ
تـــــا گەیـــــشتە مـــــاڵ بـــــە خـــــراپترین حـــــاڵ

دووجـــــار لەســــەر یـــــەك فـــــەرمووی :- داپۆشـــــن
(خەدیجـــــە)ش وای كـــــرد بـــــە دڵـــــیّ ڕۆشـــــن

تـــــاوەكو بـــــۆی هـــــات ئـــــارامی ، وا بـــــوو
لـــــە ژێـــــر پێخـــــەفی تـــــرس و ســـــامدا بـــــوو

جـــــا وردە وردە هـــــێمن بـــــوو بـــــاری
شـــــڵەژان نـــــەما لەســـــەر ڕوخـــــساری

هـــــەزاران درووود بـــــۆ ئـــــەو دڵێـــــرە
كـــــە مایـــــەی خۆشـــــی و ڕەحمـــــەت و خێـــــرە

گەییـــــە چـــــل ســـــاڵ و شـــــەش مـــــانگ و هـــــەروا
لەگـــــەڵ دوازدە ڕۆژ ، بـــــوو بـــــە پێـــــشەوا

ســـــڵاوی خـــــودای گـــــەورەی لـــــە ســـــەر بـــــێ
ترســـــا، ئـــــەوەكو هیـــــچی بـــــە ســـــەر بـــــێ

(خەدیجـــــە)ش پێـــــی وت :- هـــــەرگیز لـــــەم كـــــارە
مەترســـــــــــە ، خـــــــــودا بـەزەییـــــــــدارە

خـــــوا شـــــێتت ناكـــــا ، جوانـــــە ئاكـــــارت
بـــــــەزەیی داری بەكـــــــــەس و كـــــارت

ســـــووك دەكـــــەی بـــــاری خـــــەڵكانی هـــــەژار
دەدەی یارمـــــــــــەتی دامـــــــــاو و نـــــــــەدار

گیانـــــه بـــا بـــەس بـــێ ، مـــەڵێ ئەترســـــم
لــــــه (ورقـــــــة بـــــن نوفـــــــل) ئەپرســــــم

چـــــونکە لــــــه (ئینجیـــــــل) زۆر شــــــارەزایە
ئەگــــــەر چــــــی کـــــوێرە بــــــەڵام زانایــــــە

خـــۆی و خەدیجــــه کــــه چـــوون لــــەو کــــاتی
بـــــۆی گێڕایـــــەوە گـــــشت بەســــــەر هــــــاتی

(وەرەقــــــــە)ش پێـــــی وت :- بزانـــــــه ڕۆڵـــــــه
بەڕاســـــتی قورســــــه ســــــەنگی ئــــــەو کۆڵـــــه

ئـــــەوەی تــــــۆ دیتــــــت مــــــوژدە هێنـــــەرە
بـــــۆ یــــــەکێکی وا کـــــــه پێغەمبــــــــەرە

ئـــــادەمی نـــــــه بـــــووە ، فریـــــشتەی خوایــــــه
ســــەد خۆزگــــه و بریـــا مـــن گـــەنج بومایـــــه

کــــه دەرت ئەکـــــەن خــــەڵکی ئـــــەم شــــاره
هاوەڵانیـــــــــــشت دەبـــــــــن ئـــــــــاوارە

چـــــــونکە زۆرداران قـــــــــەت نایانــــــەوێ
بـــــەرەی خواناســــــی و ڕاســـــتی ســـــەرکەوێ

پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :- دەریــــشم دەکــــەن ؟!
دووچـــــــاری دەردەســـەریـــــشم دەکــــــەن ؟!

(وەرەقــــــە)ش وتـــــی :- بــــەڵێ ئـــــەی کاکـــــه
دەبینــــــه ڕێگـــــری ڕێبـــــازی چـــــاکە

هەر كەسێش پێش تۆ پێغەمبەر بووبێ
دەبێ دووچاری دەردەسەر بووبێ

ئەگەر بمێنم هەتا ئەو دەمە
یارمەتیت دەدەم بەو هێزەی هەمە

بەلام (وەرەقە)ش خوا بوو بە یاری
كۆچی كرد بەرەو پەروەردگاری

هاتەوە (جبریل) وەكو لە مەو بەر
بەویستی خودا بۆ لای پێغەمبەر

فەرمووی (موحەممەد) تۆ پێغەمبەری
سەروەری (جین) و هەموو (بەشەر)ی

بانگ دەكەی خەڵكان بۆ خوا پەرستی
ناچاری ، دەبێ بەم ئەركە هەستی

ئەوساكە دەگری دەستی سەروەری
ئاوێك لەوێ بوو بردی بۆ سەری

دەست نوێژی شۆری جا لەبەر چاوی
سەروەری فێركرد زۆر بە تەواوی

جا نوێژێكیان كرد لێ یان بێ سەلام
(جبرائیل) لە بۆی دەبێ بە ئیمام

# وەستانی نیگا و هاتنەوەی

پێغەمبەری خوا نەما گومانی
ئەرکێکی گەورە کەوتە سەرشانی

بۆی ڕون بوو کەوا دەبێ هەڵبستێ
نەهێڵێ هیچ کەس بت بپەرستێ

لە جێگای دڕك گوڵان بڕوێنێ
کۆشکی ئیسلامی دا بمەزرێنێ

کارێکی ئەوها پڕ ترس و فورسە
ڕاسپاردەی یەکێ زۆر چاو نەترسە

ویستی لەسەر بوو خواوەندی (صَمَد)
نیگا بوەستێ لەسەر (موحەممەد)

وەستانی نیگا نارەحەتی کرد
لەناخیەوە زۆر بێتاقەتی کرد

چونکە دەیزانی سەروەری دڵپاك
بۆتە نوێنەری خواوەندی بێ باك

دەیوت :- بۆ نیگا نایەتە خوارێ
تاکو بۆم بکا چارەی گشت کارێ

بە ڕاوەستانی گەلێك غەمبار بوو
بەڵام خواوەندی هەر دۆست و یار بوو

ئینجا لەو ساتی فریشتەی خودا
لە پڕ هات تاکو ڕێنوێنی بکا

پێــــی وت :- بــــه ویــــستی خـــوای میهرەبـــــان
بـــووی بـــه پێغەمبـــەر بـــۆ (جــین) و (ئینـــسان)

لـــەو کاتـــەی (جبریـــل) مـــژدەی بـــۆ دێـــنێ
خــــــەم و پــــــەژارەی لـــــــەلا نـــــامێنێ

ئەگـــەر چـــی لـــەو کـــات بەنـــدەی بـــەرد و بـــت
بــــــه گاڵتــــــەجاری ئەمەیانـــــــه دەووت

خـــــودای (موحەممــــــەد) وا لێـــــی تـــــۆراوه
بۆیـــــــه لـــــــه نیگـــــــا وازی هێنـــــاوه

بــــــەڵام خــــــوایی گـــــەوره بەزەییـــــداره
لــــــه ســــــەری لادا خـــــــەم و پــــــەژاره

(جبرائیـــــل)ی نـــــارد لـــــەو ســـــات و دەمـــــی
بـــه (والـــضحی) بـــوو کـــەلای بـــرد خـــەمی

خـــوا ســـوێندی بـــۆ خـــوارد کـــه نـــه تـــۆراوه
وتـــــەی کـــــوفری پـــــیس هەڵبەســـــتراوه

پاشــــــه ڕۆژێکـــــــت هەیـــــــه زۆر بـــــــەپێز
بـــه ئـــارەزووی خـــۆت لێـــت دەگـــیرێ ڕێـــز

بەویـــــستی خـــــودای بـــــێ هـــــاوەڵ و تـــــاك
چـــــەندین ڕوداوی گـــــەوره و ترســــــناك

لەلایـــــەن خـــــودای بـــــەرز و کـــــار ئاســـــان
دەهــــات بەســــەری گــــەورەی خواناســــان

لـــه دوای چــــەند رۆژێـــــك ســـــەرومری بــــەرێز
گـــوێی لــــەدەنگێك بـــوو زۆر بەســــام و هێــــز

دیــــتی لـــــه ئاسمــــان یـــەك لەســـــەر كورســــی
لەســــــەر شـــــێوەیەك پــــــڕ لـــــــه مەترســــــی

ئـــــەو فریـــــشته بـــــوو كــــەوا یەكــــەم جــــار
لـــه (غــــاری ) (حــــەڕا) لـــه بـــۆی هاتــــه خــــوار

ســــــلاوی لــــــێبێ جــــا بـــــه هـــــەر حــــالێ
بــــــه دڵــــــه ڕاوكـــــێ هاتـــــەوه مـــــالێ

تـــــرس و ســــــام كەوتــــــه دڵ و دەروونــــــی
دووجــــــاران فـــــەرمووی چــــاك (دثیرونـــــي )

مانـــــای داپۆشــــــن كــــــه دایــــــان پۆشـــــی
چــــــۆ بــــــن پێخـــــەفێ وەكــــو نەخۆشــــی

ســـــورەی ( مــــدثر) خـــــوا بــــۆی دابـــــەزان
تـــــا بترســــێنێ گــــشت خــــەڵكی نــــەزان

مانــــــای ئـــــەی ئــــەوەی كــــەخۆی پێـــــچاوه
هەســــــــته ، ڕاپــــــەڕه ، كــــــاتی نـــــــەماوه

خــــــودا بـــــه گــــــەوره و مــــــەزن بزانـــــــه
هــــــەر خــــــودا گــــــەورەی هــــــەموو گەورانـــــــه

وه بــــــــەرگ و كــــــالآت پـــــــاك بكــــــــەرەوه
بـــــەدڵ لـــــه خراپـــــه خـــــۆت دوور كـــــەرەوه

## موسڵمان بوونی (عەلی) کوڕی (أبو طالب)

گرانــــــی ڕوویـــــدا ســــاڵێك لــــە ســــاڵان
نــــان بەزەحەمـــــەت بـــوو لــــە زۆربـــەی مــــاڵان

(ابـــــو طالـــــب)یـــــش زۆر خێزانــــدار بـــــوو
لەگـــــەڵ ئەوەشــــا گـــــەلێك هـــــەژار بـــــوو

پێغەمبـــــەری خـــــواش ڕووی کـــــرده مـــــامی
فـــــەرمووی :- ئـــــەی (عـــــەباس) گیـــــانی ڕەوامـــــی

(ابـــــو طالـــــب)ی بـــــرات بـــــەم جـــــۆرە
مـــــامی منیـــــشە ، خێزانـــــــی زۆرە

بـــــا کـــــەمێك ســـــووك کـــــەین بـــــاری سەرشـــــانی
تـــــا دەکرێتـــــەوە دەرگـــــای هـــــەرزانی

بـــــا بـــــۆی بـــــەخێو کـــــەین یەکـــــە و منـــــداڵی
تـــــاکو ئـــــەو کاتـــــەی بـــــاش دەبـــــێ حـــــاڵی

(عـــــەباس)یـــــش (جەعفـــــەر) دەبـــــا لـــــەو دەمـــــی
خـــــۆی دەخاتـــــە ژێـــــر بـــــاری هاوخـــــەمی

پێغەمبەریـــــشمان لێـــــی بـــــێ زۆر ســـــەلام
بردیـــــە مـــــاڵی خـــــۆی (عـــــەلی) کـــــوڕە مـــــام

ئـــــیتر لـــــەو ڕۆژ و لـــــەو دەم و لـــــەو کـــــات
پێغەمبەریـــــەتی بـــــۆ (موحەممـــــەد) هـــــات

ڕۆژێکیـــــان (عـــــەلی) کـــــە هاتـــــەوە مـــــاڵ
سەرســـــوڕهێنەری بەســـــەریا بـــــوو زاڵ

دیتی (موحەممەد) لەگەڵ خێزانی
لە کڕنۆشدانە بە نەرم و جوانی

سەرنجی ئەدا زۆر بەسەر سامی
لە (خەدیجە)خان ، لە کوڕی مامی

بەڵام نەیزانی ئەم جگەرگۆشە
لە بۆ کێ دەبن ئا ئەم کڕنۆشە

بە تێرامان و لێ وورد بوونەوە
بەجێی نەهێشتن تا لێبونەوە

کە لێبوونەوە بە جۆش و خرۆش
وتی :- بۆچی بوو ، بۆ کێ بوو کڕنۆش؟

(موحەممەد) فەرمووی :- ئا ئەم سوجدەیە
بۆ خودای پاکی ڕێ پڕ مووژدەیە

نوێژ و سوژدەشمان هەر بۆ ئەو چاکە
کە بێ هاوەڵە ، بە تەنیا و تاکە

ئەو خوایەی منی کردە پێغەمبەر
تا بۆلای بانگ کەم جنۆکە و بەشەر

جا داوام وایە لە تۆ ئەی گیانە
خوای بەدیهێنەر بە تاک بزانە

هەرچی بتەوێ بێ سوود و کەڵکە
خودا خاوەنی ئاسمان و خەڵکە

زۆرم حەزلێیــــــــە ئـــــــەی لاوی تـــــــازە
ئەگـــــەر تـــــۆش بێیـــــە ســــەر ئــــەو ڕێبـــازە

بـــە فــــەرموودەی جـــوان هەســـتی گـــەرم بـــوو
بۆیـــــــە وا خێــــــرا دڵـــــــی نــــــەرم بــــــوو

جـــــا (عــــــەلی) وتـــــی :- موســـــڵمان نـــــابم
تـــــاوەکو ڕاوێـــــژ نەکــــــەم بــــــە بــــــابم

ســـــەرومریش فـــــەرمووی :- گـــــەر دان نـــــاهێنی
بـــــا ئــــــەو نهێنیـــــــە لــــــەلات بمێنـــــــی

شــــەو بـــیری دەکـــــرد (عــــەلی) لــــە ئاســـتی
زۆر حــــــەزی دەکـــــــرد لـــــــە ڕەوا و ڕاســـــــتی

بـــــــەڵام خواوەنــــــدی گـــــــەورە و بــــــەتوانا
ڕێنمـــــایی کــــــرد بـــــۆ ڕێـــــی پڕمانـــــــا

بـــــەیانی کاتێــــــك کـــــە هاتــــــە خەبــــــەر
زۆر بــــــە مەردانــــــــە چـــــۆ لای پێغەمبـــــــەر

وتـــــی :- کـــــاتی خـــــۆی ئــــــەو میهرەبانـــــــە
کـــــە دروســـــتمی کــــــرد بـــــەو شـــــێوە جوانـــــە

پـــــرس و ڕاوێـــــژی نــــــەکرد بـــــە بـــــابم
تـــــا بـــــە قـــــسەی بـــــابم بەنـــــدەی خـــــودا بم

بـــــوو بـــــە موســـــڵمان بـــــێ پـــــرس و ڕاوێـــــژ
ئـــــیتر لەگــــــەڵ وان دەســـــتی کـــــرد بـــــە نوێـــــژ

یەکـــەمین گـــەنج بـــوو (عـــەلی) بەختـــەوەر
بـــــاوەڕی هێنـــــا بـــــە خـــــوا و پێغەمبـــــەر

لـــە ئافرەتـــانیش (خەدیجـــە)خـــان بـــوو
بـــــاوەڕی هێنـــــا و زوو موســـــڵمان بـــــوو

خـــوای لـــێ ڕازی بـــێ خەدیجـــەی بـــەڕێز
ســـەروەر بـــەهۆی ئـــەو بـــوو بـــەخاوەن هێـــز

هـــەروەها (عـــەلی)ش خـــوای لـــێ بـــێ ڕازی
لـــە پێنـــاو خـــودا دەیکـــرد گیـــان بـــازی

خوایـــــە ســـــڵاوت بەقـــــەد ئەســـــتێرە
بنێـــرە بـــۆ ســـەر گـــۆڕی ئـــەو شـــێرە

## موسڵمان بوونی (ئەبو بەکر)ی (صدیق)

ئیتر پێغەمبەر کەوتە بیردۆزی
بۆ بانگەوازی خوا بە دڵسۆزی

چۆن بدرکێنێ ئەم بانگەوازە
ڕایبگەیەنێ ئەم دینە تازە

چونکە قورەیشی لە سەر بت سوور بوون
هەر بتپەرست بوون لە ڕاستی دوور بوون

(ئەبو بەکر)ی مەرد و ڕێزگیراو
باسی بەرێزی دەخەینە بەرچاو

پیاوێکی ڕێک و پێگەیشتوو بوو
زۆر زانا و ژیر و تێگەیشتوو بوو

دۆستێکی پاکی پێغەمبەرمان بوو
بۆ کێشە و زامی کۆمەڵ دەرمان بوو

(موحەممەد) فەرمووی بە ئەم هاوڕێیە
گوێ بگرە ئاخۆ چ موژدەم پێیە

خودای میهرەبان نیگای بۆ ناردووم
بە دوا پێغەمبەر هەڵی بژاردووم

بە دەنگم وەرە ئەی چاوی چاوم
بەفەرمانی خوا ڕەوانە کراوم

ئەو خەڵکە لە ناو نەزانی مەستن
دەبێ بانگیان کەم بۆ خوا پەرستن

ڕێی خوا پەرستی باشترین ڕێیە
بۆ هەردوو دونیا مزگێنی پێیە

(ئەبو بەکر)یش زۆر بە ئاسانی
شەهادەی هێنا و بەڕاستی زانی

کە (ئەبوبەکر) بوو بە موسڵمان
بووبە شوورەیەك بۆ قەڵای ئیمان

لە هەموو پیاوێك خێراتر و زوو
بە دەنگی بانگی ئیسلامەوە چوو

پێغەمبەرمان زۆر بەمە دڵخۆش بوو
کانی سازگاری ئیسلام پێی جۆش بوو

بە هۆی باوەڕی گەرم و بە تینی
ئیسلام پەرەی سەند بە سەر بێ دینی

پیاوێ بەڕێز و زۆر دەوڵەمەند بوو
لە ناو خەڵکدا ڕێزی پەسەند بوو

ڕەوشتی جوان بوو گەلێك هۆشمەند بوو
دڵی خەڵکی زۆر پێیەوە بەند بوو

بۆ بانگی ئیسلام زۆر زوو گوێبیست بوو
لای پێغەمبەریش زۆر خۆشەویست بوو

چونکە بێشك و دوودڵی و گومان
ڕاستەوخۆ هاتە ناو بازنەی ئیمان

نەیوت :- (موحەممەد) بەڵگەم بۆ بێنە
ئەو دینە تازەم بۆ بسەلمێنە

چونکە دەمێك بوو دۆست و هاوڕێی بوو
زۆر بە تەواوی باوەڕی پێی بوو

بۆ ڕێگەی ئیسلام بوو بە بنچینە
زۆر هەوڵی دەدا سەرخا ئەم دینە

کەوتە بانگەواز بەرێی نهێنی
تا هاوڕێ و خزمی بۆ ڕاستی بێنی

خەڵکانێکی زۆر لەسەر دەستی ئەو
هاتنەدەر لەناو تاریکایی شەو

لەوانە (طلحە ) و( زبیر) و (عثمان)
(اسماء) و (سعد) و هەم (عبدالرحمن)

هەزاران سڵاو لە پێغەمبەرمان
بۆ زامەکانمان ئەو بوو بە دەرمان

وا باڵی ڕەحمەت هاتۆتە سەرمان
خوایە دوورمان کەی لە گشت بێشەرمان

بە ئازار و ئێش ئەو گوڵە باغە
بۆ ئیسلام داینا بەردی بناغە

## نهێنی بانگەواز بۆ ئیسلام

پێغەمبـــــەری خـــوا کەســـێکی پـــاك بـــوو
چـــونکە بـــزاردەی خواوەنـــــدنی تـــاك بـــوو

لـــە هـــەوڵ دابـــوو لـــە هـــەموو شـــوێنێ
تـــــاکو نـــــەمامی ئیـــــسلام بـــــڕوێنێ

خـــــەباتی دەکـــــرد بـــــۆ نزیـــــك و دوور
ئیـــسلامی دەکـــرد بـــە یاســـا و دەســـتوور

دەیویـــــست هـــیچ کەســـێ دڵـــی نەهێـــشێ
ســـــەرنجیان بـــــۆ لای خـــــوا ڕابکێـــــشێ

خـــــەمی خـــــەڵکانی هەڵـــدەگرت بـــــەدڵ
دڕکـــی دەکـــردن بـــە نێرگـــز و گـــوڵ

دەیفـــەرموو :- خـــەڵکان لـــە کـــام جـــێ و لا بـــن
وا باشـــە بەنـــدەی بـــەرێزی خـــوا بـــن

خـــــەڵکی لـــــەلای خـــــوای کۆدەکردنـــــەوە
دەرگـــــای ڕەحمـــــەتی بـــــۆ دەکردنـــــەوە

بـــــە شـــــێوەیەکی ڕاســـــت و ڕەوایـــــی
دەدوا لـــــە باســـــی ڕۆژانـــــی دوایـــــی

خـــەڵکیش بـــۆ ئیـــسلام دەهـــات بـــە گـــەرمی
زوو وەریانـدەگـــرت فـەرمـــوودەی نـــەرمی

دەیفـــــەرموو :- ڕۆژی دوایـــــی پـــــڕ خەمـــــە
هەرچـــەندە تێـــشووی بـــۆ دانـــێن کەمـــە

پیـــــاوێکی عــــــەرەب کـــــە بیـــــستی باســـــی
بـــــۆ لای ســــــەروەر چـــــوو تــــاکو بیناســـــی

کــــاتێ گەییـــــە لای بـــــە ڕەنگێکـــــی جـــــوان
پێـــــی وت :- بخوێنــــە بـــــۆم هەنــــدێ قورئـــــان

پێغەمبــــــەری خــــــواش بـــــە دڵ ڕوونــــــاکی
ســــورەی (زلـــــزال)ی بــــۆ خوێنــــد بــــە چــــاکی

وتـــــی :- بـــــا بـــــەس بـــــێ چـــــیتر مەخوێنــــــە
ئەوەنــــــدە بەســــــە ، زۆر هەســــــت بزوێنــــــە

هەرچـــــەندە ورد بـــــێ ، خێـــــر بـــــێ یـــــان تــــاوان
لـــــە ڕۆژی دوایـــــی دێتــــــە بـــــەر چـــــاوان

ئـــــەو کـــــەس پێـــــی وابـــــوو هەرکەســـــێک کەســـــە
ســــــورەی پـــــیرۆزی (زلـــــزال)ی بەســــــە

هـــــەر کـــــەس هاتبایــــە نـــــاو بازنــــەی ڕەحمـــــەت
لـــــە لای نـــــەدەما ئـــــازار و زەحمـــــەت

چـــــونکە هەریـــــەکێک ناوێنــــــەی حــــــەق بـــــێ
گـــــەلێک ئەســـــتەمە بڕواکــــــەی لــــــەق بـــــێ

بۆیـــــە یـــــارانی ســــــەروەری بــــــەڕێز
لـــــە دڵیـــــان دابـــــوو بـــــاوەڕی بــــــەهێز

کــــــەس پێـــــی نـــــە دەکـــــرا دڵیـــــان بگـــــۆڕی
کـــــێ دڵـــــی لـــــە دیـــــن گـــــۆڕا دەدۆڕێ

بـــــــــەڵام لەترســــــــــى زۆرى زۆرداران
پـــــەنهان دەهاتنــــــە نـــــاو ڕيـــــزى يـــــاران

ئـــــەمڕۆش وەك ئـــــەو كـــــات دەســـــتەى دڵڕەقـــــى
دەجـــــەنگن دژى ڕوونـــــاكى و حـــــەقى

بـــــەڵام نـــــوورى خـــــوا دەمێنێتـــــەوە
بـــــە فـــــووى كـــــافران ناكوژێتـــــەوە

## قورەیشی و موسڵمانەکان

پێغەمبەری خوا بڵاو بوو باسی
خەڵکی بانگ دەکرد بۆ خوداناسی

ئەوە بوو هەموو مەبەست و ڕازی
خەڵکان خوای گەورە لە خۆ کەن ڕازی

چونکە مرۆڤی بێ هۆش و سادە
ببونە بەندە بۆ بەرد و مادە

وایان دەزانی وازی لێ دێنێ
هەستیان نەدەکرد باوەڕ دەڕوێنێ

وتیان:- ئەمەشیان کەمێك دەمێنێ
وەك ئەوانەی تر زوو هەرەس دێنێ

گوێیان پێ نەدا ئەوان لە پێشا
تا بە ناویاندا باڵی ڕاکێشا

کەمێ مەترسی لە نێو دڵیان نیشت
هەرچەند بەهێز بوون دەستیان دەڕۆیشت

بینییان گەلێك خەڵکی بەبێ باك
هاتنە سەر ڕێگای خوداوەندی تاك

بۆ ئەوەی دینی باب و باپیریان
هەرەس نەهێنێ وا هاتە بیریان

بە جۆرێکی تر هەستانە سەرپا
تاکو نەتوانێ هیچ بکا بەرپا

بـــــێ ئابڕوانـــــــە دڵڕەقـــــــان لـــــــەوکات
دەیـــــانکرد ئـــــەوەی لەدەســــتیان دەهـــــات

پێغەمبــــــەری خـــــواش لـــــەڕێی نهێنـــــی
تـــــوانی زۆر خـــــەڵك بـــــۆ ئیـــــسلام بـــێنی

قورەیـــــشی هێنـــــدە ســـەخت و ســـەر ڕەق بـــوون
لـــە ســـەر ناحـــەق بـــوون ، دوژمـــن بـــە حـــەق بـــوون

بۆیـــــــە هەرکەســــــێك موســــــڵمان دەبـــــوو
توشـــــــی لێـــــــدان و ئـــــــازاردان دەبـــــوو

هـــــەروەك (عثمـــــان)ی کـــــوڕی (عفـــــان)ی
کـــــە موســـــڵمان بـــــوو و مـــــامی پێـــــی زانـــــی

هـــــەردوو بـــــاڵی بەســـــت بـــــۆ ئـــــازار دانـــــی
تـــــا بڕیـــــار بـــــدات بـــــۆ پەشیمانـــــی

پەشـــــیمان بـــــوونی گـــــەلێك زەحمـــــەت بـــــوو
چـــــونکە دینێکـــــی پـــــڕ لـــــە ڕەحمـــــەت بـــــوو

(زوبێـــــری کـــــوڕی عـــــەوام)یـــــش هـــــەروا
بـــــڕوای هێنـــــا بـــــوو بـــــە بەرنامـــــەی خـــــوا

ئـــــازاری ئـــــەدا سەرشـــــێتی مـــــامی
ئـــــەو لاوە جوانـــــە زۆر بـــــە بـــــێ تـــــامی

لـــــە ســـــەر بڕواکـــــەی ببـــــووە ئەســـــیرێك
لوولیـــــان دەکـــــردە پارچـــــە حەســـــیرێك

لـــــە ڕاز و نیازیـــــان هـــــەر دوور تـــــر دەبـــــوو
لـــــە ســـــەر دیـــــنی خـــــوا هـــــەر ســـــوور تـــــر دەبـــــوو

یـــان (ســـەعدی كـــوری ئـــەبو وەقـــاص)ی
لـــە حەفـــدە ســـاڵی خـــوای بـــەتاك ناســـی

دایكـــی ون ببـــوو لـــە نـــاو ئـــەو تەمـــە
زۆر خەفـــەت بـــار بـــوو كـــەزانی ئەمـــە

زۆری نـــەما بـــوو بـــچێ لـــە هۆشـــی
گـــرژ بـــوو چـــاوی بـــە ئـــەبرۆ پۆشـــی

چـــونكە كوڕەكـــەی زۆر بـــە پەرۆشـــی
بۆتـــە موســـوڵمان بـــەو پـــەڕی خۆشـــی

پێـــی وت :- ئـــەی كـــوڕم چـــیت لـــێ قـــەوماوە
ســـەیرە ، بـــۆ شـــێت بـــووی هۆشـــت نـــەماوە ؟

پـــەیمان بـــێ پـــەیمان ئـــەی كـــوڕم (ســـەعد)
گـــەر تـــۆ بـــچیە ســـەر دینـــی (موحەممـــەد)

هـــیچ شـــتێ نـــابێ بـــچێ بـــە زارم
جـــا بـــاش گـــوێ بگـــرە كـــوڕی نـــازدارم

گـــەر دەســـت هـــەڵناگری ئـــەتۆ لـــەم دینـــە
دەبـــێ لـــە برســـان دەرچـــم لـــەم ژینـــە

بـــەلام (ســـەعد) هـــەر ڕووی كـــردە داكـــی
پێـــی وت :- بزانـــە بـــە باشـــی و چـــاكی

دایـــە گیـــان ئەگـــەر ســـەد گیانـــت هـــەبێ
هـــەمووی یـــەك بەیـــەك لـــە برســـان دەربـــێ

دەســـت هـــەڵناگرم لـــە ڕێگـــای ئیـــسلام
ناگەڕێمـــەوە نـــاو خـــەڵكی نـــەفام

دایکــــی تێگەیـــشت گـــەلێك بـــە جـــوانی
(ســــــەعد) زۆر دووره لـــــــە پەشـــــیمانی

تینـــوو و برســـــیەتیش بـــاڵی بـــۆ کێـــشا
ناچـــار بـــوو چـــۆوه ســـەر بـــاری پێـــشا

پاشـــان (ســـەعد) چـــوو بـــۆ لای پێغەمبـــەر
تـــــاکو نـــــەیمێنێ گومـــــان و ئەگـــــەر

هـــــەموو باســــــەکەی بـــــۆ گێڕایـــــەوه
تـــــاوەکو ڕاســــــتی بێتـــــە کایـــــەوه

بـــۆ ئـــەم مەبەســـتە ئایـــەتی قورئـــان
خـــوا بـــۆ پاڵپـــشتیی (ســـەعد) دابـــەزان

ســـەرومریش فـــەرمووی :- دەبـــێ بزانـــی
نـــا بـــێ دەربـــچی تـــۆ لـــە فـــەرمانی

لەگـــەڵیان دابـــە بـــە ســـۆز و چـــاکە
بـــێ گومـــان بەهەشـــت لـــەبن پێـــی داکـــە

بـــەڵام گـــەر داکـــت مـــەرجی دانـــابێ
مەرجەکـــەی ئـــەویش دژی خـــودا بـــێ

ئەگـــەر بـــۆ ئیـــسلام ڕێـــت لـــێ ببەســـتێ
یـــان (بـــت) و (بـــەرد)ت پـــێ بپەرســـتێ

بـــۆ ئـــەم کارانـــە پێـــت بکـــا فـــەرمان
نـــا ، هـــەرگیز مەکـــە ئـــەتۆ بـــەگوێیان

زۆری وا هـــــاتوون بەســـــــەر موســـــڵمان
بەســـــــەرهاتی وا دێـــــــشێنێ دڵمـــــــان

بــــە دەســــت كـــافران ئازاریـــان دەچەشـــت
گیـــان لەســـەر دەســت بـــوون لـــە پێنـــاو بەهەشـــت

بــــە پـــەنهان دەچـــوون لـــەبۆ كەنـــد و دۆڵ
رویـــان دەكـــردە دەشـــت و شـــوێنی چـــۆڵ

دوور لـــە ئـــاوایی بـــە تـــرس و پەســـتی
ئـــــــەنجامیان دەدا خوداپەرســـــــتی

تـــا رۆژێـــك پێرێـــك كـــافری دڵ ڕەق
ســـەر لێـــشێواو و ملـــهوڕ و ئەحمـــەق

پێیـــان دەكـــردن گاڵتـــە و پێكـــەنین
قـــسەی نارێكیـــان دەكـــرد دژ بـــە دیـــن

بـــەڵام خواناســـان لێیـــان هاتنـــە دەنـــگ
لەنێوانیانـــدا بـــوو بـــە هـــەرا و جـــەنگ

(ســـەعد)ی موســـڵمان كـــە دای پـــەلامار
خـــوێن لـــە كافرێـــك تكـــا و هاتـــە خـــوار

بـــە ســـەرە حوشـــتر ، یـــاخود بـــە بـــەردی
خوێنیـــان لـــە نێـــو چـــاو هێنایـــە عـــەردی

لـــەنێوان كـــوفر و ئیـــسلامدا ئەمـــە
یەكـــەمین خـــوێن بـــوو ڕژا لـــەو دەمـــە

# ئاشكراكردنی ئیسلام

بۆ ماوەی سێ ساڵ گشت موسڵمانان
خودا پەرست بوون ، بەڵام بە پەنهان

نەمامی باوەڕ تازە ڕوا بوو
تاك تاكە خەڵكی ڕوویان لە خوا بوو

هەتا خوای گەورە ویستی هاتە سەر
ئاشكرا ببێ ئاینی سەروەر

لەو دەم و ساتی خوای بەدیهێنەر
نیگای ناردە خوار بۆ سەر پێغەمبەر

تاوەكو خەڵكان حاڵیكا لە دین
(وانذر عشيرتك الاقربين )

واتە ئینزار دە گشت خزمەكانت
با لە گوێ بگرن فەرموودەی جوانت

لەگەڵیاندا بە تا باوەڕ بێنن
زۆر سەرگەردان و بێ سەر و شوێنن

باڵ داخە بۆ وان كە بە دوات كەوتوون
وانیش حاڵیكە ، لە (جەهل)ا خەوتوون

ئیتر ڕایگەیاند ئاینی وا چاك
تاوەكو خودا ڕابگرن بە پاك

گرۆی (قوڕەیش)ی هەموو بانگ كردن
فەرمووی :- خواناس بن لە پێشی مردن

بــــه بــــەردەوامی دەیــــوت بــــەم خەڵکــــه
گــــەر ئێــــستا نەیکــــەن ، دوایــــی بــــێ کەڵکــــه

بــــه (فاتیمــــه)ی وت ســــەرداری ســــەروەر:-
هیــــچم پــــێ نــــاکرێ بــــۆ کەســــێ لــــەو ســــەر

ڕۆژێــــك پێغەمبــــەر زۆر بــــه ئەساســــی
خزمــــی بــــانگ کــــردن لــــه بــــۆ خواناســــی

خــــەڵکێکی زۆریــــش جــــا لــــەو دەم وکــــات
وەڵامــــی داوه ، بــــه دەمیــــەوه هــــات

(ابولهــــب)یــــش بــــەدکارێ وا بــــوو
دوژمنــــی ســــەختی خۆشــــەوی خــــوا بــــوو

نەیدەویــــست ڕاســــتی ڕابگەیــــەنێ
بــــه زەبــــر و زۆری هــــەڵیان دەســــێنێ

تــــاکو نەبیــــستن قــــسەی بــــه قــــازانج
نەگــــەن بەســــوود و نــــاوات و نامــــانج

کــــه خــــەڵکان هەســــتان ســــەروەر پێــــی وتــــن :-
خــــوا ، خــــوای گــــشتمانه ، ئەوانــــه (بــــت)ــــن

مەیانپەرســــتن خزمــــان ، بــــەرێزان
هــــەموو کارێکتــــان دەخرێتــــه میــــزان

گومانتــــان نــــەبێ مــــن پێغەمبــــەرم
بــــۆ (جــــین) و (ئینــــسان) مــــن ئینزارکــــەرم

بــــزانن ، خــــودا داوای لــــێ کــــردووم
کــــه پێغەمبــــەربم بــــۆ هــــەموو مــــەردووم

هەرکەســـــێك دانـــــا و زانـــــا و هۆشـــــیارە
بـــــا پـــــشتگیریم کـــــا ڕاســـــتی دیـــــارە

بـــــەڵام دڵڕەقـــــان هـــــەموو کـــــات ویڵـــــن
ڕویـــــان وەرگێـــــڕا تـــــا بـــــەجێی بـــــێڵن

بـــــە تـــــەنها (عـــــەلی) وتـــــی :- پێغەمبـــــەر
پـــــشتگیریت دەکـــــەم بـــــە مـــــاڵ و بەســـــەر

کافرەکـــــان هەســـــتان زۆر بـــــە شـــــانازی
بـــــەجێیان هێـــــشتن بـــــە گاڵتـــــەبازی

جـــــارێ تـــــر خـــــزم و کەســـــی کـــــۆکردن
باســـــی خواناســـــی و ڕاســـــتی بـــــۆکردن

لـــــەو ســـــات پێغەمبـــــەر پێیـــــانی فـــــەرموو
درۆیـــــان ناکـــــەم بەقـــــەد داوی مـــــوو

ڕاســـــتی دەردەخـــــست لـــــەبۆ ئـــــەو خەڵکـــــە
تـــــا بـــــێ بـــــەش نـــــەبن لـــــەو ســـــوود و کەڵکـــــە

دەیفـــــەرموو :- خزمـــــان بۆچـــــی تێناگـــــەن؟
وەك بـــــەری کـــــاڵن بۆچـــــی پـــــێ ناگـــــەن؟

بـــــڕوام پـــــێ بکـــــەن ، قەســـــەم بـــــەو خوایـــــە
کـــــاتێ مـــــردن هـــــات وەك خـــــەوتن وایـــــە

هـــــەمووومان دەمـــــرین ڕاســـــتە ، بـــــێ ئەگـــــەر
لـــــە قیامەتیـــــشدا لـــــە گـــــۆڕ دێینـــــەدەر

پاداشـــــتی چـــــاکە ئـــــەدرێ بـــــە چـــــاکە
بـــــە پێـــــچەوانەش خـــــودا بـــــێ باکـــــە

یــــان بــــۆ بەهەشــــتی هــــەتا هەتایــــە
یــــان دۆزەخیــــی ، گــــەر کــــارت خەتایــــە

وەلأمیــــان داوه خــــەڵکێك بــــە نــــەرمی
هــــەر (ابولهــــب) زۆر بــــەبێ شــــەرمی

وتــــی :- ئــــەی خــــەڵکان نــــەبن ملکەچــــی
هێنــــدەی نــــەماوه ســــەری تێدەچــــی

(ابوطالــــب)ی مــــامی بــــە جــــواب هــــات
وتــــی گــــەر کەســــێ دەســــت بــــۆی درێــــژکات

پــــشتگیری دەکــــەم هــــەتاکو مــــاوم
دەیپــــارێزم وەك بیلبیلــــەی چــــاوم

ئــــاینی ئیــــسلام جــــا وردە وردە
بلأودەبــــۆوە لــــەودیوی پــــەردە

ئــــاینێکی وا دڵگــــر و پەســــەند
وەك خــــۆری بــــەیان هــــەر پەرمیدەســــەند

بۆمــــان ئەفــــەرمووێ وا (ابــــن عبــــاس)
دەربــــارەی بــــانگی ســــەروەری خوانــــاس

بــــانگی دەکــــردن هــــەر هــــەموو هــــۆزێ
بــــە ئامۆژگــــاری وەکــــو دڵــــسۆزێ

ئــــەو هــــەموو تــــیرەی کۆدەکردنــــەوە
دەرگــــای دڵــــی خــــۆی بــــۆ دەکردنــــەوە

بۆ ئەوەی دەرچن لە سەرشێواوی
بێنە سەر ڕێگای خوا بەتەواوی

ئەوسا دەیفەرموو :- ئەی خزمەکانم
درۆ دەرنەچووە لەسەر زوبانم

گەر ڕاگەیەنم پێتان بەم شێوە
لەشکرێك وا دێ لەم دیو ئەو کێوە

هەڵمەت و هێرش بۆ سەرتان دێنێ
تا لە ڕەگەوە دەرتان بهێنێ

ئەگەر وا بڵێم بڕوام پێ دەکەن ؟
ئەگەر من ڕاستگۆم سەرپێچیم مەکەن

بە تێکڕا خەڵك هەرهەموو دەڵێ :-
فەرموودەت جێگای متمانەن ، بەڵێ

چونکە خاوێنن کردە کاری تۆ
هەرگیز لە تۆمان نەدیوە درۆ

پێغەمبەر فەرمووی :- دە مادام وایە
پاکی و بێ گەردی هەر بۆ خودایە

بە سزای خودا دەتانترسێنم
لە سزای سەختی تێو دەگەێنم

ئیتر وازبێنن لە بتپەرستی
تاکەی دەمێنن ئەوها بە مەستی

خـــوداى بـــێ هـــاوەڵ بگـــرن بـــه پـــاكى
پەرســـتن بكـــەن بـــۆ ئـــەو بـــه تـــاكى

چـــەندين جـــار فـــەرمووى هـــەروا بـــەو خەڵكـــه :-
بـــه ئاگـــا وەرن ، دونيـــا بـــێ كەڵكـــه

فـــەرمووى :- ئـــەى نـــەوەى (مـــەناف) و (ئەســـەد)
هيـــچم پـــێ نـــاكرێ لـــه دوارۆژ ، ئەبـــەد

ئـــەى نـــەوەى (مخـــزوم) ، ئـــەى نـــەوەى( تـــەميم )
واز بێـــنن ئـــيتر لـــه كـــوفر و نـــەميم

ســـەيره ســـەر لـــه خـــۆ بـــۆ دەشـــێوێنن
چـــيتر بـــۆ (بـــت)ـــان ســـەر دامـــەنوێنن

بـــه فـــەرمانى خـــوا دەتانترســـێنم
پاشـــان پـــێم نـــاكرێ ســـوود بگـــەێنم

وەرنـــه ســـەر خـــوانى يەكتاپەرســـتى
هيـــچى تـــر مەكـــەن تەمبـــەڵى و ســـستى

(ابولهـــب)يـــش زۆر ڕق ئەســـتوور بـــوو
بتپەرســـتنى لـــه بـــۆ دەســـتوور بـــوو

وتـــى:- (موحەممـــەد)پـــەكت بكـــەوێ
ئەمەيـــه ، كـــەوا لـــه ئێمـــەت دەوێ

پێغەمبـــەرى خـــواش هـــەر لـــەو كاتـــەوه
ويـــستى وەڵامـــى ئـــەو بداتـــەوه

چـــونكه پێغەمبـــەر بـــە ئـــەو گوفتـــاره
كەوتـــە نـــاو دەريـــايی خـــەم و پـــەژاره

بـــەڵام خـــوای گـــەوره بـــە ڕێـــی نهێنـــی
ســـــورەی (مَـــــسَد)ی كـــــرده مزگێنـــــی

لـــەو ســـورەتەدا هـــەروا لـــەو باســـە
هەرەشـــــەكراوه لـــــەو خوانەناســـــە

جـــا ئەگـــەر كەســـێ دڵـــی بـــە غەشـــە
دەبێتـــــە دژی ئـــــەو دينـــــە گەشـــــە

هـــەر ســـوكايەتی و تياچـــوونی بەشـــە
لـــە هـــەردوو دونيـــا ڕيـــسوا و ڕوو ڕەشـــە

## کافرەکان ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) دەدەن

ئـــیتر قورەیـــشی ســـوك و رەوشـــت بـــەد
هەســـتان بـــە ئـــازاردانی( موحەممـــەد)

بـــۆ ئـــازاردانی ئـــەو راســـتیبینە
دەروونیـــان پـــڕ بـــوو لـــە داخ و کینـــە

جارێـــك لـــە (کەعبـــە) دەســـتیکرد بـــە نوێـــژ
کـــە (ئەبوجـــەهل)ی ســـەر شـــێواو و گێـــژ

وتـــی :- کـــەس نـــی یـــە لـــە ئـــەو خەڵکانـــە
هـــەنگاوێك بنـــێ بـــۆ قەســـابخانە ؟

پیـــسی و ڕیخۆڵـــەی وشـــتر بهێنـــێ ؟
کـــێ ئـــەم چـــالاکی یـــە گـــەورە دەنـــوێنێ؟

یـــەکێکیان هەســـتا نـــاوی (عوقبـــە)ی پـــیس
خـــوا دایـــبنێ لـــە ڕێـــزی(ئیبلـــیس)

بـــە خێرایـــی چـــوو بـــۆ قەســـابخانە
ڕیخۆڵـــەی هێنـــان ئـــەو بێئیمانـــە

لـــەو کـــات پێغەمبـــەر لـــە کڕنـــۆش دا بـــوو
تێکـــەڵی نـــوور و بـــەزەیی خـــوا بـــوو

کـــە (ئـــەبو جـــەهل)ی گـــەورەی نـــەزانی
بـــە شـــێوازێکی زۆر بـــێ ویـــژدانی

ئـــەو ڕێخۆڵانـــەی بـــە ســـەرومر داكـــرد
زیـــاتـــر خـــۆی تـــوشـــی غـــەزەبـــی خـــوا كـــرد

ژیـــانی پێغەمبـــەر لەدەســـتی ئـــەوان
پـــڕ بـــوو لـــە دەرد و لـــە ئـــازار و ژان

(ابولهـــب)خـــۆی لەگـــەڵ هاوســـەری
گـــەلێك دڵـــڕەق بـــوون دژ بەســـەرومری

زۆریـــان كـــۆ دەكـــرد پیـــسی و درك و داڵ
بۆیـــان دا دەنـــا لـــە پـــێش دەرگـــای مـــاڵ

ســـەرومر دەیفـــەرموو :- مەكـــەن ئـــەو كـــارە
كـــارێكی بـــەدە ، جێگـــای ئـــازارە

شـــەرمە وادەكـــەن ئێـــوە دراوســـێن
بـــۆ وا دڵـــڕەقن ؟ لـــە خـــوا بترســـێن

ئازاریـــان دەدا بـــە هـــەموو ڕەنگـــێ
كـــەس نـــەبوو بكـــات لـــە ســـەری دەنگـــێ

ڕۆژێـــك لـــە ڕۆژان (عوقبـــە)ی سەرســـەری
هێرشـــی بـــردە ســـەر پێغەمبـــەری

ســـەرومریش دەیكـــرد لـــە نـــاو(كەعبـــە) نوێـــژ
لـــە بەریـــشی بـــوو عەبایـــەكی درێـــژ

(عوقبـــە)ش عەباكـــەی كـــردە گـــەردنی
زۆر هیوایـــان بـــوو مـــەرگ و مردنـــی

ویـــــستی لـــــە نوێــــژدا ئــــەو بخنکێنـــــێ
بــــە بــــانگی پــــاکی کۆتـــایی بێنـــــێ

بـــێ شــــەرم کــــردن دەکەوتنــــە گیـــانی
زاتێکـــــی وایـــــان بــــە شــــێت دەزانـــــی!

ئـــەو دەســــتە پیـــسە بــــە هــــەموو هێـــزی
کۆشـــــشیان دەکـــــرد ، ئـــــەمێنی ڕێــــزی

بــەڵام هـــەموو کـــات بــە ســەنگ و ڕێــز بــوو
چــونکە خــوای گــەورە بــۆی پــەنا و هێــز بــوو

خواوەنـــــدی بــــەرزیش چــــاکترین کەســـــە
پــــەنای هـــەر کـــەس بــێ ، بێگومـــان بەســـە

# موسڵمان بوونی (حەمزە)

کـــوفر تـــا مـــابن هەريـــەك هەڵوێـــستن
خـــاوەنی هـــەمان ڕێگـــا و مەبەســـتن

وەکـــو مـــار خۆمـــان لێ دەخێـــوێنن
هـــەتا ناييمـــان لێ بـــشێوێنن

ڕۆژێکيـــان (ئەبوجـــەهل)ی شـــێت و مەســـت
کـــە بـــۆ شـــەيتانان ببـــووە داری دەســـت

ئـــەوی شـــێواو و نـــەفام و جـــەردە
بـــە ناشـــکرايی و بـــێ پـــەنا و پـــەردە

زۆربـــێ شـــەرمانە لـــە شـــوێنی (صـــەفا)
جنێـــوی ســـوکی بـــە پێغەمبـــەردا

لـــە دوای جنێـــودان ، ئینجـــا بـــە شـــادی
بـــۆ لای کافرەکـــان چـــوو لـــە بـــۆ (نـــادی)

بەوخەڵکانـــەی وت :- مـــنم ئـــەو کەســـە
دامـــە (موحەممـــەد)جنێـــو و قـــسە

زۆری پـــێ نەچـــوو ، کـــە (حـــەمزە)ی دلێـــر
لـــە ڕاو هاتـــەوە وەك پڵـــنگ و شـــێر

(حـــەمزە) لـــە (کەعبـــە) دەســـوڕايەوە
کـــە ئـــەم ڕووداوەی بـــۆ گێڕايـــەوە

کـــە نيزەيـــەکی (عبـــدالله جـــەدعان)
چـــووە پـــێش (حـــەمزە)ی مـــەرد و پاڵـــەوان

پێــی وت :- ئــەی (حــەمزە)کــەمێ لەمــەوبــەر
فــــلان جنێـــوی دایـــــە پێغەمبــــەر

تــۆ چــاوت لێ بـــوو ؟ (حــــەمزە) پێــی دەڵـــێ
جـــا ئـــەم ئافرەتـــەش بـــەوی وت :- بـــەڵێ

(حــــەمزە) هەســـــتا چــــوو چـــاکە بنـــوێنێ
لـــــە (ئەبوجـــــەهل) تۆڵـــــە بــــسێنێ

لـــە نـــاو کۆمەڵـــە کەســـێك وەســـتا بــــوو
(حـــەمزە)ش کـــەوانی لـــە نـــاو دەســـتا بــــوو

رۆیـــشت رووبـــەرووی وەســـتا مــــەردانی
کــەوانێکـــــی دا لـــــە نێــوچاوانــــــی

چـــاوی تاریـــك بـــوو (جــــەهل) بـــەجارێ
خـــوێن جۆگەلـــەی بەســـت لەســـەر بـــۆ خـــوارێ

ئـــەو (ئەبوجـــەهل)ـــەی نـــەگریس و بـــەدکار
کـــاتێ خـــوێن بـــە نـــاو چـــاویا هاتـــەخوار

کـــە (حــــەمزە)ی بـــینی بـــە کەوانــــەوە
ئـــیتر دەســــتی کــــرد بــــە پاڕانــــەوە

وتـــی :- گـــشت خـــەتا لـــە (موحەممـــەد)ە
هەرچــــی خوامانـــە پێـــی پـــووچ و بـــەدە

(حـــەمزە)ش پێـــی فـــەرموو :- قـــسەی ئـــەو وایـــە
گـــەر نێـــوە شـــێت نـــین کـــەی (بـــت) خودایـــە ؟

بـــەلام وادیـــارە بـــێ هـــۆش و هەســـتن
بۆیـــە لـــە جێـــی خـــوا بـــەرد دەپەرســـتن

ڕاســـت دەكـــا ، هەرچـــی (موحەممـــەد)دەڵـــێ
پـــڕ بەدڵمـــەوە پێـــی دەڵـــێم :- بـــەڵێ

ئـــیتر لەوســـاتە بـــوو بـــە موســـڵمان
هاتـــە ســـەر ڕێگـــای ڕاســـتی میهرەبـــان

هەنـــدێكیان لـــەوان بـــەبێ جورئـــەتی
ویـــستیان بـــۆ (جـــەهل)ی بـــدەن یارمـــەتی

نـــەوێران بیكـــەن هـــیچ بەرهەڵـــستی
چـــونكە دەیانـــدیت ســـەری شكەســـتی

(حـــەمزە)ی پاڵـــەوان شـــێری شـــەوەزەنگ
بـــاوەڕی هێنـــا دەرچـــوو لـــەناو ژەنـــگ

پێغەمبـــەری خـــواش كـــاتێ ئەمـــەی بیـــست
زیـــاتر لـــە خـــواوە ســـەركەوتنی ویـــست

بـــوو بـــە بـــەردێك بـــۆ بناغـــەی ئـــایین
لـــە دەوری بـــووە شـــورەی پـــۆلایین

(حـــەمزە)كـــە گرتـــی ڕێگـــای ســـەربەرزی
دڵـــی كـــافران بـــەجارێ لـــەرزی

بـــۆ زامـــی لاشـــەی ئیـــسلام دەرمـــان بـــوو
مـــامی بـــەڕێزی پێغەمبـــەرمان بـــوو

لـــە گیـــانی پـــاكی هـــەزاران صـــلاو
ســـڵاوی جـــوان و لـــە نـــاخ هـــەڵقولاو

بـــا ئێمـــەش وەك ئـــەو ڕێـــی خـــودا بگـــرین
بۆ خـــودا بـــژیـــن ، بـــۆ خـــودا بـمـــریـــن

## گەورە پیاوانی قورەیش و (أبوطالب)

لــــە هـــــەموو شــــاری (مەککــــــە) و دەوروبــــەر
(ابـــــوطالـــــب)ی مـــــامی پێغەمبـــــەر

هەرچـــەند کــافر بـــوو ، دوور بـــوو لـــە ڕاســـتی
لێهـــاتووی وا بـــوو ، دیـــار بـــوو جێـــی دەســـتی

بـــــەجۆرێکی وا ڕێزیـــــــان دەزانـــــــی
شـــتێ نــــــەدەکرا بــــەبێ فــــەرمانی

لــــەو کـــات نوێنـــەری ئـــەو ڕاســـتە دینـــە
خـــۆری ڕونـــاکی ســـەر ئـــەم زەمینـــە

لـــە ژێـــر چـــاودێری میهـــری خوایـــەوە
لـــــە لای ئـــــەو مامــــــەی دەحەوایــــەوە

لـــــەلای ئـــــەو مامـــــەش بـــــە بانگـــــەوازی
خـــەڵکی دەهێنـــا لـــــە بـــۆ ســـەر ڕازی

لـــە هەوڵـــدا بـــوو بـــە هـــەموو توانـــای
تـــــا بتپەرســـــتن نــــــەمێنێ مانــــای

بــــــەڵام مامیــــــشی دەیزانــــــی کــــــەوا
خـــــەڵك لێـــــی دەکـــــەن داخـــــوازی و داوا

ئەوســـا ڕۆژێکیـــان هەســـتان بـــەم کــارە
قورەیـــــشی هەرچـــــی دەســـــەڵاتدارە

(ئـــەبو ســـوفیان)یـــش خـــوای لێبێـــت ڕازی
لەگـــەڵ گـــەورانی دەســـتەی شـــەڕ خـــوازی

چـــوونە لای مـــامی بـــۆ ڕێگـــا چـــارێ
تـــاکو پێغەمبـــەر جـــارێ نـــا جـــارێ

خـــودا و ئاینیـــان بـــەو جـــۆرە چـــیتر
ئـــەوها ســـوك نـــەكا ، وازبێنـــێ ئـــیتر

(ابـــو طالـــب)یـــش ئـــەو هـــای وت بـــەوان :-
تێـــی دەگەیـــەنم ئـــەوە بـــە چـــاوان

پێغەمبـــەری خـــواش لـــە پـــەنای مـــامی
هەرهـــەوڵی دەدا بـــە بـــەردەوامی

موســـڵمانانیش وەك ڕەگـــی داری
ئیمـــان بـــە ناخیـــان ڕۆیـــشتبووە خـــواری

پێغەمبـــەری خـــواش نـــەی دەنوانـــد سستی
خـــەڵکی دوور دەخـــست لـــە بتپەرســـتی

بـــت پەرســـتەكان وەكـــو یەكـــەم جـــار
هـــەمووی هاتنـــەوە بـــە هـــاوار هـــاوار

(ابـــوطالـــب)یـــش وەك جـــاری پێـــشان
هـــەمووی ناردنـــەوە بـــە بـــێ دڵنێـــشان

بـــەڵام بەمـــەرجێ كـــەوا پێغەمبـــەر
دووبـــارە نـــەكا كـــاری لەمـــەو بـــەر

پێغەمبـــەری خـــواش زیـــاتر ســـوور دەبـــوو
شـــەیدای ڕێبـــازی خێـــر و نـــوور دەبـــوو

بــــێ ئــــەوەی کـــــەمێ ڕاســــتی بپۆشـــــی
بــــــه بـــــەردەوامی هــــــەر تێـــــی دەکۆشــــی

دیـــــسان قورەیـــــشی وەکـــــو لەمەوبـــــەر
ترســـــی نـــــەمانی (بـــــت)یـــــان هاتـــــه ســـــەر

(ابولهـــــب)یـــــش هەرچـــــەندە مـــــام بـــــوو
بـــــەڵام لـــــه خـــــەڵکان زیـــــاتر نـــــەفام بـــــوو

شـــــان بـــــه شـــــان هـــــەموو خـــــەڵکی بێگانـــــه
وەســـــتا بـــــوو دژی ئـــــەو نـــــووره جوانـــــه

هـــــەمووی هاتنـــــەوه لـــــه بـــــۆ لای مـــــامی
وتیـــــان :- بـــــرازات زۆر بـــــه بـــــێ تـــــامی

کـــــاری خـــــۆی دەکـــــا و هـــــەر دەیکاتـــــەوە
خـــــەڵکی لـــــه ئێمـــــه دوور دەخاتـــــەوە

دادەبەزێتـــــه ســـــەر خـــــودا و دینمـــــان
تـــــامی نەهێـــــشتووه هـــــەرگیز لـــــه ژینمـــــان

ئێمـــــه (عمـــــار)مـــــان ئـــــەوا هێنـــــاوه
تاڕزگارمـــــان بـــــێ لـــــەم دەرد و داوه

(موحەممـــــەد) بۆمـــــه و بـــــۆ تـــــۆ بـــــێ (عمـــــار)
هەرچـــــی لێـــــی دەکـــــەی هـــــی تۆیـــــه بڕیـــــار

ئێمـــــەش چـــــی بێـــــنین بەســـــەر (موحەممـــــەد)
نـــــابێ دڵـــــی تـــــۆ بڕەنجـــــێ ، نەبـــــەد

ئەگەر بەو مەرجە تۆ نابی ڕازی
لەگەڵ یەك دەكەین شەڕ و گیان بازی

یان با وازبێنێ ، ئەم كارە نەكا
ئەگەر هەر وابێ ناچارمان دەكا

بە شمشێر و تیر بە هەموو شێوە
بۆ یەك هێرش كەین جا ئێمە و ئێوە

ئەگەر چی ئەتۆ یەكێ ڕێزداری
بەڵام گشت شتێ دەكا بێزاری

وامان پێ باشە وازمان لێ بێنێ
ئاینمان چیتر لێ نەشێوێنێ

ئەگەر (موحەممەد) وا بكا باشە
گەرچی دەزانین هەمووی بەلاشە

ئەگەر واز بێنێ ئەوەی دەخوازی
جێبەجێی دەكەین پێی دەبین ڕازی

ئەگەر مەبەستی ئەو دەسەڵاتە
دەیكەینە گەورەی گشت ئەم وڵاتە

گەر حەزیشی لە زێڕ و سامانە
هەمووی دەدەینێ ، هەرچی هەمانە

ژنی دەدەینێ ئەگەر ژن دێنێ
بەڵام بە مەرجێ وازمان لێ بێنێ

کۆمەڵی قورەیش جیا بەهەر حاڵێ
(ابوطالب)یان جێ هێشت لەماڵێ

(ابوطالب)یش لە دوای وان لەو کات
بەدوای (موحەممەد) ناردی ئەویش هات

ئەوسا کە پێی وت :- باش ئاگاداری
خەڵکی ماقوڵ و گشت گەورەی شاری

سێیەمین جارە ، کەبێنە ئێرە
تا دەست هەڵگری ئە تۆ لەو خێرە

پێغەمبەری خواش سەری هەڵبڕی
بە فەرمودەی جوان ، بە جەرگ بڕی

فەرمووی گوێت بگرە لە من ئەی مامە
چونکە هەڵگری بەرنامەی خوامە

گەر ئەوان خۆر و مانگم بۆ بێنن
لە ڕاست و چەپم دایانەزرێنن

هەرگیز هەڵناگرم دەست لەو فەرمانە
چونکە دڵنیام خوا لەگەڵمانە

یاخود تێدەچم و سەردەنێمەوە
یان بە سەرکەوتن دەگەڕێمەوە

لەلای مامیشی هەستا بە ناچار
ئەشکی غەمباری لە چاو هاتەخوار

چـــونکە بـــێ وێنـــە پـــەژارە و داخـــی
چـــوونە خـــوار بـــەناو دەروون و نـــاخی

ئەوســـا مامەکـــەی نـــاهێکی کێـــشا
دڵ و دەروونـــی بـــۆی هـــەژا و ئێـــشا

بـــانگی کـــرد پێـــی وت :- وەرە ئـــەی گیانـــە
گومانـــت نـــەبێ ، باشـــیش بزانـــە

تـــاوەکو دوایـــن دڵۆپـــە خـــوێنم
هـــەر وەکـــو پـــەرژین خـــۆت تێـــوەردێنم

تـــۆ خەفـــەت مـــەخۆ گیانـــە لـــەو بـــارە
بـــەردەوامیش بـــە لـــە ســـەر ئـــەو کـــارە

پێغەمبـــەری خـــواش ئـــا لـــەو کاتـــەوە
خۆشـــی و ئـــارامی لـــە بـــۆی هاتـــەوە

چـــونکە وای زانـــی مـــامی یـــەك جـــاری
کـــە پـــەنای ئـــادا دژ بـــە زۆرداری

بـــەڵام مـــامی ئـــەو چـــۆن دێڵـــێ دڵـــی؟
هـــەڵگرێ پـــەرژین لـــە دەوری گـــوڵی

چـــونکە تـــا ئـــەو کـــات بـــەو پـــەڕی رێـــزی
چـــاودێری دەکـــرد بـــە هـــەموو هێـــزی

جـــا (ابـــوطالـــب)هەســـتا بـــە ژیـــری
بـــەرەی (هـــاشمی) لـــە بـــۆ پـــشتگیری

هـــــەمووی بــــانگ کــــردن نــــەوەك لــــەناكاو
دەس بوەشـــــــێنێ قورەیـــــــشی شــــێواو

(ابــــوطالـــــب)زۆر مـــــەرد و دڵـــــسۆزە
ڕووی كـــردە هــــەموو خـــەڵكی ئـــەو هــــۆزە

وتــــی :- ئـــەی (نـــەوەی هاشـــم) بـــزانن
خـــــەڵكی قورەیـــــشی لــــــە هەوڵـــــدانن

تــــاكو (موحەممــــەد) نـــاوی لــــە شـــوێنێ
هــــــەتا هەتایــــــە نـــــەبێ و نـــــەمێنێ

بـــەرەی (هـــاشمی)ش هــــەموو بەیـــەك دەنـــگ
وتیـــان بـــا پـــەنا بەرینــــە بـــەر جـــەنگ

بــــــەڵام هـــــەوری ڕەش نــــــەما و ڕەویــــــەوە
لــــــە پێـــــشی خـــــۆری پێغەمبەریـــــەوە

وەك جـــــاری جـــاران كەوتـــەوە ســـەر كــــار
بـــــە بانگـــــەوازی بــــۆ خـــوای كردگــــار

كـــــاتێ (قــــورەیش) بیــــستی دەنگوبـــــاس
بــــۆ پێغەمبــــەری لێهـــــاتوی خوانــــاس

بـــــەرەی (هـــــاشمی) كـــــە بۆتـــــە پـــــشتگیر
بـــــە شـــــێوەیێ تــــر كردیانــــــەوە بــــیر

لـــــە پێغەمبـــــەریان كـــــەمێ وازهێنـــــا
بـــــەڵام هەركەســــێ بــــڕوای دەهێنـــــا

زۆر بـــــەبێ تــــامی دەیانــــدا ئــــازار
تــــا لەســـــەر بـــــیر و بـــــڕوای بێتـــــەخوار

لـــــەوكات تـــــا ئـــــەمڕۆ لـــــە هـــــەموو لاوە
ئەوانـــــــەی دڵيـــــــان بۆتـــــــە كـــــــەلاوە

لـــــــە هەوڵـــــــدانن لەهـــــــەموو شـــــــوێنێ
ڕوونـــــــاكی چـــــــرای ئيـــــــسلام نـــــــەمێنێ

بـــــەلام خـــــوای گـــــەورە پاڵپـــــشت و يـــــارە
ئەگـــــەر هەمووشـــــيان هەســـــتن بـــــەو كـــــارە

ڕونـــــــاكی ئيـــــــسلام ناكوژێتـــــــەوە
كـــــافر دڵيـــــشيان لێـــــك ببێتـــــەوە

# کۆچ کردن بۆ (حەبەشە)

پێغەمبەر وەکو بارانی بەهار
سڵاوی خودای بۆ سەر بێتە خوار

هەزاران تاوان ئەدرایە پاڵی
بەدەس کوفرەوە پەشێو بوو حاڵی

بۆیە وای فەرموو بە یارەکانی
گوێم لێ ڕابگرن بە نەرم و جوانی

فەرمووی :- ئەی یاران بکەن بڵاوە
حەوانەوەمان لێرە نەماوە

یاران فەرموویان :- ئێمە مل کەچین
کام لات مەبەست بێ بۆ ئەولا دەچین

ئەوساکە فەرمووی :- ئەی یارەکانم
کارێکی وەها بەباش دەزانم

بە کوشتن لێمان دەکەن هەڕەشە
وا باشە کۆچ کەن بەرەو حەبەشە

کۆچ بکەن بڕۆن بۆ لای (نەجاشی)
ناویم بیستوە گەلێ بە باشی

ئەم کۆچ کردنە یەکەم سەریەتی
پێنج ساڵ بوو لە پاش پێغەمبەریەتی

دەرد و کارێکی زۆر نالەبارە
یارانی سەرومر ببنە ئاوارە

بەڵام کۆچیان کرد لە بیست کەس کەمتر
یەك لە یەکتری سیس و بەغەم تر

(عثمان)ی (مزعون) ئەو بوو یەکێکیان
دەست نیشانکرا بۆ بە سەرۆکیان

بەرەو حەبەشە ئیتر ڕۆیشتن
تا بە قەراغی دەریا گەیشتن

لەوێ بە کەشتی دەربازبوون ئیتر
لەسەریان نەما مەترسی چیتر

گەیشتن بەجێ جا بەبێ نازی
بەڵام (نەجاشی) کردی پێشوازی

بەخێری هێنان زۆر زۆر بەگەرمی
لەگەڵیانی نواند ڕوویەك بە نەرمی

لەلای (نەجاشی) یارانی سەروەر
سێ مانگی تەواو بوونە پەنابەر

چوار ژن و دوانزە پیاو بوون ئەمانە
کە چوو بوونە ناو خەڵکی بێگانە

بەڵام هاتنەوە بۆ (مەککە) وەختێ
وا تێگەیشتن کە کافران نەختێ

نەرم بوون نادەن ئەشکەنجەی یاران
وازیانهێناوە لە کردەی جاران

کاتێ هاتنەوە دیتیان بەئێشتر
ئازاریان دەدرێت لە جاری پێشتر

پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی:- یـــــاران دووبـــــاره
کـــــۆچ بکەنـــــەوه ، دەرچـــــن لـــــەم شـــــاره

ئەوانـــەی ئـــەم جـــار بـــۆ حەبەشـــە چـــوون
هەشـــتا و ســـێ پیـــاو و هـــەژده ئـــافرەت بـــوون

کـــاتێ بەمـــەیان زانـــی (قورەیـــشی)
زۆر موســـڵمان چـــوون بـــۆلای (نەجاشـــی)

بـــەم کـــاره باریـــان زۆر کـــردی لـــەنگی
بەســـەریان داهـــات دەردی دڵتـــەنگی

لـــە داخ ئـــەو خەڵکـــەی چـــوونه (حەبەشـــە)
نایەنیـــان لـــەوێش وا دەکـــا گەشـــە

بۆیـــە لـــەم کـــاژه بیریـــان کـــردەوه
زۆر دیـــاری چـــاکیان زوو کـــۆکردەوه

دانـــرا ئـــیتر دیـــاری بـــە باشـــی
تـــا پێـــی قایـــل کـــەن پاشـــا (نەجاشـــی)

ئەوســـا (عبداللـــە) و (عـــەمری کـــوڕی عـــاص)
هێـــشتا هـــیچ کامیـــان نـــەبوون بـــە خوانـــاس

بـــەلام خـــوای گـــەوره لێیـــان بـــێ ڕازی
گـــەلێ زیـــرەك بـــوون لـــە پـــیلان بـــازی

ئـــەو دوو کەســـانه بـــە خـــۆ و بـــەدیاری
ڕۆیـــشتن تـــاکو حەبەشـــە و شـــاری

چـــوونه نـــاو کۆشـــکی پاشـــا (نەجاشـــی)
دەمیـــان خـــستەکار یـــەکجار بـــە باشـــی

وتیان :- ئەی گەورە ئەی پاشای وڵات
بۆمان هێناوی زۆر دیاری و خەڵات

بەڵام وا هەندێ لە خزم و کەسمان
هاتوون بۆ ئێرە بیدەوە دەسمان

چەند کەسانێکی شێتن ، تۆراون
لەسەر ئاینی خۆیان نەماون

زۆر پێمان وتوون ، بە گوفتاری خۆش
ئاینی خۆتان مەکەن فەرامۆش

ئەی پاشای وڵات ئەوان هەڵاتن
ئەو چەند کەسانەی ئێستا لەلاتن

(نەجاشی) وتی :- بابیان بینم
ناتان دەمەوە ، تانەیان دوێنم

ناردی بەدوایان کاتێك کە هاتن
خواناسی وا بوون ، وەك خۆر هەڵاتن

پاشاش قسەی کرد لەگەڵ ئەوانە
تاکو بزانێ ، چی مەبەستیانە

(جەعفەر)ی مەردیش هەر هەمووی وتن
وتی :- ئەی پاشا کەی خودا بتن ؟

بڕوام پێبکە پێشتر نەزان بووین
سادە و ساویلکە ، بەها هەرزان بووین

گشت کاری خراپ پیشە و [illegible] بوو
ناوی (عوزا) و(لات) لەسەر [illegible] بوو

پێشتر هاوتامان بۆ خوا دانا بوو
گەرچی شتێکی زۆر بێمانا بوو

وەکو خەڵکێکی نەزان و بێ هۆش
بۆ دار و بەردان دەچووینە کڕنۆش

ئێستا وا ئێمە بەهۆی (موحەممەد)
دوور کەوتوینەوە لە گشت کاری بەد

(نەجاشی) وتی :- ئێوە میوانن
لە کتێبی خۆتان ئەگەر بزانن

بۆمان بخوێنن زۆرمان حەز لێیە
باچاك حاڵی بین بکێن ، چیتان پێ یە؟

(جەعفەر)خوێندیەوە سورەی (مەریەم) بۆی
بوو بە گریانی قەشە و پاشا خۆی

لەسەر ئاینی (عیسا)ی سەروەر بوون
بە باسی (مەریەم) زۆر بەختەوەر بوون

ئەوسا(نەجاشی) وتی :- ئەی (عەمر)
ناتان دەمەوە سوێند بەخوای ئەمر

هەروا بەیانیش پیلانیان هەڵبەست
بەڵام (نەجاشی) نەیدانەوە دەست

هەرچەندە زۆر زۆر لێی پاڕانەوە
بە نائومێدی و خەم گەڕانەوە

موسڵمانانیش زۆر بە سەربەستی
ئەنجامیان ئەدا خودا پەرستی

## موسڵمان بوونی (عومەر)ی کوڕی (خطاب)

(عومـــەر)کەســـێك بـــوو مـــەرد و بـــە جـــەرگ
چـــاو نـــەترس بـــوو لـــە ئاســـتی مـــەرگ

پاڵـــەوانێکی مـــەرد و چـــالاك بـــوو
لـــە ئاســـتی هـــەموو خـــەڵکی بـــێ بـــاك بـــوو

دوژمـــن و دژی ئـــایینی حـــەق بـــوو
بەرامبـــەر ئیـــسلام وەك بـــەردی ڕەق بـــوو

ڕۆژێـــك لـــە ڕۆژان (عومـــەر) ئەمـــەی بیـــست
پێغەمبـــەر لەگـــەڵ خـــەڵکی خوداویـــست

کـــە کۆدەبنـــەوە لـــە مـــاڵی (ئەرقـــەم)
خـــوا دەپەرســـتن زۆر زۆر و کـــەم

زۆر ڕقـــی هەســـتا کـــاتێ ئەمـــەی بیـــست
شمـــشێری هـــەڵگرت ، (موحەممـــەد)ی ویـــست

وتـــی :- دەیکـــوژم ، تـــاکو (قوڕەیـــشی)
بـــۆ خۆیـــان بـــژین هـــەر وەکـــو پێـــشی

ئـــیتر بـــە نیـــازی چـــوو بـــۆ کوشـــتنی
پـــەیمانی دەدا بـــۆ خـــوێن ڕشـــتنی

لـــە ڕێگـــا توشـــی (نـــەعیم) بـــوو (عومـــەر)
(نـــەعیم) ترســـێکی وەهـــای نیـــشتە ســـەر

پـــێ ی وت :- ئـــەی (عومـــەر) چـــیت لێ قـــەوماوە
بۆچـــی شمـــشێرت وا ڕاکێـــشاوە؟

(نـــــەعیم) بـــــێ ئـــــەوەی بزانـــــرێ باســــی
خـــــۆی گەیانـــــدبووە ڕیـــــزی خواناســـــی

جـــا(عومـــــەر) وتـــی :- بـــە ئـــەم شمــشێرە
(موحەمـــــــــەد)دەكـــــــوژم ، ئاژاوەگـــــــێڕە

كـــــارێكی وەهـــــای بەســـــەر هێنـــــاوین
بـــــەهۆی ئـــــەوەوە پـــــەرش و بڵاویـــــن

(نـــەعیم)یـــش پێـــی وت :- وازبێنـــە (عومـــەر)
ئـــــەم كـــــارە مەكـــــە لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەر

جـــا هیـــوام وایـــە نەكـــەی ئـــەم كـــارە
كەســـی تـــر هەیـــە گـــەر بیكـــەی چـــارە

(عومـــەر) بەتونـــدی وتـــی :- كـــوا ، كـــێ یـــە؟
ئـــەو قـــسەی دەیكـــەی زۆر نـــا بـــەجێ یـــە

پـــێ ی وت :- ئـــەی (عومـــەر) خوشـــكت و زاوات
ئیـــــسلامەتیان بـــــۆ بۆتـــــە ئـــــاوات

تـــوڕە بـــوو (عومـــەر) لـــەوكات و ســـاتە
پێـــی وا بـــوو ئەمـــە ڕێـــك مەرگەســـاتە

(فاطمـــە)و(ســـەعید) لایـــان بـــوو (خـــەباب)
دڵیـــان بـــرژا بـــوو ، بـــۆ خـــوا ، وەك كـــەباب

ئەوســـا (عومـــەر)یـــش چـــۆماڵیـــان لـــەوكات
هـــەر بـــەبێ ئـــەوەی لـــە دەرگـــا بـــدات

زانیـــــان هاتـــــە ژوور (عومـــــەری خطـــــاب)
خـــۆی لـــە حەشـــاردا لـــە ترســـان (خـــەبباب)

لەوكاتـــــە ئـــــەوان دەمیـــــان خوێنـــــد قورئـــــان
كـــە هـــات ، هـــەڵیان گـــرت گـــەڵێ لێـــی ترســـان

چـــووە ژوور وتـــی :- چـــی یـــە ئـــەم دەنگـــە؟
كـــاتێ ئـــەوانیش بینیـــان بـــەم ڕەنگـــە

پێیـــان وت :- (عومـــەر) هێـــواش بـــە ، خێـــرە؟
ئـــەو دەنگـــەی دەڵێـــی نـــەهاتووە لێـــرە

بـــەڵام (ســـەعید)ی زاوای لـــەو دەمـــە
پێـــی وت :- پێـــت چـــۆنە گـــەر ڕاســـت بـــێ ئەمـــە؟

(عومـــەر ) لـــەوكاتی تونـــدی دەنـــوێنێ
هەنـــدێ ئـــازاری پێدەگـــەیێنێ

(فاطمـــە)زۆری لێ كـــرد بـــەرگری
لـــە ئـــایینی خـــوا و هـــەم لـــە هاوســـەری

(عومـــەر)یـــش مـــستێك بـــە هـــەموو هێـــزی
دای بـــەناو دەمـــی خوشـــكی بـــەڕێزی

(فاطمـــە)ی خوشـــكی ئـــیتر بـــە جـــارێ
خـــوێن و فرمێـــسكی ڕژان بـــۆ خـــوارێ

خـــۆی پـــێ نـــەگیرا وتـــی :- ئـــەی (عومـــەر)
بەڕاســـت دەزانـــین خـــودا و پێغەمبـــەر

موسـڵمان بووینـە ، چـی دەکـەی بیکـە
بـا دڵـت بێـشێ سـەد هەنـدی دیکـە
کـاتێ هاتـە ژوور گـەڵ گـەرم بـوو
بـەڵام سـات بەسـات دڵـی نـەرم بـوو

(فاطیمـە)ش خـوێنی ڕژا بـۆ زاری
دەهاتـە بـەر چـاو زۆر بـە هـەژاری

مـەرد بـوو ئەگـەر چـی خـودا نـەناس بـوو
وتـی :- پـێم بڵـێن ئەمـە چ بـاس بـوو؟

بیدەنـە دەسـتم ، زۆرم مـەدوێنن
ئـەوەی دەتـان خوێنـد ئـەوەم بـۆ بێـنن

ئـاخۆ (موحەمـمـەد)چـی بـۆ هێنـاون
سـەیرە هێنـدە زوو ئێـوە گـۆڕاون

(فاطمـە)ش وتـی :- بـە ئـەم دڵـسۆزە
کـەلامی خوایـە ، گـەڵ پـیرۆزە

خـۆت بـشۆ ئـەوکات دەیدەمـە دەسـتت
ئێـستا کـە پیـسە بـڕوا و مەبەسـتت

ئـەویش دەسـت بـەجێ بـۆ خـۆ شوشـتن چـوو
کـاتێ هاتـەوە (عومـەر)ێ تـر بـوو

سـورەی (طـە)بـوو ، دایانـە دەسـتی
کـاتێ خوێندیـەوە نـەرم بـوو هەسـتی

فـەرمووی :- وتـەی زۆر جـوان و بـەپێزن
گـەڵ پـیرۆزن ، زۆر جێگـای ڕێـزن

لــــە حەشــــارگەکەی لــــەو کاتــــە گەرمــــە
(خــــەباب) گــوێ ی لێ بــــوو کــە (عومــــەر) نەرمــە

هاتــــەدەر وتــــی :- ســـــوپاس خودایــــە
چــــۆنمان پـــێ خۆشــــە (عومــــەر)ئــــەو هایــە

ڕووی کـــردە (عومــــەر)پـــێ ی وت :- ئــەی گیانــە
ســــەروەر داوای کــــرد لــــەو میهرەبانــــە

مــن گــوێ بیــستی بــووم کــەمێ لــە مەوبــەر
کــەوا نــــزای کــــرد ســــەرداری ســــەروەر

فــەرمووی ئــەی خوایــە ئیــسلام بــەرێز کــەی
بــە(عومــــەر)ێکیــان بــە توانــا و هێزکــەی

بــە کــوڕی (هیــشام)یــان کــوڕی (خطــاب)
هــــەزاران ســــڵاو لــــە گــــۆڕی (خــــەباب)

بەویــــستی خــــودای پــــەروەردگاری
لــــە کــوفر دەرچــــوو (عومــــەر) یــــەکجاری

جــا پرســــیاری کــــرد ئــــەو شــــێرە نوێیــــە
وتــی :- (موحەممــــەد)ئێــستا لــە کــوێ یــە؟

باشــە پــێم بڵــێن ، تــا بــــۆ لای بــــچم
هــــەرگیز مەترســــن ، مــــن بــــۆی مــــل کەچــم

جــێ و ناونیــشانیان ڕاســت دا بــە (عومــــەر)
لــە مــاڵ (ئەرقــــەم)ــــە ســــەرداری ســــەروەر

ئـــيتر (عومـــــەر)يـــش ڕووى كـــردە ئـــەوێ
هـــــەتا دەروونـــــى تـــــەواو بـــــسرەوێ

پێغەمبـــــەرى خـــواش لـــــە ژوورێ دابــــوو
بـــۆ قورئـــان خوێنـــدن يـــارانى لا بـــوو

يـــەكێكيان هەســـتا لـــە كـــۆڕى دينـــى
لـــە درزى دەرگـــا (عومـــەر)ى بينـــى

هاتـــەوە وتـــى :- ئـــەى پێغەمبـــەرمان
كـــوڕى (خطـــاب)ـــە هاتۆتـــە سـەرمان

ئـــيتر دەرگاكـــەى بـــۆ كرايـــەوە
خێـــرا پێغەمبـــەر چـــوو بەلايـــەوە

لـــەو كاتـــە يەخـــەى لێـــى گـــرت پێغەمبـــەر
تووندى ڕاتەكاند فـــەرمووى :- ئـــەى(عومـــەر)

بـــۆ واز نـــاهێنى كـــوڕى (خطـــاب)ى
هەتاكـــەى هـــەر واى ، موســـڵمان نـــابى ؟

فـــەرمووى :- تـــۆ بۆچـــى هاتويتـــە ئێـــرە؟
چ كـــارت هـــەبوو ئـــەى (عومـــەر)، خێـــرە؟

لـــە بڕواهێنـــان (عومـــەر) زۆر دوور بـــوو
لەســـەر بـــێ دينـــى و دڵ ڕەقـــى ســوور بـــوو

وتـــى:- مـــن هـــاتووم تـــا بـــاوەڕبێنم
تـــەمامى بـــاوەڕ لـــە دڵ بـــڕوێنم

گـــەلێ دڵ خـــۆش بـــوو بەمـــە پێغەمبـــەر
پـــڕ بـــە دەنـــگ فـــەرمووی (الله اكـــبر)

یـــاران ســـەندیان بـــە دەنگـــی بـــەرز
تـــەكبیر بـــە تونـــدی ، (بـــت) گرتـــی لـــەرز

(عومـــەری خطـــاب)ڕووی كـــردە ســـەروەر
وتـــی :- ئـــەی گـــەورە و ســـەرداری بەشـــەر

چـــۆن دەبـــێ و دەكـــرێ خـــودا پەرســـتی
لـــە ترســـی كـــافران بـــە دزی و بـــە ســـستی؟

واباشـــە هەســـتین بـــە دڵ گوشـــادی
بـــۆ خـــوا ئـــەنجام دەیـــن نوێـــژ بـــە ئـــازادی

ئـــیتر بەویـــستی خـــوای بـــە دەســـەلات
ڕۆژێكـــی تـــازە و گەشـــیان لێ هـــەڵات

پاڵـــەوانێك بـــوو (عومـــەر)بـــێ وێنـــە
بـــۆ مـــەیینی حـــەق ئێـــستاش هەوێنـــە

باسـی (عـومـەر) و كـرداری جـوانـی
كـەس بـۆی بـاس نـاكـرێ وا بـە ئـاسـانـی

# گەمارۆی ئابووری

دوژمنانی خوا هەتا هەتایە
دڵ و دەروونیان جێگای پەتایە

لە دێرین زەمان تاکو ئەم کاتە
وەستاون دژی خوا و ئەو خەباتە

دڵنیام تاکو دنیاش دەمێنێ
کیسەڵ پێی ناگرێ کێو بڕوخێنێ

(قورەیشی) هەستان وەکو لەمەوبەر
تا دەسەڵاتی خودا و پێغەمبەر

کپ و کز بکەن ئەگەر بتوانن
چونکە سەرمەستان ڕاستی نازانن

فەرمانیان دەرکرد تاکو بە ئاسان
لە ڕەگ دەربێنن هەموو خواناسان

ڕێکەوتنیشیان وابوو ، کە نابێ
کەسێ شوێن کەوتووی نامەی خودا بێ

ژنی بدەنێ و یاخود لێی بێنن
وە نابێ هەرگیز بیشی دوێنن

وا بوو بەڵێنی لە خوا نەترسان
گەر موسڵمانان بمرن لە برسان

شتیان نەفرۆشنێ و شتیان لێ نەکڕن
دەبێ نێوانیان تەواو بپچڕن

جا دوژمنانی دەستەی خواناسی
پەیمانیان مۆرکرد ، هەڵیشیان واسی

ئیتر هیچ شتێ نە چوو بۆ ناویان
چونکە ڕاستی بوو دەستوور و باویان

بێ گومان کەسێ شەیدای خودابێ
پاشگەز بوونەوەی هەرگیز بۆ نابێ

بەڵام نەفام بوون وایان دەزانی
لە حەق لادەدەن بە هۆی بێنانی

سەرەڕای ئەوەش خەڵکی ستەمکار
موسڵمانانیان هەردەدا ئازار

هەرچی شوێن کەوتوی خوا و پێغەمبەر بوو
زام و ئازاریان بێ چارە سەر بوو

بەرەی (هاشمی) و بەرەی پێغەمبەر
ئازار و ئێشیان زۆر زۆر هاتە سەر

بەهۆی نەبوونی و کەم بوونی خۆراك
دەژیان ، ژیانێکی ناخۆش و خەمناك

ئەو هەردوو بەرەش هەرچەندە تەواو
دانیان نە نابوو بە ڕێبازی شیاو

هەموو باوەڕدار نەبوون بەم دینە
بە سەر وانیش هات لافاوی کینە

ئەو نابلۆقەیەش زۆری ڕاکێشا
یاران لە برسا زگیان دەئێشا

نەیانــــــدەتوانی کەســــــێکیان بــــــەڵکی
کــــە بـــڕۆن بـــۆ نـــاو ئـــاوایی و خـــەڵکی

دەچـــوونە شـــوێنێك دووربـــا لـــە شـــاری
بـــــەمجۆرە دەژیـــــان ، زۆر بەناچـــــاری

پێغەمبـــەری خـــواش لـــە کـــاتی حـــەجێ
ئـــەنجامی دەدا ئـــەم کـــارە لـــە جـــێ

هـــەموو حاجیـــانی تێدەگەیانـــدن تـــێ دەگەیانـــدن
هـــــەواڵی ڕاســـــتی پـــــێ دەگەیانـــــدن

جـــاری واش هـــەبوو کەناچـــار دەبـــوون
بـــۆ پێداویـــستی بـــۆ نـــاو شـــار دەچـــوون

(ابولهـــــب)ی یـــــاخی و ســـــتەمکار
لـــەو کاتـــە ئـــەویش دەهـــات بـــۆ بـــازاڕ

پـــڕ بـــەدەنگ دەیـــوت بـــە خـــەڵکی (مەککـــە)
زۆر تێکـــەڵ مـــەبن لەگـــەڵ ئـــەو خەڵکـــە

چـــونکە ئەوانـــــە شـــێواو و بـــەدن
لەســـەر ئـــایین و ڕێـــی (موحەممـــەد)ن

لـــــە ئاینیـــــشمان کـــــەمێ ناپۆشـــــن
شـــتیان بەهـــەرزان قـــەت پـــێ مەفرۆشـــن

لەســـەر هـــەموو شـــت زۆر بکـــەن پـــارە
تـــاوەکو نـــەکرن ، نـــەیانبێ چـــارە

ئـــەوە بـــوو کـــاری بێـــشەرمی ســـەرقاڵ
وای دەکـــرد خـــەڵکان بـــە دەســـتی بـــەتاڵ

بگەڕێنـــــەوە بـــــە زگـــــی برســــی
کەســـێکیش نـــەبوو ، لێیـــان بپرســـی

کـــەوڵی وشـــکبووی حـــەیوانیان دەخـــوارد
بـــەو دەردەســـەریە وا ڕایـــان دەبـــوارد

زۆری نـــەما بـــوو ، بمـــرن لـــە برســـان
نەشـــیان دەوێـــرا کەســـێ لـــە ترســـان

لـــە بۆیـــان ببـــەن خـــواردن و خـــۆراك
لەبـــەر دوژمنـــــی زۆردار و ناپـــاك

(هوشـــام)ی کـــوڕی (عومـــەر)، کـــاتی شـــەو
وشـــتری دێنـــان کـــاتی گەرمـــەی خـــەو

بـــاری دەکـــردن لـــە هـــەموو خـــواردن
بـــۆ خواناســـانی بـــە دزی دەنـــاردن

ســـێ ســـاڵ تـــەواو بـــوو بەســـەر ئـــەم دەردە
بەســـەر ئابلۆقـــەی دڵڕەقـــی و جـــەردە

لـــەوکات ، خوداوەنـــد بـــەڕێی نهێنـــی
پێغەمبـــەری خـــۆی تێدەگـــەیێنی

پـــەیمان و مـــۆری ســـێ ســـاڵ لـــە مەوبـــەر
کـــەوا نوســـراوە دژ بـــە تـــۆی ڕابـــەر

بـــە جـــوان و چـــاکی هەڵواســـێنراوە
شـــتێکی چـــاکی تێـــدا نـــەماوە

مۆرانـــــە هـــــەمووی خـــــواردووە تـــــەواو
هـــەر نـــاوی خـــودای تیـــا دیـــارە بـــە چـــاو

پێغەمبـــەری خـــواش خۆشـــحاڵ بـــوو لـــەوکات
بـــۆ (ابـــوطالـــب) ئـــەو باســـە دەکـــات

پێـــی وت:- گوێـــت بگـــرە لـــە مـــن ئـــەی مامـــە
چـــونکە مـــن بەنـــدە و نوێنـــەری خوامـــە

خـــــواش ئاگـــــادارە لـــــە هـــــەموو لاوە
نوســـــراوی (قـــورەیش) هیـــچی نـــەماوە

(ابـــوطالـــب)یـــش پێیـــوت :- ئـــەی لاوە
هەرچـــی بفـــەرمووی هـــەمووی تـــەواوە

ئـــەو زانیاریانـــە کـــێ تێـــی گەیانـــدی؟
ئایـــا خـــودای تـــۆ پێـــی ڕاگەیانـــدی؟

ســـەروەریش فـــەرمووی :- بـــەڵێ مامـــەی چـــاک
ئـــەوەم زانیـــوە لـــە خواوەنـــدی تـــاک

(ابـــوطالـــب)یـــش لەگـــەڵ چـــەند خـــەڵک
کەوتـــە ڕێ بـــۆ نـــاو خـــەڵکی بـــێ کـــەڵک

چـــۆ ناویـــان هـــەمووی کـــردن ســـەرکۆنە
پاشـــان پـــێ ی وتـــن :- نوســـراوتان چـــۆنە

(موحەممـــەد)دەڵـــێ ئـــەو نوســـراوەی کـــە
هەڵتانواســـیوە لـــە شـــاری (مەککـــە)

بـــــه دهم مۆرانـــــــه هـــــــەمووی خـــــــوراوه
هـــــەر نـــــاوی خـــــودا بـــــه چـــــاکی مـــــاوه

جـــا ئەگـــــەر قـــــسەی (موحەممـــــەد) وابـــــێ
دەبـــــێ نوێنـــــەر و خۆشـــــەوی خـــــوا بـــــێ

ئەگـــــەر واش نـــــەبوو چـــــی مەبەســـــتانه
لەگـــــەڵیا بکـــــەن لەبـــــەر دەســـــتانه

ئـــــەوجا ڕێـــــك کـــــەوتن لەســـــەر ئـــــەو ڕایـــــه
نوســـــــراویان هێنـــــــا بـــــــزانن وایـــــــه

جـــا کـــــه هێنایـــــان بینیـــــان کـــــه وا بـــــوو
هـــــەر نـــــاوی خـــــودا بـــــه جـــــوانی مـــــابوو

پاشـــــگەزبوونەوه ئـــــەو جـــــا (قورەیـــــشی)
وتیـــــان :- جـــــادوه ، هـــــەر وەکـــــو پێـــــشی

بـــــەڵام ســـــەد حاشـــــا لـــــەو گوڵـــــه گەشـــــه
چـــــونکه دوژمنـــــان هـــــەناویان ڕەشـــــه

بـــــا بێینـــــەوه سەرباســـــی نـــــەداری
خـــــەڵکی خـــــودا نـــــاس لـــــه دەســـــت زۆر داری

بـــــه هـــــۆی نـــــەبوونی زۆر پەرێـــــشان بـــــوون
توشـــــی دەردێکـــــی پـــــڕ ســـــەر ئێـــــشان بـــــوون

ئینجـــــا (هوشـــــام)ی کـــــوڕی (عومـــــەر) زوو
بـــــۆلای (زوهـــــەیر) بـــــەخێرای چـــــوو

پێـــی وت :- ئــەی (زوهـــەیر) گیانەکـــەم بۆچـــی
ســـۆز و بـــەزەیت نـــا جـــوڵێ ، تـــۆ چـــی؟

پورزایەکـــــەی تـــــۆ هێنـــــدەی نـــــەماوە
لـــــە برســـــان بمـــــرێ بـــــچێ بـــــەم داوە

پورزایەکـــــــەی ئـــــــەو پێغەمبەرمانـــــــە
روونـــــاکی چـــــاو و تـــــاجی ســـــەرمانە

لەگـــەڵ ئـــەو خەڵکـــە بۆچـــی هێنـــد رەقـــین؟
کـــێ دەڵـــێ ئێمـــە راســـت تـــر و حـــەقین؟

ئەوانـــــە هـــــەمووی خـــــزم و کـــــەسمانن
مرۆڤـــــی چـــــاکن ، ئاکـــــار جـــــوانن

(زوهـــەیر)یـــش وتـــی :- ئـــەی (هوشـــام) ، جوانـــە
ئێمـــــە زۆرداریـــــن لـــــە ئاســـــت ئەمانـــــە

ئـــــەوجا هەوڵیـــــدا پێـــــنج کەســـــی تـــــەواو
دەســـــــــەڵاتدار و مـــــــــاقوڵ و بەرچـــــــــاو

کـــــردی بـــــە پـــــشتگیر ، لەبـــــەر ئەگـــــەری
بێـــــدەنگ نـــــەبوونی کەســـــی سەرســـــەری

ئـــــا ئـــــەو پەیمانـــــــە هەڵوەشـــــێننەوە
ئابڵۆقـــــە بـــــەس بـــــێ و هـــــەمووان بێنـــــەوە

جـــا(هوشـــام)هەســـتا لەگـــەڵ (زوهـــەیر)ی
ســـێ یـــەم کەســـیش بـــوو (ابـــو الـــبختري)

چــوارەميان (زەمعــه)ی كــوڕی (ئەســوەد)ی
پێنجــەم (مــوتعيم)ی كوڕەكــەی (عــەدی)

ئــەو پێــنج كەســانە بەيــەك هێــز و دەســت
ڕاوەســتان دژی (ئەبوجــەهل)ی مەســت

چــونكە ئــەو لەســەر ئابلۆقــە ســوور بــوو
دژ بــە خواناســان ڕقــی ئەســتوور بــوو

جــا ئــەو پێنجانــە پــەيمانيان شــكاند
نووسراوەكەشــيان بــە وردی دڕانــد

ئــيتر ئابلۆقــە كۆتــايی پــێ هــات
بەويســتی خــودای خــاوەن دەســەڵات

ئينجــا خواناســان وەك جــاری جــاران
گەڕانــەوە نــاو بــازاڕ و شــاران

# مردنی (خەدیجە) و (أبوطالب)

لـــــەدوای ئابلۆقــــــەی ڕەشــــــی ئـــــــابووری
کفنیــــــان لـــــە بـــــۆ ئـــــەو دوانـــــە دووری

(ابـــــــوطالــــــب)ی مـــــــامی پێغەمبـــــــەر
لەگـــــەڵ (خەدیجــــــە)ی پـــــاك و بەختـــــەوەر

دەڵـــــێن چـــــەند ڕۆژێــــك کەوتـــــە نێـــــوانی
مردنــــــی مــــــامی و (خەدیجـــــە خـــــان)ی

چـــــەند مانگێــــك لـــــە دوای ئابلۆقـــــە ، مـــــردن
بـــــەرەو گـــــۆڕی تــــار هـــــەردووکیان بـــــردن

ئەوســـــا پێغەمبـــــەر ئـــــەو ناکـــــار جوانـــــە
گــــەلێ خــــەمبار بــــوو بـــــەهۆی ئـــــەو دوانـــــە

چــــونکە (خەدیجــــــە) ســــــەرمایەدار بــــــوو
بـــــەهۆی ســـــامانی جێدەســـــتی دیـــــار بـــــوو

بـــــەهۆی نـــــــەمانی زاتـــــــی بـــــــەڕێزی
ســــــەروەر چـــــووە ژێـــــر بـــــاری بێهێـــــزی

چـــونکە هاوســــــەر بـــــوو ، هــــــەروەها پـــــشتگیر
ڕەزامەنــــــدی خـــــوا لـــــە وی پـــــاك و ژیـــــر

تەمـــــەنی پــــاکی شەســـــت و پێـــــنج ســـــاڵ بـــــوو
ڕۆژگـــــاری ســـــەروەر نــــــاخۆش و تـــــاڵ بـــــوو

هـــــەروەها (ابـــــوطالـــــب)ی مـــــامی
هـــەر ســـوور بـــوو لـــە ســـەر بـــڕوای نـــەفامی

نزیـــــك بیـــــووەوە كـــــاتی مردنـــــی
پێغەمبـــــەریش بـــــۆ بـــــڕوا بردنـــــی

لـــە لای ســـەریەوە پێـــی وت:- ئـــەی مامـــە
مـــن نێـــردراو و بەنـــدەی خودامـــە

خواوەنـــدی گـــەورە زاتێكـــی پاكـــە
شـــایەتمان بێنـــە كـــە تـــەنیا و تاكـــە

گـــەر ئـــەم وشـــەیە بێـــت بەســـەر زارت
لـــە ڕۆژی دوایـــی ئاســـانە چـــارت

(ابـــوطالـــب)یـــش وتـــی :- بـــەو خوایـــە
گومـــانم نیـــە قـــسەی تـــۆ وایـــە

گیـــانی شـــیرینم هاتۆتـــە گـــەردن
خـــەڵكیش پـــێم دەڵـــێن لـــە ترســـی مـــردن

لەســـەر ئـــاینی خـــۆی هاتـــە خـــوارێ
لۆمـــەی خەڵكیـــشم بەســـەر دەبـــارێ

گـــەر لەبـــەر ئـــەوە نـــەبێ ئـــەی گیانـــە
دانـــدەنێم بـــە ئـــەو گوفتـــارە جوانـــە

دووچـــاوەكانی لێكنـــان ، ئـــیتر مـــرد
كـــەمترین ســـزای لەگـــەڵ خۆیـــدا بـــرد

دوو پـــشكۆی ئـــاگر دەخرێتـــە بـــن پێـــی
هـــەتا هەتایـــە ڕزگـــار نـــابێ لێـــی

خــــوا لەبــــەر رێـــــز و خـــــاتری خۆشــــەوی
ئــــەو ســــزا کەمــــەی داوە بـــــە ئـــــەوی !

هـــــەر ئـــــازار دەخـــــوا هـــــەتا هەتایـــــە
چـــــونکە بـــــەزاری گـــــەر هاتبوایـــــە

یەکلابوونـــــەوە و یـــــەکتا پەرســـــتی
رزگـــــاری دەبـــــوو لـــــە زان و پەســـــتی

لـــــەدوای نـــــەمانی مـــــامی پـــــشگیری
هەرچـــی دوژمـــن بـــوو بـــە هـــەموو زیـــری

وەســـــتان دژی وی و گـــــشت یارەکـــــانی
بـــــە هـــــەموو شـــــێوە بـــــۆ ئـــــازاردانی

داخ لـــــە دڵانـــــە جـــــا دەســـــت بـــــەکار بـــــوون
بـــــێ بەزەییانـــــە وەك گـــــورگی هـــــاربوون

موســـــڵمانانیش کـــــات لـــــەدوای کـــــاتی
هـــــەر زۆر تـــــر دەبـــــوون لـــــە نـــــاو وڵاتـــــی

چـــــونکە هـــــەر شـــــتێ نەگـــــەر بـــــۆ خوایـــــە
بـــــە بـــــەر دەوامـــــی لـــــە گەشـــــە دایـــــە

شـــــتێکیش بـــــۆ خـــــوا نـــــەبێ بـــــەو شـــــێوە
زوو لـــــە نـــــاو دەچـــــێ ، نـــــاڕوا بـــــەرێـــــوە

# چوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (طائف)

پێغەمبەری خوا زۆر بە دڵسۆزی
خەباتی دەکرد بۆ ڕێی پیرۆزی

لە دەست کافری پیس و شەرمەزار
زۆری بینیبوو لێدان و ئازار

نزیکەی (دە) ساڵ لە شاری (مەککە)
بانگ هێشتی دەکرد بۆ خوا، ئەو خەڵکە

بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ ستەمکارەکان
ئازاریان ئەدا خۆی و یارەکان

وای ویست لە (مەککە) ئیتر نەمێنێ
بچێ لە (طائف) ڕاستی بڕوێنێ

ئەوسا سەروەر و (زەید)ی کۆڵنەدەر
هەستان بۆ ( طائف) ڕێیان گرتەبەر

ڕێگایان بڕی هەردووکیان بە پێ
بە پەنهان دەچوون تا گەیشتنە جێ

لەو دەمە ( طائف) لێی بوون سێ سەرۆک
تا بڵێی نامەرد ، پیس و چاوچنۆک

ئینجا پێغەمبەر بە شێوەکی چاک
دەستی کرد بە قسە و باسی خودای تاک

تاوەکو خەڵکی نەزان و بێ هۆش
چیتر بۆ (بت)ان نەکەونە کڕنۆش

بــــەڵام داخەکــــەم ئــــەو هەرســــێ ســــەرۆك
گوێیــــان پــــێ نــــەدا و لێیــــان گــــرت بــــەرۆك

پێغەمبــــەر فــــەرمووی :- گــــەر بــــەگوێم ناکــــەن
ئــــازارم مــــەدەن ، گــــەر ئــــەهلی چــــاکەن

بــــەڵام خوانــــەناس هــــەردەم نامــــەردن
منــــداڵی گــــرد و وردیــــان کــــۆکردن

گــــشت منداڵــــەکان بــــە بــــەرد و داری
بەربوونــــە گیــــانی ســــەروەر و یــــاری

بــــەرد بارانیــــان کــــرد بــــە تێکــــەڵاوی
تــــاوەکو خــــوێنی هاتــــە پــــێڵاوی

ئــــەو پێغەمبــــەرەی هێنــــد بــــە ســــەبر و ڕێــــز
لــــە بــــەر ئــــازاری زۆر ببــــوو بــــێ هێــــز

بەدەســــــــــتی دەســــــــــتەی ڕەش و زۆرداران
وەك بــــاران بــــەردیان بەســــەر دابــــاران

بــــەڵام نەبــــەرد بــــوون بــــەخۆی و یــــاری
کــــەمێکی مــــابوو دەرچــــن لــــە شــــاری

جــــا (عوتبــــە)و(شــــەیبە) بــــرا بــــوون لــــەوان
خــــاوەن ڕەزێکــــی گــــەورە بــــوون ئــــەوان

ســــەروەر و یــــاری گــــەلێك بــــوون ناچــــار
خۆیــــان هەڵدایــــە نــــاو ڕەزی پــــڕدار

دەرچـــــوون لـــــە دەســـــتی ناکەســـــانەوە
چـــــوونە بـــــن دارێـــــك بـــــۆ حەســـــانەوە

خاوەنـــــانی بـــــاخ بۆیـــــان دەڕوانـــــی
کـــــاتێ پێغەمبـــــەر بـــــە نـــــەرم و جـــــوانی

ســـــەری هـــــەڵبڕی ڕووی کـــــردە ئاسمـــــان
بـــــۆ پاڕانـــــەوە لـــــە خـــــوای میهرەبـــــان

خـــــاوەن ڕەزەکـــــان نـــــەرم بـــــوون لـــــەو کـــــات
هەرچـــــەند کـــــافربوون ، بـــــەزەییان پێهـــــات

خـــــاوەن ڕەزەکـــــان دووبـــــرای خوانـــــەناس
بەنـــــدەکیان هـــــەبوو بـــــەناوی (عـــــەداس)

(عـــــەداس)ی بەنـــــدە نـــــەرم و بـــــەدڵ بـــــوو
لـــــە مەســـــیحانی خـــــەڵکی (موصـــــڵ) بـــــوو

دووبراکـــــە وتیـــــان :- ئـــــەی (عـــــەداس) هەســـــتە
ترێـــــی جـــــوان ببـــــە بـــــۆ ئـــــەو دوو کەســـــە

(عـــــەداس)یـــــش بـــــۆی بـــــرد کـــــام تـــــرێ چـــــاکە
داینـــــا بەردەســـــتی ئـــــەو هـــــەردوو پاکـــــە

بـــــەڵام پێغەمبـــــەر کـــــە دەســـــتی بـــــۆ بـــــرد
وەك هـــــەموو جـــــارێ(بـــــسم اللـــــە)ی لێ کـــــرد

(عـــــەداس) سەرســـــام بـــــوو بـــــە ئـــــەو گوفتـــــارە
چـــــونکە قـــــسەی وا نـــــەبوو لـــــەم شـــــارە

هەر بۆیە دەڵێ بە ئەو دلێرە
ماوەیێ زۆرە دەژیم ئەلێرە

هەرگیزاو هەرگیز لەم شار و ناوە
ناوی وا سەیر کەس نەیهێناوە

پێغەمبەری خواش فەرمووی لەو کاتی
بۆچی تۆ خەڵکی کامە وڵاتی؟

(عەداس) بەنەرمی بۆی هاتە وەڵام
وتی :- من خەڵکی شاری (نەینەوا)م

بە وتەی (عەداس) جا ئەم نازدارە
لەسەری لاچوو هەندێ پەژارە

فەرمووی تۆ خەڵکی شاری (یونس)ی
(عەداس)یش پێ ی وت :- چۆنی دەناسی ؟

پێغەمبەر فەرمووی :- هەردووکمان براین
چونکە هەردووکمان پێغەمبەری خواین

ئینجا کە (عەداس) نەیما گومانی
بوو بە موسڵمان بەڕاستی زانی

هەستایە سەرپێ زوو بەدەست و برد
بەڕاستی زانی و دەست و پێی ماچ کرد

هەزاران ڕەحمەت لە بۆ (عەداس)ی
زۆر بە ئاسانی خواوەندی ناسی

ئـــــەو دوو برايـــــەی لايـــــان بـــــوو (عـــــەداس)
كـــــاتێ زانيـــــان ، كـــــە بۆتـــــە خوانـــــاس

يـــــەكێكيان (عوتبـــــە) ئـــــەويتر (شـــــەيبە)
وتيـــــان :- ئـــــەی (عـــــەداس)شـــــورەيی و عەيبـــــە

ئـــــەمان دەزانـــــی هێنـــــدە بـــــێ هۆشـــــی
بـــــەدوو قـــــسەی خـــــۆش زوو خـــــۆت دەفرۆشـــــی

(عـــــەداس)ی بەنـــــدە زۆر بـــــەبێ بـــــاكی
هاتـــــە نـــــاو نـــــوری پـــــڕ لـــــە ڕوونـــــاكی

پێغەمبـــــەری خـــــواش وەهـــــای ويـــــست ، ئـــــيتر
نەمێنێتـــــەوە لـــــە ( طـــــائف) چـــــيتر

جـــــا لەگـــــەڵ (زەيـــــد) بـــــە هێـــــدی هێـــــدی
( طـــــائف)يـــــان جێهێـــــشت بـــــە نائومێـــــدی

پێغەمبـــــەری خـــــوا تـــــاجی ســـــەرمانی
خـــــاوەن چـــــاكترين وانـــــە و فـــــەرمانی

لـــــە چـــــاومان نـــــايێ تاكـــــە فرمێـــــسك
دڵمـــــان ڕەقـــــترە لـــــە بـــــەرد و ئێـــــسك

جـــــا(زەيـــــدی حـــــارث) لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەر
بـــــۆ شـــــاری (مەككـــــە)ڕێيـــــان گرتـــــە بـــــەر

خـــــوا فريـــــشتەی نـــــارد هـــــەر بەويـــــستی خـــــۆی
لـــــەبۆ يارمـــــەتی خۆشەويـــــستی خـــــۆی

کـــاتێ فریـــشته چـــوو لای پێغەمبـــەر
سـلاوی کـــرد لـــه ســـەرداری ســـەروەر

فـــەرمووی :- بزانـــه نوێنـــەری خوامـــه
بـــۆ تـــۆی ڕاستیویـــست لەخزمـــەت دامـــه

لـــه ئاسمانـــەوه کـــه نێـــردراوم
بـــۆ پێویـــستی تـــۆ ڕەوانـــه کـــراوم

تـــا ئـــەو کێوانـــه هـــەموویان لێکـــدەم
( طـائف) کـاول کـەم ، هـەر هـەمووی تێکـدەم

گـــەر تـــۆ بفـــەرمووی دەکـــەم ئـــەم کـــاره
زۆریـــان ئـــازاردای خـــەڵکی ئـــەم شـــاره

پێغەمبـــەری خـــواش چـــونکه ڕەحمـــەت بـــوو
ڕازی بـــوون بەمـــه زۆر لای زەحمـــەت بـــوو

ئـەو جـا پێـی فـەرموو :- مەکـه ، بوەسـتێ
بـــەڵکو ئـــەوەیان خـــوا بپەرســـتێ

چـــونکه نـــازانن ، بۆیـــه دڵـــڕەقن
دوژمنـــی ڕاســـتی و ئـــاینی حـــەقن

گەیـــشته شـــوێنێك (نخلـــه) بـــوو نـــاوی
پێغەمبـــەری خـــوا و یـــاری دامـــاوی

وەســـتانیان لـــەوێ زۆری نـــەخایان
چـــەند جنۆکەیـــەك هـــاتن بـــۆ لایـــان

قورئـــانی دەخوێنـــد لـــەوکات پێـــشەوا
ئـــەوانیش هاتنـــه ســـەر ئـــاینی خـــوا

گەرچـــــی جنۆکـــــەی نـــــەدەدیت بەچـــــاو
بـــــەڵام تێـــــی گەیانـــــد خـــــودای کـــــار تـــــەواو

لەســـــورەی(احقـــــاف)خواوەنـــــدی بـــــەهێز
ئەوباســـــە دەکـــــا بـــــۆ خـــــەڵکی بـــــەڕێز

بـــــە لێوبـــــەباری ســـــەروەر و یـــــاری
هاتنـــــەوە (مەککـــــە) زۆر بەناچـــــاری

لـــــەودەمی ســـــەروەر هاتـــــەوە شـــــاری
کـــــافران ویـــــستیان بـــــدەن ئـــــازاری

بـــــەڵام (مطعـــــم)ی کـــــوڕی (عـــــەد)لەوســـــات
بـــــەمان و نـــــەمان پـــــشتگیری دەکـــــات ،

ئەوســـــا بـــــانگی کـــــرد لەودەمـــــە ، بـــــەدەنگ
پـــــشتگیری دەکـــــەم لـــــە ســـــەروەر بەجـــــەنگ

مـــــن پـــــەنام داوە بـــــە هـــــەموو هێـــــزم
بـــــە شمـــــشێر وەکـــــو چـــــاو دەیپـــــارێزم

گـــــشت کافرەکـــــانی (مەککـــــە)ش بەیـــــەك دەســـــت
لـــــە پێـــــشی ڕاســـــتیدا بوونـــــە بەربەســـــت

پێغەمبـــــەری خـــــواش خـــــەم و پـــــەژارە
دەیخـــــوارد لـــــە داخـــــان ، نەشـــــیبوو چـــــارە

بـــــەڵام ئـــــارامی دەگـــــرت ئـــــەو مـــــەردە
لـــــە زێـــــر ئـــــازاری زۆردار و جـــــەردە

بـــــە بـــــەردەوامی هـــــەر تێدەکۆشـــــی
چـــــاوەڕوانـــــیش بـــــوو بـــــۆ ڕۆژی خـــــۆشی

## باسی( إسرا و میعراج)

بەویـــــــستی خـــــوودای گــــــەورە و کردگــــــار
باســــــی شــــــەوڕۆیی ســــــەروەری نـــــازدار

کــــە لــــە (مەککـــــەوە) بــــۆ (قـــــودس) و ئاسمـــــان
بـــــە هاوکــــاری خـــــوا دەبێتـــــە باسمـــــان

وەرن وەرگـــــــرین زۆرســـــــوود لـــــەو پەنـــــدە
جێیـــــی تێرامانـــــە بـــــۆ ئێمـــــەی بەنـــــدە

ئـــــەم گەشتـــــە چـــــونکە بەڵگـــــەی بـــــەهێزە
لـــــە بـــــۆ پێغەمبـــــەر بـــــۆ ئـــــەو بـــــەڕێزە

دەربـــــــــارەی مانگـــــــــان بـــــــــیروڕا زۆرن
گەرچـــــی نـــــزیکن لێـــــك جـــــۆرا و جـــــۆرن

لای سیرەنوســـــــان هەنـــــــدێکیان وایـــــــە
(میعـــــراج)ی ســـــەروەر بـــــۆ لای ئـــــەو خوایـــــە

لـــــــە مـــــــانگی (رەجـــــــەب) ئـــــــەنجام دراوە
یـــــا خـــــود رەبیعـــــی یەکـــــەم تـــــەواوە

هەنـــــدێکیش دەڵـــــێن لـــــە (ذوالقعـــــدة ) بـــــوو
کـــە ســـەروەر لـــە بـــۆ (قـــودس) و ئاسمـــان چـــوو

بـــــەڵام خـــــوای گـــــەورە لێیـــــان بـــــێ ڕازی
لـــــە ســـــاڵ و ڕۆژان نیتیـــــان جیـــــاوازی

مانگێـــــك لـــــە وانـــــە لـــــە شـــــەوی دووشـــــەم
هـــەژدە مـــانگ پـــێش کـــۆچ ، لـــە ســـاڵی دەیـــەم

هـــــەر وا بەویـــــستی خــــوای بەدیهێنـــــەر
مێـــــژووی ئەوکاتـــــە کەوتـــــە بەرامبـــــەر

شـــەش ســـەد و بیـــست و یـــەکی زایـــنی
کـــەوا نوێنـــەر و گـــەورەی ئـــاینی

بـــەرز بۆتـــەوە بـــەرەو کردگـــار
درووی لـــێبن هێنـــدەی گـــەڵای دار

ویـــستی خـــوای گـــەورە وابـــوو لـــەو شـــەوی
لـــە مـــاڵ (ام هـــانی) ســـەروەر بخـــەوی

کیـــژە مـــامێکی ژیـــر و بـــەڕێز بـــوو
بـــڕوای بـــە بـــوونی خـــودای بـــەهێز بـــوو

بـــا گـــوێی بـــۆ بگـــرین بـــەڕێك و جـــوانی
کـــاتێ پێغەمبـــەر هەســـتا بـــەیانی

بـــە (ام هـــانی) وت:- دەزانـــی ئەمـــشەو
چـــووم بـــەرەو (قـــودس) و ئاسمـــانی پـــڕ تـــەو

(ام هـــانی) ش پێـــی وت :- نـــوری چـــاوانم
هەرچـــی بفـــەرمووی بەڕاســـت دەزانم

بـــەڵام پـــێم باشـــە هـــەرگیزا و هـــەرگیز
لـــە نـــاو خـــەڵکانی سەرمەســـتی بـــەفیز

ئـــەو قـــسە بکـــەی پێـــت بـــڕوا ناکـــەن
چـــونکە دوژمـــنی گـــشت ڕاســـتی و چـــاکەن

بـــەڵام بـــا ئێمـــە وەکـــو دڵـــسۆزی
بـــاس بکـــەین لـــە ســـەر زاری پـــیرۆزی

ئەوسا پێغەمبەر بە باش و جوانی
گێڕاویەتیەوە لە بۆ (ام هانی)

لەگەڵ (جبرائیل) لە ماڵیان بە شەو
چووە بۆ (قودس) ، کاتی گەرمەی خەو

لە (قودس)ی پیرۆز ، لە بنکەی دینی
زۆر پێغەمبەری هەر لەوێ بینی

پاشان بەرەو خوای گەورە و بێ وێنە
بەرز بووەوە جێیهێشت ئەو شوێنە

بەویستی خودای کاربەجێ و ( غەفور )
ڕێگای نەبڕاوە و پڕ لە سام و دوور

زۆر بە ئاسانی بڕی ئەو ماوە
چونکە ویستی خوا لەجێ و تەواوە

هەر لە ئاسمانی دونیا تا دوایی
پێغەمبەران و فریشتەی خوایی

لەگەڵی دواون بە قسە و پێشوازی
بۆ زەوی و ئاسمان بوو بە شانازی

هەر لەو گەشتەدا هەر پێنج نوێژەکان
فەرز بوون لەسەر خەڵکی موسڵمان

بەهەشت و دۆزەخ ئەویش هەردووکی
پیشانی دراون بە سەختی و سووکی

خەڵکان لە بەهەشت دەخولانەوە
دۆزەخیەکانیش تێی دەتوانەوە
زۆری بینیون سەرومڕ لەم گەشتە
کێ لە دۆزەخە و کێ لە بەهەشتە

بەسەرهات زۆرن هەم بەڵگە و ڕوداو
بەڵام هێندەمان خستۆتە بەر چاو

جا ئەم ڕوداوە کاتێ بەیانی
هەمووی گێڕاوە لە بۆ(ام هانی)

ئەویش دووبارە پێی وت :- وا مەڵێ
چەنکە دڵڕەقان پێت نالێن بەڵێ

پێغەمبەری خۆش فەرمووی :- ( ئوم هانی )
فەرمانی خودا دەبێ بە جوانی

بەیانی بکەم بۆ خەڵکان هەموو
ناشی شارمەوە بەقەد داوی موو

لە بۆ (کەعبە) چوو ئەو خوداناسە
شەورۆیی خۆی و هەموو ئەو باسە

لە بۆ خەڵکی کرد بەنەرم و نیانی
هەندێکیان بە ڕاست نەمەیان زانی

خەڵکێك زمانیان پیس بوو لە ئاستی
وتیان :- شتی وا دوورە لە ڕاستی

جا( ئەبوجەهل)یش زیاتر لە خەڵکی
خەڵکی هاندەدا ، بۆ ئەوەی بەڵکی

ئـــــەو قـــسە بـــە درۆ بکـــا بـــڵاوە
خـــەڵکی پـــیس چـــونکە نیـــازی گـــڵاوە

لـــە (مەککـــە) گـــەڕا ئـــەو بـــاس و دەنگـــە
ســـەرومر شـــەوڕۆیی کـــردوە بـــەو ڕەنگـــە

ئـــــیتر بەگاڵتـــــە و بـــــە دەمەقاڵـــــە
بـــۆ (ئـــەبوبکر) ئـــا ئـــەم هەواڵـــە

بردیـــان تـــاکو ئـــەویش بزانـــێ
گوایـــە (موحەممـــەد) چـــۆتە ئاسمـــانێ

ئـــەی (ئـــەبوبکر) پێیـــان وت :- وەرە
گوێـــت بگـــرە لەمـــە ، ســـەر ســـورهێنەرە

(موحەممـــەد) دەڵـــێ :- لەمـــشەو بێگومـــان
چـــومەتە (قـــودس) ، لـــەوێش بـــۆ ئاسمـــان

جـــا (ئـــەبوبکر)یـــش بـــە قـــسەیەکی جـــوان
ڕووی کردەخـــەڵکی و بۆیـــان هاتـــە دوان

گـــەر ئـــەو وا بڵـــێ مـــن هـــیچ گومـــانم
لـــە دڵـــدا نیـــە و بەڕاســـت دەیـــزانم

جـــا ( ئـــەبوبکر)ی ژیـــر و بەختـــەوەر
بـــە خێرایـــی چـــوو بـــۆلای پێغەمبـــەر

پێغەمبـــەری خـــواش ئەوســـا بـــە جـــوانی
بـــۆی بـــاس کـــرد ئـــەویش بەڕاســـتی زانـــی

بۆیــــە تــــا دونیــــا و دوارۆژیــــش مــــاوە
(ئــــەبوبکر) هــــەر (صــــدیق)ی نــــاوە

قــــسەی دەکــــردن پێغەمبــــەری خــــوا
خــــەڵکێکی (دونیادیــــدە)ی هاتــــە لا

پێیــــان وت :- ئەگــــەر ڕاســــت دەکــــەی گوایــــە
باســــی (قــــودس) کــــە بــــزانین وایــــە

پێغەمبــــەری خــــواش لەمــــەو بــــەر بەچــــاو
هــــەرگیز نەیــــدیبوو (قــــودس)ی ڕێــــزگیراو

خواوەنــــدی گــــەورەش جــــا بــــە تــــەواوی
هــــەر هــــەموو قودســــی هێنــــا بــــەر چــــاوی

ئەوســــا پێغەمبــــەر لای ســــەر و ژێــــری
لــــەبۆ بــــاس کــــردن زۆر زۆر بــــە تێــــری

هەرچــــی دەیفــــەرموو دەیــــان وت:- وایــــە
لێــــی بــــێ ئاگــــا بــــوون ، کــــە کــــاری خوایــــە

پاشــــان پێغەمبــــەر فــــەرمووی :- هــــەر لــــەوکات
کــــاروانێکم دیــــت بــــۆ (مەککــــە) دەهــــات

بــــەڵام وشــــترێك هــــەر لــــەو کــــاروانی
وون بــــوو بــــوو ، کەســــیش پێــــی نــــەدەزانی

منــــیش بــــە ویــــستی خــــودای کــــار ئاســــان
بــــۆم دۆزینــــەوە پیشانیــــشم دان

لــــــە گەڕانـــــــەوەش بینــــــیم بـــــەم شــــێوە
هـــــــەموو نوســــــتبوون لەتەنیــــــشت ڕێــــــوە

لام دایـــــە لایــــــان ، خواردەمــــــەوە ئاویــــــان
پاشــــــان هەنـــــدێکیش گــــــەڕام لـــــە ناویــــــان

جـــــا ئەگــــــەر ئێــــوە پــــێم بــــاوەڕ ناکــــەن
یــــــەکجار دڵـــــــڕەقن ، دوژمــــــنی جــــــاکەن

ئــــــەوانی کــــــەوا ناحــــــەزی دیــــــنن
بــــا بــــڕۆن بــــۆ خــــۆ کـــــاروان ببیــــنن

لــــە ( تــــەغیمی ســــپی ) دێــــن بـــە ئـــەم جــۆرە
وشــــــتری پێـــــشیش ڕەنگەکــــــەی بــــۆرە

جـــــا ئـــــەم وشــــترەش دوو(تـــــا)یـــــە بــــاری
(تـــــا)یـــــەکیان ڕەشـــــە لـــــە بــــۆ زانیــــاری

(تـــــا)یەکـــــەی تــــریش (بەڵــــەك)ە ڕەنگــــی
جــــا بەســــەریان هـــــات هەنـــــدێ بـــێ دەنگـــی

ئەوســــــا کۆمــــــەڵێك خــــــەڵکی قوڕەیــــــشی
بۆڕاســــــتی زانـــــــین ، چــــــوون لـــــەبۆ پێــــشی

کـــــاتێ بینیـــــــان لـــــــەنزیك بـــــــە چـــــاو
فــــــەرموودەی ســــــەرومەر دەرچــــــون بــــــە تــــــەواو

ئــــەو وشترەشــــیان کــــە لـــــە پــــێش دابــــوو
ڕەنگەکـــــەی بــــۆر بـــــوو بـــــاری دوو (تــــا) بـــــوو

پاشـــــان پرســــــيان دەربـــــارەی ڕێگـــــا
ئـــــەوان گـــــشت ڕووداو جێگـــــا بـــــەجێگا

گێڕايانـــــەوە هـــــەر هـــــەمووی وابـــــوو
چـــونکە پێغەمبـــەر لێـــی بـــەئاگا بـــوو

بـــەڵام دڵڕەقـــان چـــۆن بـــڕوا دێـــنن؟!
دان بەڕاســـــتيا هـــــەرگيز نـــــاهێنن

ئەگـــەر نـــا ســـورەی (اســـراء ) گـــشت کـــاتێ
بـــۆ هـــەر کەســـێکی ســـەرنجی داتـــێ

ئامۆژگاريـــەکی پـــڕ وانـــە و پەنـــدە
بـــۆ خـــەڵکێك ئەگـــەر ژيـــر و هۆشمەنـــدە

جـــا ئـــەی ســـەروەری لێهـــاتوو و ئـــەمين
لێـــتبن ســـڵاوی (رب العـــالمين )

خوايـــە لەگـــەڵ ئـــەو ئێمـــە حەشـــر کـــەی
لـــە دەفتەريـــشی ناومـــان ئەشـــرکەی

ئەگـــەر چـــی ئێمـــەی ئـــەزان و خـــەوتوو
نابينـــە خـــەڵکی ژيـــرو شـــوێن کـــەوتوو

## باسی پەیمانی (عەقەبە)ی یەکەم

ڕۆژ بـــــە ڕۆژ ئیـــــسلام دەنگـــــی دەداوە
کـــەژی حـــەج هـــات و ســـاڵیش ســـوڕاوە

لـــە (مەدینـــە)وە هـــاتن دوانـــزە پیـــاو
هـــاتن لـــە بـــۆ حـــەج هەمووشـــی شـــیاو

چـــواریان لەمانـــە ناویـــان دیـــارە
( ابـــوهیثم) و کـــوڕی (زرارە)

کـــوڕی (زرارە)ش (اســـعد) بـــوو نـــاوی
هـــەروەها ڕاســـتی بـــۆی ببـــووە بـــاوی

(عوبـــادە) و (رفیـــع) ، جـــا ئـــەم هـــەر چـــوارە
لەگـــەڵ هەشـــتی تـــر هەســـتان بـــەم کـــارە

هـــاتن بـــۆ (مەککـــە) ڕەحمـــەت بـــێ لێـــان
چـــوونە (عەقەبـــە) بـــەو پـــەڕی پـــەنهان

تـــا لەگـــەڵ ســـەروەر پـــەیمان ببەســـتن
لەســـەر ڕایـــەخی نـــەفامی هەســـتن

جـــا گفتوگـــۆی کـــرد ســـەروەر بـــەم شـــێوە
تـــا نەکـــەن هەرچـــی کـــاری دزێـــوە

ســـەروەر پێـــی فـــەرموون کـــەنابێ ئـــەوان
هاوتـــا بڕیـــاردەن بـــۆ خـــوای میهرەبـــان

منـــداڵان مـــەکوژن مەکـــەن نەگریـــسی
هـــەروەها دوور بـــن لـــە داوێـــن پیـــسی

بوختانـــــچی و (دز)یــــش خراپـــــەکارە
جێــــی تـــــورە بــــوونی خـــــوای کردگـــــارە

جـــا ئــــەم کەســـانە دەســـتیان خـــستە دەســـت
پــــەیمانیان لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەردا بەســـــت

هـــــەر دوانـــــزە کەســـیان کـــوڵی ئـــــەم دینـــــە
دایانـــــــە کۆڵیـــــــان بـــــــەرەو (مەدینـــــــە)

لـــەو ســـاتی ســـەروەر فـــەرمووی بـــە یارێـــك
لەگـــــەڵیان بـــــڕۆ ، ئەنجامـــــدە کارێـــــك

لەگـــەڵیان ڕۆیـــشت ( مـــصعب )یـــش ئـــەوکات
تـــــاوەکو فێـــــری قورئانیـــــان بکـــــات

بـــوون بـــە(ســـێزدە) کـــەس ئەوســـا ڕۆیـــشتن
بـــــەرەو (مەدینـــــە) تـــــا پێـــــی گەیـــــشتن

کـــاتێ چـــوونە نـــاو (مەدینـــــە) و شـــاری
(مـــصعب) چـــوو مـــاڵی (کـــوڕی زرار)ی

ئـــــەو ســـــاکە لـــــەوێ زۆر بەسەربەســـــتی
خـــەڵکی بـــانگ دەکـــرد لـــە بـــۆ مەبەســـتی

ڕۆژ ڕۆژە زیـــــاتر خـــــەڵکی مەدینـــــە
دەهـــاتن بـ ـــۆ نـــاو بازنـــەی ئـــەم دینـــە

هەنـــدێ خـــەڵکی تـــر بـــە شمـــشێری ڕووت
لـــە پێنـــاو یاســـا و فـــەرمانی (طـــاغـــوت)

دەچـــوون بـــۆ (مـــصعب) بـــەو پـــەڕی کینـــە
تـــاوەکو چـــیتر ڕاســـتی ئـــەم دینـــە

بـــــه گـــــوێی خەڵکانــــــدا دانەچـــــــرپێنێ
تـــــا دەســــــەڵاتیان هـــــــەرەس نـــــــەهێنێ

دەیـــــانوت (مـــــصعب ) ئـــــا بـــــەم شمـــــشێره
گـــــەردەنت دەبـــــــڕین ، مەمێنـــــــە لێـــــره

ئەگـــــەر چـــــی ئـــــەویش بـــــەو پـــــەڕی خۆشـــــی
نەیـــــدەکرد ســـــستی هـــــــەر تێدەکۆشـــــی

رۆژێکیـــــــان لەگـــــــەڵ کـــــــوڕی (زرار)ی
چـــوو بـــۆ نێـــو باغێـــك ( مـــصعب ) لـــەو شـــاری

تـــــاوەکو لـــــەوێ جـــــوان بـــــه ئەساســـــی
بـــــۆ خـــــەڵکی بکـــــا باســـــی خواناســـــی

لـــەو کـــات (ئوســـەید)ی کـــوڕی (عـــوزەیر)ی
کـــه ئـــەم شـــتەی بیـــست بینـــی بـــه ســـەیری

(ئوســـەید) و (ســـەعد)یـــش لـــەلای یـــەکتر بـــوون
یـــــەك لـــــەویتریان ژیـــــر و ڕێکـــــتر بـــــوون

ئەوســـــا (ئوســـــەید) خـــــوای لـــــێ بـــــێ ڕازی
وتـــــی (بەســـــــەعد)ی کـــــوڕی ( معـــــازی )

گـــــەنجێك هاتۆتـــــه ئێـــــره لـــــه(مەککـــــه)
گۆڕیویـــــه هۆشـــــی نیـــــوەی ئـــــەم خەڵکـــــه

ئـــــەوها پـــــێم باشـــــه تێـــــی بگـــــەیێنی
تـــــاوەکو بـــــڕوا و لێـــــره نـــــەمێنی

(سـەعد)یـش پێـی دەڵـێ :-(ئوسـەید) براکـەم
نـارۆم ، مـن قـسەی لەگـەڵ دا ناکـەم

(ئوسـەید)یـش گـەلێ تـورە بـوو لـەو کـات
زۆر بـە ڕوو گـرژی بـۆ لای (مـصعب) هـات

زۆر لێـی چـووە پـێش بـێ شـەرم کـردن
لێـی کـرد هەڕەشـەی بـەتین بـۆ مـردن

(مـصعب)یـش پێـی وت :- کـەمێك بوەسـتە
تـاکو دەزانیـت چـیمان مەبەسـتە

بـڕوام پێبکـەن ، لـەو دەمـە بـێ سـوێند
هەنـدێ قورئـانی بـۆ (ئوسـەید) خوێنـد

ئەوسـا (ئوسـەید)یـش هـەر لـەو کاتـەوە
گـەلێك هەڵـچوو بـوو ، بـەڵام هاتـەوە

لـە دوای گفتوگـۆی زۆر چـڕ و پـڕی
ئیـسلام بـوونی خـۆی لـەوێ دەربـڕی

گـەڕاوە بـۆلای (سـەعد)ی (معـاذ)ی
بـە سـەر بـڵنـدی و زۆر بـە شـانـازی

کـە (سـەعد)یـش دیتـی ڕووی ، دەمووچـاوی
پێـی فـەرموو:- (ئوسـەید) وەك خـۆت نـەماوی

(ئوسـەید)یـش وتـی :- حـەزم لێیـە تـۆش
بـچی گـوێ بگـری لـە قـسەی ڕاسـت و خـۆش

ئەوسا گرژ بوو ڕووی (سەعد)ی (معاذ)
خولاوە و ڕۆیشت وەکو هەڵۆ و باز

چوو بۆ لای (مصعب) بە قسە و هەڕەشە
پێی وت :- مەبەستت ناپاکی و غەشە

داوات لێدەکەم چیتر ئەو خەڵکە
نەبەی بەو دەردە بڕۆوە (مەککە)

بەڵام (مصعب)ی مەرد و بێ وێنە
پێی وت ئەی (سەعد) ئارام بنوێنە

فەرموو دانیشە کەمێ لەم جێیە
قسەم بەسوودە ، هەمووی لە جێیە

(سەعد)ی (معاذ)یش دانیشت بەجوانی
گوێی دڵی ڕاگرت لە قسەکانی

دەیزانی ، موویەک هەیە لەو ماستە
بۆیە لە دڵەوە پێی دەوت ڕاستە

بەڵام هەروەها خۆشبەختانە و زوو
هەروەکو (ئوسەید) لەنێو ژەنگ دەرچوو

گەڕاوە بۆ لای (ئوسەید)ی بەڕێز
خودا شادی کرد بە دینی بە پێز

ئیتر لەو ساوە بۆ خوا دڵسۆز بوون
هەردووکیش گەورەو سەرۆکی هۆز بوون

(ســـــەعد)ی بەختـــــەوەر ئەوەســــــتا بەمـــــە
هۆزەکـــــەی بـــــانگ کـــرد لــــەو کـــات و دەمـــــە

هــــەروەکو (مـــصعب) بـــــە قــــسەی ڕاســـت و خـــۆش
هـــــەمووی بـــــۆ دیـــــنی خــــوا هێنانــــــە جـــۆش

هــــــەزاران ســــــڵاو لــــــە (مـــــــصعب)ی مـــــەرد
زۆر خــــــەڵکی دەرکــــــرد لــــــە نــــــەزانی و دەرد

# باســـی پـــەیمانی (عەقەبـــە)ی دووەم

ســــاڵێکی تـــــەواو (مـــوصـــعــــــەب) مـایـــــــەوه
تــــــاکو کـــــــاتی حـــــــەج نەگەڕایــــــــەوه

لەکۆشـــــــش دابـــــوو لــــــە نــــــاو (مەدینــــــە)
خـــــەڵکی بـــــانگ دەکـــــرد بـــــۆ نــــاو ئـــەم دینـــــە

ســــــاڵ ســــــوڕایەوه (موصـــــعەب) وەك ژیـــــران
هاتــــــــەوه (مەککــــــــە) شـــــوێنی بـــــــاپیران

خــــــەڵکی (مەدینـــــــە)ش هــــــــاتن لەگــــــەڵی
ڕونــــاکی خوایــــان چـــــوو بـــــووه نــــاو دڵــــی

بــــــەڵام لــــــە ترســــــی خـــــەڵکی پرکینــــــە
خۆیــــــان دابــــــووه پـــــاڵ کـــــوفری مەدینـــــــە

ئەوســــــا موصــــــعەبی دڵ پــــــڕ بەختــــــەوەر
بــــــە دڵگوشــــــادی چــــــۆ لای پێغەمبــــــەر

چـــــــونکە ســــــاڵێکی ڕێــــــك بەتــــــەواوی
دوور کـــــەتبوەوه لــــــە نــــــووری چـــــاوی

تــــــەواو بـــــۆی بــــاس کــــرد باســـــی (مەدینــــــە)
باســـــــی خەڵکەکــــــە و پـــــەرەی ئـــــەم دینـــــــە

درووودی لـــــــێ بــــــێ پێغەمبــــــەری خـــــــواش
گـــــەلـــێ دڵخـــــۆش بـــــوو بــــــە کــــاری وا بـــــاش

جـــــــا موســـــــڵمانان زوو بــــــە دەســـــــتوبرد
بــــــە پێـــــی ماوەکـــــە حـــــەجیان تـــــەواو کــــرد

ئینجـــا خواناســـــی شـــاری (مەدینـــــــە)
وتیـــان بـــە گـــەورەی پــــر ڕاســـــتەقەینە

ئـــاوات دەخـــوازین شـــەو بـــە پـــەنهانی
دانیـــشین لـــەلات ، کـــەس پـــێ نـــەزانی

پێغەمبـــــەری خـــــواش زۆر بەشـــــانازی
کـــاتی پێـــدان و لـــە خـــوای دەخـــوازی

جـــا شـــەوێ هەســـتان ، کـــاتی نیوەشـــەو
جێیـــان هێـــشت پێخـــەو ، کـــاتی گەرمـــەی خـــەو

هـــەنگاو بـــە هـــەنگاو دەچـــوون بـــەبێ هەســـت
تـــاکو نـــەزانن خـــەڵکی بتپەرســـت

چـــوونە عەقەبـــە ڕژانـــە دۆڵێـــک
لـــە شانیـــشیان بـــوو تـــرس وەك کۆڵێـــك

حـــەفتا و پێـــنج کـــەس بـــوین (کـــەعب) وا دەڵێـــت
ڕەزا و ڕەحمـــەتی خـــودای لەســـەربێت

لەگەڵیـــشمان بـــوون دوو ئـــافرەتی چـــاك
باوەڕیـــان هـــەبوو بـــە ئیـــسلامی پـــاك

(نوســـەیبە) و (ئەســـماء) نـــاوی ئـــەو دوانـــە
ئـــەوانیش هـــاتن بـــۆ ئـــەو جێژوانـــە

جـــا (کـــەعب) دەڵـــێ :- چـــووینە جێگاکـــە
هـــەردەم چاویـــشمان بـــوو لـــە ڕێگاکـــە

تـــاکو بـــزانین کـــەی پێغەمبـــەر دێـــت
ســـەلامی خـــودای گـــەورەی لەســـەربێت

دەڵـــێ دەمـــانکرد باســـی بـــەتامی
لـــەوکات هـــات لەگـــەڵ (عـــەباس)ی مـــامی

کـــە پێغەمبـــەر هـــات لەگـــەڵ (عـــەباس)ی
بـــە پـــەنهانی ، تـــا نـــەزانن باســـی

بـــە خۆشـــحاڵیەوە دانیـــشت لـــەناومان
زۆر دڵگوشـــاد بـــووین بـــەنووری چـــاومان

جـا (عـەباس) فـەرمووی :- ئـەی (بـەنی خـەزرەج)
لەسەرچـاومان بـێن لـە بـۆ عـومرە و حـەج

دیـــارە مەبەســـتتان کـــارێکی خێـــرە
بۆیـــە بـــەو شـــەوە هاتوونـــە ئێـــرە

بەیـــەکتر شـــادبوون هـــەردوولا لـــەوێ
جـــا بـــا بـــزانین ، چـــیان لێـــك دەوێ

(عـــەباس) پێـــی وتـــن :- بـــەرەی چـــاکە کـــار
مەبەســـتی وایـــە ســـەروەری نـــازدار

زۆر بەدڵیـــەتی ڕەوشـــت و باوتـــان
زۆریـــش حـــەزدەکات کـــە بێتـــە ناوتـــان

خـــاوەن خـــوو و بـــاوی جـــوان و بـــە پێـــزە
بـــەهای گرانـــە وە جێگـــای ڕێـــزە

گەرچـــی باوەڕمـــان پێـــی نـــەهێناوە
بـــەڵام ڕێـــزدار و بیلبیلـــەی چـــاوە

جـــا ڕاستیویـــــستان ئێـــوە چـــی دەڵـــێن
بـــەو شـــێوە و مەرجـــە پێـــی دەدەن بـــەڵێن؟

لـــەو کـــات ئـــەوانیش وتیـــان :- ئـــەی (عـــەباس)
مـــامی ســـەرکردەی بـــەڕێزی خوانـــاس

هـــەمووومان گیادمـــان وا لەســـەر دەســـتە
هاتوینـــە ئێـــرەش بـــۆ ئـــەم مەبەســـتە

بـــیر و باوەڕمـــان زۆر پێـــی بەتینـــە
لـــە هـــەر کـــاتێکیش بێتـــە (مەدینـــە)

پـــەیمان بـــێ پـــەیمان تـــا دوا هەناســـە
بـــبین بەشـــووره بـــۆ ئـــەم خواناســـە

وتیـــان بەڕاســـتیش پـــەیمادمان ڕێکـــە
قـــسەی ســـەرزار و نـــاو دڵمـــان یێکـــە

ئینجـــا بەویـــستی خـــودای میهرەبـــان
لەوســـاتدا خوێنـــدی هەنـــدێ لـــە قورئـــان

پاشـــانیش فـــەرمووی :- یـــارانی بـــەڕێز
وەکـــو منـــداڵتان گـــەر بـــە چـــەك و هێـــز

لـــە منـــی ڕاستیویـــست بکـــەن بـــەرگری
نزیکـــە ویـــستمان ئێـــستا ســـەرگری

دووبـــارە (بـــراء) وتـــی :- پێغەمبـــەر
وابێـــت پاداشـــتمان چـــی دەبێـــت لـــەو ســـەر؟

سەرومریش فەرمووی :- لەدوای ئەم گەشتە
پاداشتی ئێوەی بەرێز بەهەشتە

(باوکی هیشم)یش زۆر گەرم داهات
قسەی (براء)ی زوو بڕی لەوکات

وتی :- ئەی سەرومر نێوانمان خۆشە
لەگەڵ جوولەکە کە ڕاستی پۆشە

لەمرۆ بەدواوە یەکتر نادوێنین
پەیمانی زوومان وا دەپچڕێنین

بەلام ئەی سەرومر ئەی خوێنی دڵمان
ئەی هۆی ئازادی نێو گۆڕ و گڵمان

گەر سەری خستی خودای بەسۆزت
نا گەڕێیتەوە تۆ بۆ ناو هۆزت ؟

پێغەمبەری خواش فەرمووی :- یەك خوێنین
جیا نابین تاکو لە ژیان بمێنین

دۆستتان دۆستمە و دوژمنیش هەروا
ئێمە یەك جەستەین بە فەرمانی خوا

پاشانیش فەرمووی :- ئەی دڵسۆزانم
لە ناو خۆتانا دوانزە پیاوانم

بۆ هەڵبژێرن ئەوها دیارە
کام لێپرسراو و سەرپەرشتیارە

جــا هــەر لەودەمــە ئــەو هێنــدە یــارە
بــۆ ئــەو مەســتە هەســتان بــەم کــارە

لــە بــەرەی (خــەزرەج) دیــارکران نــۆ کــەس
لــە هــۆزی (ئــەوس)یــش هەرسێ کــەس بــوون ، بــەس

نــاوی نــان نــەقیب فــەرمووی :- بــزانن
کــە لێپرســراوی هۆزەکانتــانن

پاشــانیش فــەرمووی یــاران بــەم شــێوە
لێپرســراوێکم هــەروەکو ئێــوە

یەکــەمین کەســیان( بــراء) بــوو دەســتی
لــەناو دەســتی نــاو پــەیمانی بەســتی

گــەر لــە هــەرکاتێك بێتــە مەدینــە
بــبن بــە پــەنا بــۆ وی و ئــەم دینــە

ئــەو کــات هــەموویان بــە یەکــە یەکــە
پــەیمانیان بەســتی بــەم شــێوە ڕێکــە

لــەو کــات (عــەباس)ی کــوری (عوبــادە)
دژ بــە (قورەیــشی) بــێ دینــی ســادە

ورەی بــەرز بــوو زۆر گــەرم داهــات
ویــستی بــە شمــشێر بــۆ ســەریان بــڕوات

ســەروەریش فــەرمووی :- (عــەباس) بوەســتە
شــتی وا نــاکرێ بــەم دەمودەســتە

کــــەس بـــە کـــاری وا نـــاڵێ تــــەواوە
چــــونکە فــــەرمانمان پێنــــەدراوە

تـــا زووە لێـــرە مـــەمێنن یـــاران
نـــەك بـــەئاگا بـــێن لێتـــان زۆرداران

جـــا (کـــەعب) دەڵـــێ :- نزیـــك بـــەیانی
چـــووین نوســـتینەوە کـــەس پێـــی نـــەزانی

کـــە بـــەیانی دا پـــێش خـــۆر هـــەڵاتن
کۆمـــەڵێك خـــەڵکی (قورەیـــشی) هـــاتن

تـــاکو بـــزانن ڕاســـتە ئـــەو چـــینە
(موحەممـــەد) دەبـــەن لـــە بـــۆ (مەدینـــە)

بـــە بـــەرەی (ئـــەوس) و (خـــەزرەج)ی دەڵـــێن
ئایـــا داوتانـــە بـــەم جـــۆرە بـــەڵێن؟

(ئـــەوس) و (خـــەزرەج)یـــش بـــەڵێنیان دابـــوو
بـــەڵام بتپەرســـت لێـــی بـــێ ئاگـــا بـــوو

چـــینێکی تـــری خـــەڵکی (مەدینـــە)
کـــە داخ لـــەدڵ بـــوون دژی ئـــەم دینـــە

ئاگایـــان نـــەبوو لـــەو بـــەزم و داوە
وتیـــان :- شـــتی وا هـــەرگیز نـــەکراوە

لـــەوکات (قـــوڕەیش) یـــەکجار بـــە ئاســـان
متمانـــەیان کـــرد بـــە خوداناســـان

ڕاگیراویش بوو هەموو کات هەستیان
نەوەك دەربازبن لەژێری دەستیان

کاتێ چوونەوە بەرەو مەدینە
(قورەیشی) دڵ پڕ لە ڕك و كینە

بۆیان ڕوون بۆوە و زانیان تەواوە
لەگەڵ پێغەمبەر پەیمان دراوە

ئەوسا بەبیری كاڵ و ساوایان
بە پەلەپەلی كەوتنە دوایان

ئەوان بەویستی خواوەندی تاكیان
دەرچووبوون لە ناو سنوور و خاكیان

بەڵام هەر (سەعد)ی (عوبادە) و (مونزیر)
كەوتنە ناو داویان بە مڵێل و تەكبیر

ئەو هەردوكانە بەرپرسی مۆر بوون
بۆ (قورەشی)یەكان دەسكەوتێ زۆر بوون

بەڵام (مونزیر)ی بە توانا لەوكات
توانی لەدەستیان خۆی ڕزگار بكات

سەعد)ی (عوبادە)ش ڕێك هەردوو دەستی
لەلای پشتەوە توند لێیان بەستی

بە زەبری لێدان لە پێش ئەو خەڵكە
بردیانەوە بۆ ناو شاری (مەككە)

لـــەو كـــات (حـــارث) و (مطعـــم) چـــوونەپێش
زوو ڕزگاريـــان كـــرد لـــە لێـــدان و ئـــێش

ئەوســـا (قوڕەيـــشی) پـــڕداخ و كينـــە
بـــە پەيمانەكـــەی خـــەڵكی (مەدينـــە)

كـــە بەســـتبوويان لەگـــەڵ پێغەمبـــەر
كـــە پـــەنای دەدەن بـــە مـــاڵ و بەســـەر

گـــەلێ توونـــدتر بـــوون لـــە جـــاری جـــاران
لـــە ئـــازاردان و لێـــدانی يـــاران

لەگـــەڵ يارانيـــان دەكـــرد بەكوشـــتن
بـــە فـــڕۆ خـــوێنی ئاڵيـــان دەڕشـــتن

يـــاران دەهاتنـــە لای پێغەمبـــەری
تـــاكو لـــە خۆيـــان بكـــەن بـــەرگری

پێغەمبـــەری خـــواش دەيفـــەرموو :- يـــاران
بوەســـتن ، نـــاگرين بەرگـــەی زۆرداران

ئارامتـــان هـــەبێ ، تـــا خـــوای باڵادەســـت
ڕزگـــارمـــان دەكـــات لـــە دەســـت بـــتپـــەرســـت

# کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ)بۆ (مەدینە)

دوژمنـــــانی خـــوا تـــا ڕۆژی مـــردن
هـــەردەم خوویانـــە ناپـــاکی کـــردن

لـــە (دار النـــدوة) پیلانیـــان دانـــا
تـــا لـــەناو ببـــەن ســـەروەری زانـــا

هاوەڵانیـــشی هـــەر کـــەمێك مـــابوون
لـــە نـــاخ ئامـــەزرۆی ڕێبـــازی خـــوا بـــوون

کۆچـــیان کردبـــوو بـــەرەو مەدینـــە
تـــا لـــە دەســـت نـــەدەن چـــێژی ئـــەم دینـــە

پیلانـــی پـــووچ و نابـــەجێیان بەســـت
هەرهـــەموو بوونـــە یـــەك هـــەنگاو ، یـــەك دەســـت

خـــودا ڕایگەیانـــد بـــە پێغەمبـــەری
بێبـــاوەڕ هێـــرش دێـــنن بـــۆ ســـەری

ئاگـــاداری کـــرد ، دێـــن بـــۆ کوشـــتنی
ئاواتـــە خـــوازن بـــۆ خـــوێن ڕشـــتنی

جـــا کـــاتێ نیگـــا لـــە بـــۆی هاتـــە خـــوار
خـــۆی ئامـــادەکرد ، بـــچێتەدەر لـــە شـــار

خـــۆی و یارەکـــەی دەڕۆن لـــەو شـــارە
لەدەســـت ئـــەو خەڵکـــە خراپـــەکارە

نـــاکرێ چـــی دیکـــە لێـــرە بمێـــنن
لای خـــەڵکێ عەشـــقی مـــردن و خـــوێنن

گــــشت رۆژێــــك ســــەرومر بــــەبێ پــــەنهانی
گــــەر ئێــــواره بــــا یــــاخود بــــەیانی

بــــۆ مــــاڵی (ابــــو بكــــر)ی یــــاری
هــــەر دەچــــوو ، ئەگــــەر نەشــــیبا كــــاری

دەڵــــێ رۆژێكیــــان بــــە پەشــــێو حــــاڵی
كــــاتی هــــاتنی نــــەبوو بــــۆ مــــاڵی

كــــە (ابــــوبكر) ئەمــــەی دیــــت دەڵــــێ:-
وا دیــــاره شــــتێك رویــــداوه، بــــەڵێ

پێغەمبــــەر گەیــــشت بــــە ماڵیــــان وەخــــتێ
كــــەمێك دانیــــشتن ، جــــا دووان نــــەختێ

بــــە (ابــــوبكر)ی فــــەرموو :- ئــــەی هــــاورێم
لەمێــــژه بــــۆ ئــــەم كــــاره چــــاوەرێم

دەبــــێ كــــۆچ بكــــەم خــــوا وای فــــەرمووه
ئایــــا ئــــەتۆش دێــــی هــــەتاكو زووه ؟

ئــــەویش لــــە خۆشــــیان بــــەربووه گریــــان
وتــــی :- ئامــــادەم بــــە دڵ و بــــە گیــــان

بــــەو كــــۆچ كردنــــە زۆر زۆر رازی بــــوو
بەســــەر و بــــەماڵ لــــە پێــــشوازی بــــوو

دوو ئەســــپی هــــەبوون گــــورج و دابەســــتە
تێــــری كردبــــوون بــــۆ ئــــەم مەبەســــتە

ئـــەم دوو شاســـواره كـــاتێ ویـــستیان
كـــەوا كـــۆچ بكـــەن ، كـــافر بیـــستیان

بـــەر لـــەوەی ســـەروەر بگـــرێ رێگاكـــەی
(عـــەلی) دەخـــەوێ لەســـەر جێگاكـــەی

تـــا وابـــزانن كـــافری پـــیس و بـــەد
هـــەر لەخـــەو دایـــە هێـــشتا (موحەممـــەد)

چـــونكه پێغەمبـــەر میهـــری خـــودا بـــوو
ئامانـــەتی زۆر خـــەڵكی لـــەلا بـــوو

ڕووی كـــردە (عـــەلی) پێـــی فـــەرموو:- گیانـــە
ئـــەوەی پێـــت دەڵـــێم چـــاكی بزانـــە

كـــاتێ كۆچـــمكرد ، دەرچـــووم لـــەم شـــاره
ئـــەوەی لەلامـــە چ زێـــر ، چ پـــاره

بیـــدەوە خـــەڵكی ، تـــۆ لـــە جێگـــای مـــن
پاشـــانیش كۆچـــكە ، وەرە ڕێگـــای مـــن

یـــەكیان پێغەمبـــەر یـــەك (ابـــوبكر )
لای یـــەك ڕێـــزدار و شـــیرین وەك شـــەكر

ســـورەی (یاســـن)ی خوێنـــدەوە كـــە چـــوون
هـــەتا ئایـــەتی نـــۆ (لا یبـــصرون)

خـواوەنـــدی گـــەورەش جـــا بـەخـێرایـــی
بـــە ســـەركافرانی هێنـــا كـــوێرایی

کــــاتێ کــــە دەرچـــوون شـــەو کـــەمێ مـــابوو
پـــــشت و پــــەنایان خـــودای تـــــەنیا بـــــوو

لــــــە یـــــەك و لـــــــەدووی (ربیــــــع الأول)
خـــودا رێکـــی خـــست لـــە بۆیـــان ئـــەو هـــەل

لەبـــــــــەر ناپـــــــــاکی کـــــــــافری زۆردار
(مەککـــە)یـــان جێهێـــشت روویـــان کـــردە (غـــار)

ئـــــــیتر هـــــــەردووکیان کەوتنـــــــە رێکـــــــا
رێگایـــــان دەبـــــڕی جێگـــــا بـــــە جێگـــــا

تـــــاکو خـــــۆر هـــــەلات هـــــەر دەڕۆیـــــشتن
تـــــا بـــــە ئـەشکـەوتـــــی (ثـــــور) گەیـــــشتن

پێغەمبـــــەر لـــــە شـــــار بـــــە دوور کـــــەوتبوو
لـــــە جێکاکەشـــــی (عـــــەلی) خـــــەوتبوو

کافرەکـــــان هـــــاتن بەشـــــیری رووتیـــــان
دەك خـــودای گـــەورە لـــە قـــوڕنێ لوتیـــان

هـــــاتبوون تـــــاکو پێغەمبـــــەر بکـــــوژن
خـــــوێنی پـــــیرۆزی بـــــەفیڕۆ بـــــڕژن

هـــــەموو وەســـــتا بـــــوون لـــــەودیو دەرگاکـــــە
تینـــــوو بـــــوون لـــــەبۆ خـــــوێنی ئـــــەو پاکـــــە

لێیـــــان دەڕوانـــــی لـــــەدرزی دەرگـــــای
نەیانـــــدەزانی (عـــــەلی)یـــــە لـــــەجێگای

سەروەر و (ابوبکر)ی یاری
نەمابوون لە ناو دەستەی زۆرداری

کە دای بەیانی دوژمنی نەفام
(عەلی) دەبینن پێی دەبن سەرسام

لەداخی ئەوەی کە فەشەل دێنن
کەمێك بە (عەلی ) ئێش دەگەیێنن

لە ڕزگار بوونی گەلێك دەترسن
دەڕۆن لە (ابوبکر) بپرسن

کافرەکان بە خۆ و بە ئەقڵی کاڵیان
بە کۆمەڵ دەچن بۆ دەرگای ماڵیان

(ابوجهل)ی بەد نەو سەر بەتاڵە
لە (اسما)ی پرسی :- باوکت لەماڵە؟

(اسماء)یش وتی بەو بێخێرە
من هیچ نازانم ، نەشماوە لێرە

ئەو(ابوجهل)ە ، (باوکی نەزانی)
زللەیەکی دا لە (اسماء)خانی

لەگەڵ لێدانی گوارەکەی پەڕی
ئەوەیە کاری پیس و بەدفەڕی

شەو باڵی بەسەر دنیا کێشابوو
پێغەمبەر لەناو (مەککە) نەمابوو

لـــــە ژێـــــــر چـــــــاودێری میهرەبانـــــــەوە
لــــــەناو ئەشــــــکەوتێك ســــــێ ڕۆژ مانـــــەوە

ئەشکەوتـەکەیــــــان (ثـــــور) بــــــوو نـــــاوی
بــــــە فـــــەرمانی خـــــوا چـــــووبوونە نـــــاوی

بـــــە بــــــەردەوامی چـــــەند کەســــــی چـــــالاك
بۆیــــــــان دەبــــــــردن خواردنــــــــەوە و خــــــۆراك

ئـــــەویش ســـــێ کـــــەس بـــــوون زۆر لێهـــــاتوو و ژیـــــر
(عبــــــدالله) و (اسمــــــا) و (عــــــامر بـــــن فهـــــیر)

ئـــــــیتر (قورەیـــــــشی) کەوتنـــــــە مەترســـــــی
بـــــە پەلــــــە قـــــــازە لێــــــاین دەپرســـــی

وتیـــــــان :- بێگومـــــــان لێـــــــرە نـــــــەماون
لـــــــە نـــــــاو ئەشـــــــکەوتێك حەشـــــــار دراون

داخ لــــــە دڵانـــــە چـــــەند کەســـــێك هەســـــتان
چـــــوون لــــــە بـــــەردەرگای ئەشـــــکەوت وەســـــتان

خـــــــوا وای لێکـــــــردن کـــــــە ئـــــــەو گێلانـــــــە
بـــــــە جاڵجاڵۆکـــــــە و کـــــــۆتر و هێلانـــــــە

بکـــــــەن متمانـــــــە و بـــــــڕوا بهێـــــــنن
کەســــــێ تیــــــا نــــــەبێ وا بــــــسەلێنن

ئـــــــیتر مانــــــــەوە بەخــــــــەیاڵ خــــــــاوی
وتیــــــان :- هـــــیچ کەســـــێك نەچـــــۆتە نـــــاوی

(ابـــوبكر)يـــش لێـــی نيـــشت مەترســـی
بـــەلام پێغەمبـــەر لـــەوكات لێـــی پرســـی

ئايـــا دەترســـێی هـــاورێی چـــاكی خـــۆم؟
وتـــی :- ناترســـم ، مـــن لـــە خـــەمی تـــۆم

فـــەرمووی :- مەترســـە ، خـــوا لەگەڵمانـــە
ئێمـــە دووانـــين خـــوا ســـێيەممانە

ئـــيتر كافرەكـــان بـــە نائومێـــدی
ئەشكەوتـــەكەيـــان بەجێهـــێشـــت ، هـــێدی

بـــە خەفـــەتباری و پەســـتی و ژانـــەوە
دڵتـــەنگ ، راســـت بـــەرەو مـــاڵ گەڕانـــەوە

ناوەســـتن بـــەوە كـــاتێ دێنـــەوە
بـــە ناسوودەيـــی ناحەوێنـــەوە

وتيـــان :- هەركەســـێ هـــەواڵيان بـــێنی
ســـەد وشـــتری رێـــك دەدەيـــن مزگێنـــی

لـــەو كاتـــە (اسمـــاء)بـــۆی بـــردن تێـــشوو
دايـــە دەســـتيان وەك جـــاری پێـــشوو

(ابـــوبكر)يـــش چـــی هـــەبوو بەرهـــەم
هـــەمووی هێنـــابوو ، پێـــنج هـــەزار درهـــەم

تێـــشوويان وەرگـــرت لەدەســـت (اسمـــاء)خـــان
ئەوســـاكە روويـــان كـــردە بيابـــان

گرتیانـــــــه بــــــەر رێگـایـەکـــــــی دوور
بـــــەرەو کـــــەناری ئـــاوی دەریـــــای ســــوور

بەســــــەریان برژێــــت بـــــارانی رەحـمــــــەت
هــــیچ گوێیـــــان نــــەدا بـــــە ئــێش و زەحـمـــەت

شـــــــەو تابــــــەیانی هـــــــەر دەڕۆیـــــــشتن
تـــــــاکو نـــــــــەبینرێن ڕۆژ دادەنیـــــــــشتن

کــــــافر دەگـــــــەڕان بــــــۆ دەنـــــــگ و باســـــان
تــــا دەســــــتگیر بکـــــەن هـــــەردوو خواناســـــان

لــــــە دڵــــی کافرەکــــــان زۆر نیـــــشت مەترســـــی
هەرچــــــی دەیانـــــــدیت لێــــــان دەپرســــــی

پیاوێکیـــــــان بـــــــینی یـــــــەکێکیان دەڵـــــێ
کەســـــــت نــــــەدیوە؟ ئـــــەو وتـــــی:- بــــــەڵێ

(موحەممــــــەد)م دیـــــت بــــــە ئێــــــرەدا چــــــوو
پیــــــاوێکی وەکـــــو خۆشـــــی لەگـــــەڵ بـــــوو

(ســــــوراقەی کـــــوڕی مالیــــــك )لــــــەو دەمــــــە
ڕاســـــتی نــــابینێ و بەرچـــــاوی (تــــــەم)ــــــە

لــــــەو کــــــات لــــــەوێ بــــــوو وتـــــی :- بەوانــــــە
بــــــەلای مــــــن داچــــــوون ، هــــــەونین ئەوانــــــە

گەرچـــــی هــــەویش بـــــوون هــــەر لــــەبۆ بــــەرتیل
ئـــــەو دەیویـــــست بـــــۆ خـــــۆی بیانکاتــــە دیـــل

ئـــیتر (ســـوراقە) هەســـتا دەســـت و بـــرد
چـــووەوە مـــاڵێ ، ڕێـــك خـــۆی چـــەكدار كـــرد

تـــا دیلیـــان بكـــات ڕۆیـــشت بـــە دوایـــان
نەشـــــیدەزانی ، خوایـــــــە پـــــــەنایان

پێغەمبـــەری خـــواش چـــونكە لـــە مێـــژ بـــوو
ڕێبـــــواری ڕێگـــــای دوور و درێـــــژ بـــــوو

لـــە بـــۆ پـــشودان لایـــدا بـــن دارێـــك
(ابـــــوبكر)یـــــش دیتـــــی ســـــوارێك

وتـــی :- ئـــەی ســـەروەر ئـــەی پێغەمبـــەرم
بـــە فیـــدای تـــۆ بم بـــە مـــاڵ و ســـەرم

وا بـــــزانم ئـــــەوە ئێمـــــە دەخـــــوازی
ئێمـــــەی دەوێـــــت و خراپـــــە نیـــــازی

بـــەلام هـــەر نابنـــە دەســـتكەوتی ئـــەوی
كاتێـــك نزیـــك بـــوو تونـــد گرتـــی زەوی

ســـەروەر دەیزانـــی بۆیـــە لـــەو كـــاتی
بـــەوی نەفـــەرموو تـــۆ بۆچـــی هـــاتی

كـــە بـــەخۆ و ئەســـپی لـــە زەوی چـــەقی
جـــا دانـــی هێنـــا بـــە ڕاســـتی و حـــەقی

كـــــردی بـــــە هـــــاوار وە پاڕایـــــەوە
بـــــەلام پێغەمبـــــەر بـــــۆی گەڕایـــــەوە

(سوراقە) پێی وت زۆر بە لێبوردن
ناکەم ئەم کارە من هەتا مردن

وتی :- دەنگ ناکەم خاوەن بەڵێنم
دەچمەوە ماڵێ نانتان بۆ دێنم

سەروەریش فەرمووی ئا بەو دلێرە
ئەگەر مەبەستت کاری بە خێرە

ئێمەیان گەر ویست بمان شارەوە
جاگە خوازییە بۆت لەو بارەوە

ئەوجا (سوراقە) دوای ئازاد کردن
داوای ئەمانەت نامەی لێ کردن

ئەمانەت درا جا بەهەرحاڵێ
بە شەرمەزاری گەڕاوە ماڵێ

بە ویستی خودای بەرز و کردگار
وەك جاری پێشوو بوونەوە ڕێبوار

لایدا لە (قوباء) ، زوو بە دەست و برد
بە ناوی (تەقوا) مزگەوتێکی کرد

لە دوای ئەم کارە ، پاشان پێغەمبەر
بەرەو (مەدینە) ڕێگای گرتە بەر

خەڵکی (مەدینە)ش بە لاو و بە پیر
خۆیان چەکدار کرد بە شمشێر و تیر

بـــــە جـــــۆرێکی وا چـــــوون بـــــۆ پێـــــشوازی
چـــــۆن دڵ بیـــــەوێ و پێـــــی ببـــــێ ڕازی

ئـــــەوەی زمـــــانی هـــــەبێت لـــــە زاری
داوای لـــــێ دەکـــــرد بـــــۆ میوانـــــداری

(ئـــــەی ســـــەروەر خـــــاوەن ڕوخـــــساری ڕۆشـــــن
لەگـــــەڵ خەڵکیـــــدا فـــــەرمووده‌ت خۆشـــــن

هـــــەر بۆیـــــە خـــــەڵکان لـــــە نـــــاخی ڕازی
بـــــە گـــــەرمی لـــــە تـــــۆ دەکـــــەن پێـــــشوازی)

ئەوســـــاکە فـــــەرمووی :- وا ئـــــەم وشـــــترە
لـــــە کـــــوێ یـــــەخی کـــــرد ، ئـــــەوێ باشـــــترە

نەکـــــەن دڵگیربـــــن هاوڕێیـــــەکانم
لـــــە کـــــوێ یـــــەخی کـــــرد ، لـــــەوێ میـــــوانم

وشـــــتر دەڕۆیـــــی بەنـــــەرم و جـــــوانی
خـــــەڵکیش لـــــە دوای بـــــوو بـــــە ســـــەرنج دانـــــی

خـــــەڵکان هـــــەر هـــــەموو پەشـــــێو بـــــوو حاڵیـــــان
تـــــا وشـــــتر یـــــەخ کـــــا لـــــە دەرگـــــای ماڵیـــــان

بـــــە فـــــەرمانی خـــــوای گـــــەورە و کردگـــــار
ڕۆیـــــشت ، تـــــا چـــــووە نـــــاو (خێڵـــــی نـــــەجار)

لـــــە دەرگـــــای (ئەبوئـــــەیوب)ی ئەنـــــسار
وشـــــتر یـــــەخی کـــــرد ، ســـــەروەر هاتـــــە خـــــوار

بـــــوو بـــــە میـــــوانی ئـــــەو خوداناســـــە
ئـــــیتر کـــــۆتـــــا هـــــات بـــــەو قـــــســـــە و بـــــاســـــە

## سێ کارە گرنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە (مەدینە)

سەروەر بەزەیی خوای میهرەبانە
بۆیە هەڵدەستێ بەو سێ کارانە

بەویستی خودای خاوەن خوایەتی
یەکەم مزگەوت ، دوو برایەتی

سێیەمین دانانی یاسا و دەستور
پەند و وانەیە بۆ نزیك و دوور

یەکەمین ماڵی خواوەندی تاك بوو
بۆ موسڵمانان شتێکی چاك بوو

بیری کردەوە فەرمووی :- ئەلێرە
مزگەوتێك دەکەین ، بۆ نوێژ و خێرە

بۆ کۆبوونەوەی موسڵمانانە
لە بۆ یەکێتی و ڕاوێژی جوانە

لەو جێیەی وشتر یەخی کرد ، لێی کەوت
وا باشە ئەوێ بکرێتە مزگەوت

ئەوساکە فەرمووی :- ئەو زەوی و خاکە
ئەگەر خاوەنی بیفرۆشێ چاکە

پێیان وت :- مولکی دوو لێ قەوماوە
نە دایك و نە باب ، کەسیان نەماوە

لە لای (ئەسعەدی کوڕی زرارە)ن
هەژار و گچکە ، کەلێك بێ چارەن

(ئەسـعەد)یـش وتـی :- ئـەو زەوی و زارە
بـە خـەڵات بـۆ تـۆ هـەروا بـێ پـارە

سـەروەریش فـەرمووی :- بـێ کـڕین نـابێ
بـە هیـوام ئێـرە بـە مـاڵی خـوا بـێ

ئـیتر پێغەمبـەر ئـەو دوو هـەژارە
ڕازی دەکـاتن بـە زێـڕ ، یـا پـارە

بـە چـاوی ڕەحمـەت سـەروەر دەڕوانـێ
چـەندیان داواکـرد زۆرتـری دانـێ

جـا فـەرمووی :- وەرن ئـەو زەوی و نـاوە
بـا لێـی ڕامـاڵین بـەرد و کـەلاوە

هەنـدێ دارخورمـا و کـەلاوەی لێبـوو
کـە دەسـتیان پێکـرد ، زوو تـاو و تـوێ بـوو

لێـی کۆبوونـەوە بـە کـەیف و توانـا
بـەردی بناغـەی مزگـەوتیان دانـا

پێغەمبـەری خـواش جـار بـەرد و جـار خـشت
ئـەی کێـشانەوە بـە شـان و بـە پـشت

بـەڵام لـە کـاتی بـەرد و خـشت هێنـان
ئـەوەی دەفـەرموو لـە بـۆ هـاوەڵان

دەیفـەرموو :- ژیـان هـەر ژیـانی ئەوسـەر
خـوا خـۆش ببـێ لـە ئەنـسار و کۆچـەر

ئـــەو كـــاتی ڕووگـــەی خـــەڵكانی خوانـــاس
(بيـــت المقـــدس) بـــوو ، وا هـــاتووه بـــاس

تـــا ئـــەو مزگەوتـــە بێگـــەرد و پاكـــە
گـــەلێك پیرۆزبـــوو لـــە ســـەر ئـــەم خاكـــە

دەســـتكردی خـــەڵكی پـــاك و بێگـــەرد بـــوو
دوو پايـــەی هـــەبوو هـــەردوو لـــە بـــەرد بـــوو

بـــە خـــشت و بـــە بـــەرد كـــرا ديـــواری
سەربـــــشی گـــيرا بـــــە گـــــەڵا و داری

ئـــەم شـــوێنە پاكـــە كـــە بنكـــەی ديـــن بـــوو
نزيكـــەی ســـەد بـــاڵ پـــان و بـــەرين بـــوو

ســـێ دەرگـــای هـــەبوو فـــراوان و خـــۆش
چـــاكترين شـــوێن بـــوو بـــۆ چـــاكە و كڕنـــۆش

بـــانگی يـــەكتايی و خـــودا پەرســـتی
ڕۆژێ پێـــنج جـــاران خـــەڵك دەيبيـــستی

ئـــەی پێغەمبـــەرمان هـــەزاران درووود
لەســـەر گيانـــت بـــن بـــە قـــسە و ســـروود

لـــە دوای ئـــەم كـــارە ســـەرومری ئـــازيز
كۆچـــەری و ئەنـــسار دەكاتـــە يـــەك ڕيـــز

دەوری ئـــەوەد كـــەس لـــە هـــەردوو لايـــان
كـــۆی كردنـــەوە ســـەرومری شـــايان

لـــــە نێوانیـــــــان دا هـــــــەڵیکرد چـــــــرا
لــــە گـــــەڵ یــــەکتری ڕێـــــك بوونـــــە بـــــرا

بــــە هـــۆی ســــەروەر و ئــــەو دینـــــە باشـــــە
وەکـــــو گیانێـــــك بـــــوون لـــــە نـــــاو یـــــەك لاشـــــە

لـــــە گــــەڵ یــــەکتری نــــەرم و بــــە دڵ بـــــوون
بـــۆ پێویـــستی یـــەك وەك هـــەنگ و گـــوڵ بـــوون

دەگێڕێتــــــــــەوە بۆمــــــــــان (بوخــــــــــاری)
کــــە کۆچــــەر هاتنــــە (مەدینــــە) و شـــــاری

لــــە ســــەر داخــــوازی ســــەرداری ســــەروەر
یــــــەکێ ئەنــــــساری و یــــــەکێکی کۆچــــــەر

لــــە پێنــــاو خــــودا و گــــەورەی ئــــەو دینــــە
بوونـــــە دوو بـــــرای بێگـــــەرد و کینـــــە

پێغەمبـــــەری خـــــواش وەکـــــو یـــــارانی
بـــۆ بـــرای (عـــەلی) بـــە ڕێـــك و جـــوانی

(ســــەعد)ی خــــودا نــــاس یــــەکێ ئەنــــسارە
زۆر دەوڵەمەنـــــد بـــــوو بـــــە مـــــاڵ و پـــــارە

بـــــرای کۆچـــــەری ئـــــەم (ســـــەعد)ە زیـــــرە
(عبـــــدالرحمن) بـــــوو ، نـــــاویم لـــــە بـــــیرە

جـــا (ســـەعد) پێـــی وت :- وەرە ئـــەی کاکـــە
دوو ژنم هەیـــــە کامـــــەت پـــــێ چـــــاکە

بـــا بـــۆت تـــەلاق دەم گـــەر حـــەزت لێیـــە
ئێمـــە براینـــە ، هـــەر گیادمـــان جوێیـــە

جـــا ئـــەویش پێـــی وت :- خۆشـــتر بـــێ حاڵـــت
پـــیرۆزی تـــۆ بـــێ خێـــزان و ماڵـــت

خـــەڵکی ئەنـــساری زۆر دۆســـتی خـــوا بـــوون
زۆریـــش لـــە خزمـــەت کۆچـــەریان دابـــوون

چـــونکە پێغەمبـــەر بـــەزەیی خـــوا بـــوو
ئـــەم دادپەروەرییـــەی لـــە هەگبـــەدا بـــوو

بۆیـــە کۆچـــەری و ئەنـــسار بـــە جـــارێ
بـــە نـــاخی یەکـــدا چـــووبوونە خـــوارێ

لـــە دوای کردنـــی ئـــەو هـــەر دوو کـــارە
دەســـتوور و یاســـای دانـــا ئـــەو جـــارە

دەســـتوور و یاســـای بێوێنـــە و بـــەهێز
گـــەل و وڵاتـــی گرتبـــووە ئـــامێز

لـــە ڕووی سیاســـی و هـــەروا ئـــابووری
کۆمەڵایـــەتی ، پاشـــان بـــەرگری

لـــەو دەســـتوورەدا باســـیان کـــرا بـــوو
بـــۆ هـــەموو خـــەڵکیش وەکـــو یـــەك وابـــوو

چـــونکە هـــەر هـــەنگی نـــەرم و بـــاڵ ڕەنگـــین
لـــە نـــاو پـــەڕەی گـــوڵ دەردێـــنێ هـــەنگوین

ئـــا ئـــەم دەســـــتوورەش هـــەر حەفـــدە خـــاڵ بـــوو
بـــە ویـــستی خـــودای بـــە توانـــا و زاڵ بـــوو

هـــەر گـــەل و وڵات گـــەر بـــێ دەســـتوور بـــێ
بـــە دەســـتووریش بـــێ گـــەر لـــە خـــوا دوور بـــێ

گومـــــــانم نیـــــــە پـــــــێنج وپەنایـــــــە
وەکـــــو دیـــــواری ســـــەر بـــــەفر وایـــــە

یاســـــای ئیـــــسلامیش پـــــاك و بێگـــــەردە
دەرمـــــانی هـــــەموو ئـــــازار و دەردە

بۆیـــــە ڕۆژئـــــاوا دژ بـــــەو دەســـــتوورە
ئیرەیـــــی هەیـــــە ، ڕقـــــی ئەســـــتوورە

چـــــونکە دەزانـــــێ هـــــەتا دەمێنـــــێ
ناشـــــێ دەســـــتووری ئـــــەوها دابێنـــــێ

جـــا ئـــەم یاســـایە و دەســـتوور و باســـە
گـــەلێ پێویـــستە ، زۆریـــش ئەساســـە

دەســـتوور و یاســـای ئـــەم ڕەوشـــتپاکە
تاکـــە دەســـتوورە لەســـەر ئـــەو خاکـــە

ئیجـــا هـــەر کەســـێ حـــەزکا بیناســـی
لـــە ژیـــانـــامـــاندا بـــاش دەکـــا باســـی

# باسی جەنگی (بەدر)ی گەورە

هـــــەرکاتێ ســــــەرومر گەییـــــە (مەدینــــــە)
مـــاڵی خـــوای چـــاکرد ، کـــە بنکـــەی دینـــە

بـــــە بێباکانـــــــە بــــــە ســــــــەرفرازی
بـــۆ خـــوا دەســــتی کـــرد بـــە بانگـــەوازی

بـــانگ هێـــشتنەکەی یـــەکجار بـــە تـــین بـــوو
چـــونکە لـــە پێنـــاو خـــودا و ئـــایین بـــوو

هـــەموو کـــات پیـــشەی چـــاکەکاری بـــوو
خـــودای باڵادەســـت چـــونکە یـــاری بـــوو

لـــە یادیـــشی بـــوو ســـاڵانی پێـــشی
ســـتەمکاریەتی خـــەڵکی قورەیـــشی.

چـــونکە قورەیـــشی چـــەند جـــار لـــەوەو پـــێش
پێیـــان چەشـــتبوو زۆر ئـــازار و ئـــێش

ئەوســـا پێغەمبـــەر لـــە گـــەڵ یـــارانی
بـــۆ تۆڵـــە ســـەندن هەســـتان بـــە جـــوانی

چـــونکە لـــە کـــاتی کـــۆچ بـــێ شـــەرمانە
ئازاریـــان دابـــوو کەللـــە گەرمانـــە

جـــا ئیمانـــداران ویـــستیان بـــە هـــەر حـــاڵ
دەســـت بوەشـــێنن لـــە کـــوفری ســـەر قـــاڵ

چـــونکە پێغەمبـــەر زانـــی تـــەواوە
لەگـــەڵ (قورەیـــشی) هیـــوا نـــەماوە

کاروانێکیـــــشیان بــــە کـــــەیف و خـــــرۆش
دەگەڕایـــەوە بـــێ هــــۆش و ســـەر ســـەرخۆش

بــــە چــــەند وشـــــتری گرانبـــــەهاوە
لــــە شـــام بــــۆ شـــاری (مەککـــــە) گـــەڕاوە

ئەوســـا پێغەمبـــەر بــــە ویـــستی ئـــــەڵڵا
(ســـەعدی کــــوڕی زەیـــد، تەلحـــەی عەبـــدوڵڵا )

هـــــەردووکی نــــاردن زۆر بــــەڕێك و جــــوان
تــــاکو بــــــزانن هـــــەواڵی کــــــاروان

چــــونکە پێغەمبــــەر ڕێکـــــای دەگــــرتن
تۆڵـــــەی پێـــــشانی لـــــێ وەردەگـــــرتن

جگـــە لـــە تۆڵـــەش دوژمنـــی دیـــن بــــوون
لـــە ژێـــر پێـــی ئیـــسلام هـــەر وەکـــو (مـــین) بــــوون

ئـــیتر بـــەم پێیـــە کـــات هـــات و ســـوڕا
(طلحـــە) و (ســـەعد) چـــوون ، گەیـــشتنە (حـــراء)

لـــــەوێ دابـــــەزین هـــــەردوو جوانەکـــــە
چـــــاودێرییان دەکــــــرد لـــــە کاروانەکـــــە

لـــــەو کاتــــەی کـــــاروان کــــە گەڕایـــــەوە
پێغەمبــــەر زانـــــی هــــەر لــــە خوایـــــەوە

لـــەو ســـاتە فـــەرمووی :- یـــاران ، هـــۆ خەڵکـــە
کـــاروانی دوژمـــن پـــڕ ســـوود و کەڵکـــە

سێ سەد و یازدە ، یاخوود چواردە کەس
چوون بەدەمییەوە ، هەر ئەوەندە بەس

هەر لە ناخەوە کەوتنە ڕێگا
بەرەو مەبەستیان جێگا بە جێگا

(ئەبو سوفیان)یش هەر زوو پێی زانی
کەوا دەگرێ ڕێگای کاروانی

لەو کات دەروونی پڕ لە ڕاڕایە
زانی پێغەمبەر مەبەستی وایە

ڕێیان لێ بگرێ و هەر لە ڕۆیشتن
ماڵیان لێ ببا و خۆشیان بە کوشتن

لێیان پەیدابوو گەلێک مەترسی
لە ڕێگاگرتن هەر دەیانپرسی

جا بێگومان بوون ، کەوا تەواوە
ڕێی کاروانەکە لێیان گیراوە

(ئەبوسوفیان)یش زۆر بە ناچاری
(ضمضم بن عمرو )ی سازدا بۆ کاری

ڕازی دەکات بە کرێ و بە پارە
تا بۆ (مەککە) بات ئا ئەم هاوارە

لە پێناو پارە کابرای غەداری
بردی بۆ (مەککە) بانگ و هاواری

وتـــی :- ئـــەی هـــاوار بۆچـــی بـــێ دەنگـــن
کاروانتـــــان تێـــــچوو ، ئەگـــــەر نەجـــــەنگن

جـــا ڕقـــی هەســـتا (ابـــو جهـــل)ی بـــەد
وتـــی :- ســـەد هـــاوار لـــەبۆ (موحەممـــەد)

ئەوســـــا وەك هـــــاران کەوتـــــە کارســــازی
قورەیـــــشی هانـــــدان بـــــە بانگـــــەوازی

هەستانەســــــەرپێ خـــــەڵکێ یـــــەکجار زۆر
لـــە خۆیـــان بەســـتی چـــەکی جۆراوجـــۆر

وەك جـــاران لەســـەر نـــەزانی ســـوور بـــوون
دژ بـــە پێغەمبـــەر زۆر ڕق ئەســـتوور بـــوون

ســـەرۆکەکانیان کـــەس نـــەمان لـــەماڵ
بـــەرەو مـــردن چـــوون بـــە شـــیر و مـــەتاڵ

(ابـــو لهـــب)ی پـــیس ، ئـــەو بـــەدکارە
یـــەکی لـــەجێگای خـــۆی نـــارد بـــەپارە

ئـــەوەی لـــە جێگـــای چـــوو ، نـــاوی (عـــاص)بـــوو
وەك (ابـــو لهـــب) خـــۆی ، خوانـــەناس بـــوو

نۆســـــەد و پـــــەنجا کەســـــی بێبـــــاوەڕ
خۆیـــان چـــەکدارکرد ، لـــەماڵ چـــوونەدەر

ســـەد ئەســـپ و حەوســـەد وشـــتریان پـــێ بـــوو
بـــۆ ســـەماکردن ژنیـــشی لـــێ بـــوو

موسـڵمانانیش بەمـە نـازانن
کـافران بـەم جـۆرە لـە هەوڵـدانن

بـە ژمـارە کـەم بـوون ڕیـزی خواناسـان
بـەڵام هـەر خـودا کـار دەکـات ئاسـان

ئـەو هێـزە کەمـە هـەر بـە دوو ئەسـپ
حـەفتا وشـتر و کـەمێك لـە قەسـپ

ئەوەنـدە سـوارە بـەدوو ئـاڵای ڕەش
دوو ئـاڵای بـەرزی شـکۆدار و گـەش

کـاتێ کـە سـەروەر بیـستی هـەواڵیان
هـاتوون لـە بـۆ شـەڕ لـە پێنـاو ماڵیـان

کـافر نزیکـەی یـەك هـەزار کـەس بـوون
خۆشـیان زۆر کـەم بـوون بـەڵام هـەر بـەس بـوون

هـەر چـەند نـەهاتبوون بـە نیـازێکی وا
بجـەنگن لەگـەڵ دوژمنـانی خـوا

بـەڵام دڵسـۆزی پـەروەردگار بـوون
دەبـوا بجـەنگن ، چـونکە ناچـار بـوون

(بـاوکی عائیـشە) و (عومـەر)ی بـەڕێز
وتارێکیـان دا پـڕ لـە وورە و هێـز

(میقـداد بـن عـەمر) ئـەویش هـەروەها
سوپاسـی کـردن پێغەمبـەری خـوا

پێغەمبــــەر زۆرى كــــرد پــــرس و ڕاوێــــژ
بــــە مــــژدە زامــــى ورەى كــــرد ســــارێژ

فــــەرمووى :- ئــــەى يــــاران ئێــــوە چ دەڵــــێن؟
پێــى خــۆش بــوو (ســەعد) پێــى بــدات بــەڵێن

(ســــعد بــــن معــــاذ) وتــــى :- پێغەمبــــەر
ئێمــــە لــــە گــــەڵتاين بــــە مــــاڵ و بــــە ســــەر

ئەوســــا پێغەمبــــەر لاى ئــــەما پەســــتى
هــــەر ئــــەو بــــوو ، چــــونكە نيــــاز و مەبەســــتى

(مــــصعب) و (عــــەلى) و (ســــەعد) هەرســــێكى
ئاڵايــــان وەرگــــرت بــــە ڕێــــك و پێكــــى

جــــا بــــە هــــەر هــــۆيێ پێغەمبــــەر زانــــى
چــــەندە ژمــــارەى دوژمنــــەكانى

(ئەبوســــوفيان)يــــش وا بــــە ڕاكــــردن
كــــاروانى دەركــــرد لــــە ترســــى گــــرتن

مەبەســــتى يــــاران كــــاروان بــــوو لێــــرە
گەرچــــى لــــە دەســــتيان دەرچــــوو ئــــەو خێــــرە

ئــــەو شــــتەى خــــەڵكى پێيــــوە ســــەرقاڵە
لــــە لاى خوداوەنــــد پــــووچ و بــــە تاڵــــە

چــــونكە خــــواى گــــەورە دەيويــــست لــــەو شــــوێنە
چاوشــــكێن بكــــا كــــوفرى بــــێ وێنــــە

ئەوســــاكە (عوتبــــە) بــــە قــــسەى خــــەڵكى زيــــر
تــــا شــــەڕ نەقــــەومێ كەوتــــە ڕا و تــــەگبير

وتی :- خەڵکینە بگەڕێنەوە
کاروان ڕزگار بوو شەڕ مەنێنەوە

کوژرانی ئەوان خەمێکی تاڵە
یان ئامۆزایە یان کورە خاڵە

(ئەبوجەهل)ی پیس کە بیستی ئەمە
زۆر بە شانازی و قاقای بە گەمە

وتی :- وا هاتووین ناگەڕێینەوە
سێ ڕۆژ لە (بەدر) دەمێنینەوە

وشتر سەردەبڕین ئافرەتیش بۆمان
با سەما بکەن بۆ کەیفی خۆمان

با دوژمنانیش ئاوا بەم جۆرە
بزانن کەوا چەند هێزمان زۆرە

دەڵێن خەڵکانێك بە پاڕانەوە
(بەنی زەهری) بوون ئەو گەڕانەوە

بەڵام قورەیشی بێ شەرم کردن
گرتیان ڕێگای مەیدانی مردن

هێزی خواناسی یەکلا ببووەوە
لەو دیوی بەدر هەڵیان دابووەوە

لەسەر مردن و شەهیدی سوور بوون
بەڵام لە مەیدان لە جێ ئاو دوور بوون

بــــەیانی هەســــتان گـــەلێك دامـــاو بـــوون
زۆر ســـەرگەردانی یـــەك قـــومێ ئـــاو بـــوون

بەشـــی هـــەرە زۆر چـــونكە پـــیس ببـــوون
بـــەهۆی (إحـــتلام) پـــووت و ســـیس ببـــوون

خـــوا بـــارانی نـــارد لـــەو كاتـــە هەنـــدێك
پـــڕی كـــرد لـــە ئـــاو چـــەند شـــیو و كەنـــدێك

جـــا ســـوپاس بـــۆ خـــوای بـــەرز و بـــێ وێنـــە
پـــڕی كـــرد لـــە ئـــاو هـــەموو ئـــەو شـــوێنە

ئـــیتر یارەكـــان هەســـتان دەســـت و بـــرد
پێویـــستییەكانی خۆیـــان تـــەواو كـــرد

دوژمنـــانیش زۆر پەشـــێو بـــوو حاڵیـــان
لیتـــە و ئـــاوی زۆر چـــووە نـــاو ماڵیـــان

بـــە فـــەرمانی خـــوا بـــارانی بـــەپێز
كافرەكـــانی كـــرد شـــپرزە و بـــێ هێـــز

(حبـــاب بـــن منـــذر) وتـــی :- پێغەمبـــەر
جێمـــان خراپـــە ســـەرداری ســـەروەر

ئەگـــەر بـــە فـــەرمان هاتوویتـــە ئێـــرە
گومـــانی نیـــە كـــەوا پـــڕ خێـــرە

ئەگـــەر ڕای خـــۆت بـــێ ئـــەی بیلبیلـــەی چـــاو
ئـــاوا باشـــترە بڕۆینـــە لای ئـــاو

گەر بێت و ئێمە بڕۆین بۆ ئەوێ
هێزی دوژمنان پەکیان دەکەوێ

چونکە بە بەردان دەگرین بیری ئاو
چیان پێ ناکرێ دوژمنی داماو

سەروەریش فەرمووی :- ڕایەکەت جوانە
دەبین بە بەر بەست بۆ ئەو کافرانە

پەسەندی کرد و زۆر بە دڵخۆشی
چوون بیرەکانیان بە بەرد داپۆشی

هەموو ئامادە و چەك لە ناو دەستان
لە سەر بیرەکان گورج ڕاوەستان

لە سەر گردێکیش یارانی بە سەنگ
بۆ سەروەریان کرد کەپرێکی قەشەنگ

بۆ ڕوانینی بە سەر جێگای جەنگ
خۆی وەکو گوڵ بوو یارانیشی هەنگ

مردن نزیك بوو لە کوفری سەرقاڵ
گەڕانەوەیان زەحمەتە بۆ ماڵ

با کەمێ بازدەین بڕۆینە پێشی
تاکو خوێنەران سەریان نەیەشی

قورەیشی کشان بۆ جەنگ بە هەر حاڵ
شمشێریان کێشا و هەڵیان گرت مەتاڵ

یـــەکێکیان لـــە وان نـــاوی (ئەســـوەد) بـــوو
زۆر کەللـــە پـــووچ و شـــەڕاوی و بـــەدبوو

ســـوێندی خـــوارد وتـــی :- دەبـــێ ئـــەم ئـــاوە
وەخـــۆم ، خوێنیـــشم بـــڕژێ لـــەم نـــاوە

لـــە نـــاو کافرەکـــان دەرهـــات بـــە پەلـــە
دە ســـەیری بـــاز کـــەن دژ بـــە ئـــەو قەلـــە

بـــە دەســـتی (حـــەمزە) دەســـت بـــە جـــێ کـــوژرا
خـــوێنی گـــلاَوی لەوســـات ڕێـــژرا

لـــە دوای کوشـــتنی (ئەســـوەد)ی نـــەگریس
هاتنـــەوە مەیـــدان ســـێی تـــری زۆر پـــیس

(وەلیـــد) و (عوتبـــە) ســـێیەمیان (شـــەیبە)
بـــێ دەنـــگ بونیـــان زۆر بـــە لاوە عەیبـــە

لـــە شـــەرمان هاتنـــە مەیـــدانی مـــردن
ســـێ کەســـبوون داوای ســـێ کەســـیان کـــردن

(عـــەوف) و (مەعـــاذ) و (کـــوڕی ڕەواحـــە)
وەکـــو نـــەڕە شـــێر دەرچـــوون بـــۆ ســـاحە

بـــەلاَم کافرەکـــان پێـــی نـــەبوون ڕازی
لـــە گـــەڵیان بکـــەن شـــەڕ و گیـــان بـــازی

بـــەو ســـێیانەیان وت :- ناتـــان کـــوژین
ئێـــوە گونـــاهن بـــۆ خۆتـــان بـــژین

وتیـــان :- (موحەممـــەد) ســـێی تـــر بنێـــره
تـــاکو لاشـــەیان بخەینـــە ئێـــره

ســـێی تـــر بنێـــره لـــە خزمـــی خۆمـــان
تـــاکو لاشـــەیان بخەینـــە مەیـــدان

(حـــەمزە) و (عوبەیـــدە) لـــە گـــەڵ (عـــەلی) پـــاك
هاتنـــە نـــاو مەیـــدان وەك شـــێری بێبـــاك

هەرســـێ کافرەکـــان بـــە کـــاتێکی کـــەم
خـــوێنی گلاّویـــان هـــات لـــە لـــووت و دەم

لاقـــی (عوبەیـــدە)ش هـــەر لـــەو گیـــان بـــازی
بـــڕاوە گەیـــشت بـــە ســـەر فـــرازی

ئـــیتر کافرەکـــان هەســـتان بـــە جـــاریٚ
بـــە ســـەر خواناســـان ڕژانـــە خـــواریٚ

ســـەرومەریش فـــەرمووی :- ئـــەی یـــاران هەســـتن
هـــەر چـــەندە زۆرن لێیـــان مەترســـن

ئامۆژگارییـــەکی زۆر جـــوانی کـــردن
هـــەر ســـەرکەوتنە شـــەهیدی و مـــردن

ســـەیری دەکـــردن هێزیـــان چـــەند زۆر بـــوو
چـــەك و تفاقیـــان زۆر جۆراوجـــۆر بـــوو

ئەوســـا پێغەمبـــەر بـــەرزی کـــرد دەســـتی
فـــەرمووی :- ئـــەی خوایـــە کـــێ دەتپەرســـتی

گەر ئەم یارانە بمرن ، نەمێنن
خەڵکانێك نابن ناوی تۆ بێنن

هێندە بەرزی کرد دەستی بۆ ئاسمان
تاکو کەوتە خوار عەبای لەسەرشان

پێیانوت :- بەسە ئەی پێغەمبەرمان
نزات گیرا بوون ئەی تاجی سەرمان

(ابو بکر)یش ئەویش ئەو کەسە
پێی وت :- ماندووبووی دانیشە بەسە

پێغەمبەر فەرمووی :- مژدە بۆ ئێوە
یارمەتی خوایی وادێ بەرێوە

ئەوسا هەڵیگرت مشتێ خۆڵ و خاك
دای بەناو چاوی دوژمنی ناپاك

بە هاوکاری خوا ئەم مشتە خۆڵە
بوو بە چەکێك بۆ سەندنی تۆڵە

جا راستیویستان وەکو نەڕەشێر
تەختی دوژمنیان کردە سەرەو ژێر

چەند سەرکردەی پیس کوژران و مردن
چاونەترسانە لەناویان بردن

ئەو نەزانانە بە نەفامانە
داریان دەپەرست بەبێ شەرمانە

(عبـــــــدالرحمن) وەك بـــــــارانی پـــــــەڵێ
ســـــلاوی لـــــێبن ئـــــەو پێمـــــان دەڵـــــێ

دوو لاوی شـــــەرکەر وەك شـــــێری برســـــی
هەریەکـــــە و بـــــەجیا لـــــە منیـــــان پرســـــی

کـــــوا (ابـــــو جهـــــل) ، کامەیـــــە مامـــــە ؟
ناپناســـــین ئێمـــــە ئـــــەو کـــــار حەرامـــــە

منـــــیش راســـــتەوخۆ زوو بەدەســـــتوبرد
پێـــــشاندان و دەستنیـــــشانم کـــــرد

کـــــاتێ کـــــە پرســـــیم لـــــەو هـــــەردوو لاوە
وتیـــــان :- جنێـــــوی بـــــە ســـــەروەر داوە

ئەوکاتـــــە هـــــەردووك وەکـــــو نەڕەشـــــێر
هـــــەڵیان کوتایـــــە ســـــەری بـــــە شمـــــشێر

هەرچـــــەندە خـــــەڵکی زۆری لـــــەلا بـــــوون
بـــــەلام هـــــەردوو لاو مـــــەردی خـــــودا بـــــوون

بـــــە مـــــاوەکی کـــــەم خوێنیـــــان بـــــەجارێ
لـــــە دەم و لـــــوتی هێنایـــــە خـــــوارێ

لـــــە ریـــــزی کـــــوفر (حـــــەفتا) کـــــەس کـــــوژرا
خـــــوێنی گلاویـــــان لـــــە مەیـــــدان رژا

حەفتاشـــــیان وەکـــــو دیـــــل و دەســـــت بەســـــەر
کەوتـــــە ژێـــــر دەســـــتی ســـــوپای پێغەمبـــــەر

پیشەی کافران بوو بەرپاکردن
مەیدانیان چۆڵ کرد لە ترسی مردن

موسڵمانانیش تەنها چوواردەکەس
بەرزبوونەوە بۆ لای خودا ، بەس

لەوکاتە ناسکە سوپاس بۆ خودا
سەرکەوتنی وای بە پێغەمبەردا

تەرمی جێماوی دوژمن بەهەرحاڵ
خۆڵی خرا سەر ، خرایە ناو چاڵ

بەویستی خودا بردنەوەی (بەدر)
وەك دڕکی لێهات بۆ چاوی غەدر

ڕاستی وەکو شێر دەرچوو لە بێشە
بۆ مستی زۆردار بوو بە درێشە

مژدە و مزگێنی بلاوکراوە
کوفر زێرکەوتوو و ئیسلام براوە

گشت موسڵمانان بەمە دڵخۆش بوون
دوژمنەکانیش پووت و خامۆش بوون

دەستکەوتی جەنگیش ئیتر بەش کرا
دوژمنانی خواش ڕوویان ڕەش کرا

جا گەڕانەوە بەرەو مەدینە
شکۆدارتر بوو ئاڵای ئەو دینە

پێغەمبـــەری خـــواش هـــەر لـــەو کاتـــەوە
دەربـــارەی دیـــلان بـــیر دەکاتـــەوە

راوێـــژکاری کـــرد بـــە هـــاوەڵانی
ســـڵاوی خـــودا لـــەروح و گیـــانی

(ابـــوبکر)یـــش دژ بـــە ســـەرگەرمان
فـــەرمووی :- واباشـــە دەربکـــەی فـــەرمان

گەرچـــی ئەوانـــە لێمـــان بێـــزارن
خزمـــی نـــزیکن ، گـــشت کـــەس و کـــارن

باشـــە لەوانـــە تۆڵـــە بـــستێنی
منـــەتیان بەســـەردا ببـــارێنی

مەبەســـتی ئـــەو بـــوو ئەمـــە بـــێ چـــارە
ئازادیـــان بکـــا بـــەماڵ و پـــارە

پێغەمبـــەری خـــواش وەك کێـــو بەســـەنگ بـــوو
لـــە ئاســـت ئـــەو رایـــە کـــەمێك بـــێ دەنـــگ بـــوو

پاشـــان ڕوی کـــردە (عومـــەر)ی دلێـــر
تـــا ئـــەویش بڵـــێ رایـــەکی بـــەخێر

(عومـــەر)ی مـــەردیش ڕاســـت و ڕەوان بـــوو
چـــاونەترس بـــوو زۆر پاڵـــەوان بـــوو

فـــەمووی :- ئەوانـــە سەرشـــێتی مەســـتن
دوژمنـــی دینـــی خـــوای باڵادەســـتن

بــــه هـــــەموو جــــۆری ، لـــــه هــــــەموو لاوه
هـــــــــەوڵی نـــــــــەمانی ئێمـــــــــەیان داوه

هەرچـــــــەنده ئێـــــستا دیــــــل و دامـــــــاون
بــــــەڵام لەگـــــــەڵمان گــــــەلێك جــــــەنگاون

جـــــا ئــــــەی پێغەمبــــــەر ئاوایـــــــه ڕای مــــــن
فـــــــەرمان دەربکـــــــەی ئەوانــــــــه بمــــــرن

پـــێم باشـــــه ، هیـــچیان لــــه ژیـــان نـــــەمێنن
لەســــــــەر ڕێــــــی ڕاســـــتی درك دەڕوێـــــنن

بــــــــەڵام خەڵکەکــــــــه زۆر بەئاســــــــانی
ڕای (ابـــــو بکــــــر)بـــــه چـــــاکیان زانــــــی

لـــــــەو دەم و کاتــــــەش یــــــەك لەدیلــــــەکان
شــــوێن کــــــەوتووی هــــەوا و زوڕنـــــای فیلــــەکان

وتـــــــی :- پێـــــــنج کــــــچم عــــــازەب و لاون
بــــــەبێ کــــــەس و کــــــار لــــــەماڵ جــــێ مــــاون

جـــــا ئــــــەی (موحەممـــــــەد)مــــــن هیــــــوادارم
تکــــــــــام وەرگــــــــــره ، زۆر تاوانـــــــــــبارم

گــــــەر ئـــــــازادم کــــــــەی بـــــــەڵێنم وابــــــێ
دژت ناجــــــــــەنگم تـــــــــاژینم مـــــــــابێ

پێغەمبــــــــەری خـــــــواش ئـــــــازادی دەکـــــــات
چـــــــونکه بـــــــــەزەیی زۆری پێــــــــدا هـــــــات

نــــاوی ئــــەو كەســــە (ابـــو عـــزە)بـــوو
بـــەلاّم كەســـی پـــیس قـــەت دانـــانی خـــوو

لـــە جـــەنگی (ئوحـــود)وەك جـــاری پێـــشا
دژ بـــــە خواناســـــان شمـــــشێری كێـــــشا

وەكـــو لەمـــەو بـــەر دیـــل دەكرێتـــەوە
گیـــانی لـــە لاشـــەی جیـــا دەكرێتـــەوە

ئەوســـا پێغەمبـــەر فـــەرمووی :- وا چـــاكە
ســامـانـدارەكـــان بـــە تاكـــە تـــاكە

چـــوار هـــەزار درهـــەم لـــەبۆمان بێـــنن
ئـــازادی خۆیـــان وا بەدەســـت دێـــنن

ئـــیتر دەســـت بـــەجێ خـــەڵكی بـــە پـــارە
خۆیـــان ئـــازادكرد هەســـتان بـــەم كـــارە

بـــەلاّم خـــەڵكانی بـــێ پـــارە و ســـامان
كەوتنـــە ژێـــر بـــاری پـــەژارە و دامـــان

ئـــەم داماوانـــەش گـــشت خوێنـــدەوار بـــوون
گەرچـــی رێبـــواری رێبـــازی تـــار بـــوون

پێغەمبـــەری خـــواش بـــە بـــەردەوامی
لـــە كۆشـــش دابـــوو دژ بـــە نـــەفامی

بۆیـــە بـــەوانی فـــەرموو پێغەمبـــەر:-
دەكـــرێ ئـــازاد بـــن بـــۆ خۆتـــان ئەگـــەر

هەرکەسە و (دە) کەس فێرکەن بخوێنن
ئازادی خۆتان جیا بەدەست دێنن

ئیتر دیلەکان هەستان دەست بەکار
یەکە و (دە) کەسیان کردە خوێندەوار

لە دوای فێرکردن ئازادیان کردن
چوونەوە سەر باو بێ شەرم کردن

هەرچەندە بیر و ڕای (ابوبکر)
سەروەر و یاران ڕایان هاتە سەر

بەس جوانترین ڕا ڕاکەی عومەر بوو
کە خودای گەورەش ویستی لەسەربوو

# دەرکردنی جوولەکەی (بنو قنيقاع)

جوولەکـــــەی (بنـــو قنيقـــاع) مەســـت بـــوون
بـــە بـــونی ئيـــسلام دامـــاو و پەســـت بـــوون

دەجـــــەنگان دژی رێبـــــازی چـــــاکە
پيـــسترين کـــەس بـــوون لـــە ســـەر ئـــەم خاکـــە

کـــاتێ خـــەڵکانی خـــوا ويـــست و دڵـــسۆز
لـــە شـــەڕی بـــەدری ســـەربەرزی و پـــیرۆز

ســـەرکەوتن بەســـەر کـــافری نـــەفام
وەدەســـتيان هێنـــا دەســـەڵات و ســـام

لـــەوکات جوولەکـــە دژی ئـــەو دينـــە
بـــە جـــارێ پڕبـــوون لـــە رك و کينـــە

ئـــا لـــەو ئيـــسلامە پـــاك و بێگـــەردە
رەخنـــەيان دەگـــرت بـــێ پـــەناو پـــەردە

پيـــسترين کەســـيان (کـــەعب ) بوونـــاوی
هەڵـــە بەڕاســـتی دەبـــينی چـــاوی

لـــەناو مەدينـــە دەژيـــان ئەوانـــە
وەکـــو شەمـــشەمەکوێرەی شـــەوانە

زۆر دژی رێگـــای پێغەمبـــەری بـــوون
ســـەرقاڵی زێـــڕ و ئاســـنگەری بـــوون

خـــاوەنی تيفـــاقی جـــەنگ بـــوون
بۆيـــە بـــەو جـــۆرە بـــە قـــسە و دەنـــگ بـــوون

شـــــەڕکەریان هـــــەبوون دەوری حەوســــــەد کــــــەس
لــــە نـــــاو جوولەکــــە ئــــەو ئـــازا بـــوون بـــەس

ئـــیتر دەســـــتیان کـــــرد بــــە دەســــت درێـــــژی
هــــــەر مــــــابوو بیکــــــەن کـــــاری خوێنڕێـــــژی

پێغەمبـــــــەری خـــــــواش گیــــــان لەسەردەســـــــتە
هـــــەمووی بـــــانگ کـــــردن بـــــۆ ئـــــەم مەبەســـــتە

فــــــەرمووی :- بـــــزان بـــــۆ ئاگـــــاداری
دووربـــــن لــــــە فێــــــڵ و لــــــە دوژمنکـــــاری

بــــــەڵام بێـــــسوود بــــــوون قـــــسەی بــــــە پێـــــزی
هـــــەر ســــــورتر دەبــــــوون لــــــە شـــــــەڕانگێزی

(ابـــــــن اســـــــحاق)یـــــــش دەگێڕێتـــــــەوە
کـــــــاتێ پێغەمبـــــــەر دەگەڕێتـــــــەوە

لـــــە شــــــەڕی بــــــەدری پـــــیرۆزی بــــــە خێـــــر
کــــە تـــــەختی دوژمــــــن کـــــرا ســـــەراو ژێـــــر

بەباشــــــــی زانــــــــی بــــــچێتە ناویــــــان
بــــــە ڵکــــو چـــــاك بـــــبێ خــــەیاڵی خاویـــــان

فــــەرمووی :- ئــــــەی خــــــەڵکی جوولەکــــــە ئێـــــوە
هەڵـــــسوکەوت مەکـــــەن هــــــەگیز بــــــەو شـــــێوە

بەرلــــــــەوەی ئێـــــــوە بکەونـــــــە نـــــــاو داو
ڕوداوی بــــــــەدر بهێننــــــــە بــــــــەر چــــــاو

ئــــــەوانیش وتیـــــان :- وەك شـــــەڕی بـــــەدر
لـــــە خۆتـــــان مەكـــــەن ســـــتەم و غـــــەدر

لـــــە وانتـــــان كوشـــــتن ئـــــەو چـــــەند منداڵـــــە
ئێمـــــە وەك وان نـــــین ، ئەمـــــە مەحاڵـــــە

ئینجـــــا خـــــوای گـــــەورە هـــــەر لـــــەوبارەوە
ئـــــەم دوو ئایەتـــــەی نـــــاردە خـــــوارەوە

لـــــە دوازدە و ســـــێزە لـــــە (ئـــــالی عیمـــــران)
تـــــا تـــــەمبێ بكـــــرێن جوولەكـــــەی نـــــەزان

ڕۆژێـــــك ئافرەتێـــــك بـــــە بـــــاڵا پۆشـــــی
چـــــۆ بـــــازار هەنـــــدێ زێـــــری بفرۆشـــــی

چـــــونكە جوولەكـــــە ڕەشـــــە هـــــەناوی
داوای لێدەكـــــەن تـــــا دەم و چـــــاوی

بۆیـــــان دەربخـــــا و پێـــــی بكـــــەن وازی
گەرچـــــی ژنەكـــــە نـــــەدەبوو ڕازی

كـــــاتێ كـــــە دانیـــــشت یـــــەكێ چـــــاو برســـــی
كراســـــی ژنـــــەی ئاڵانـــــدە كورســـــی

كـــــاتێ ژنەكـــــە هەڵدەســـــتێ بـــــەتاو
دەسمـــــاڵ و پـــــەڕۆی لاچـــــوو لەســـــەر چـــــاو

ئـــــەو بەدكارانـــــە لـــــەو كـــــات و دەمـــــە
زۆر پێـــــی پێكـــــەنین پێیـــــان كـــــرد گەمـــــە

ئینجا ژنەکە کوردی بە هاوار
بە هانای وەچوو بەکێ بڕوادار

ئەو بڕوادارە چاکە دەنوێنێ
جوولەکەك دەکوژێ و خوێنی دەڕژێنێ

بەلاّم لەوکاتە جوولەکەی ناپاك
ئەویان شەهیدکرد خستیانەسەر خاك

ئەو جوولەکانە هیچ ڕانەوەستان
تاکو ئاگری شەڕیان داگیرسان

ئینجا پێغەمبەر بەبانگەوازی
دژ بە (قنیوقاع)بەرەی فێڵبازی

خۆی کۆکردەوە وەکو هەموو جار
(ابو لبابە)ی دانا لەسەر شار

دای بەدەست (حەمزە) ئالأی ئەو جەنگە
(حەمزە) ی پالّەوان مەرد و بەسەنگە

سەربازانی خوا وەکو بێباکان
گرتیان دەوری قەلاّی ناپاکان

پانزە ڕۆژ درا ئابڵوقەی قەلاّ
تاکو جوولەکەی ڕوو زەرد وەك گەلاّ

بەسەریان داهات خەم و بێزاری
دەپاڕانەوە زۆر بەناچاری

خۆیاندایە دەست بە خەم و پەستی
سەروەریش دەستی هەموانی بەستی

(عبدالله ی کوڕی نوبەی ) لەو دەمە
وتی :- پێغەمبەر دڵم بە خەمە

زۆر چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانانم
هەموو ئەوانە بە چاك دەزانم

پێغەمبەری خواش کەم بۆی دەنۆڕی
هەر جار بە لایەك ڕووی لێ دەگۆڕی

ئەوسا بە ویستی خودای کار نەخشین
ئەو جوولەکانەی هەر هەموو بەخشین

بەڵام بە مەرجێ دەبێ یەکجاری
بار بکەن بچن بۆ دووری شاری

چونکە پێغەمبەر خاوەن تەگبیر بوو
فەرمانی جوانی هەموو جێگیر بوو

زۆر بێ یاخود کەم لە سامان و ماڵ
کەوتە بەردەستی یاران بەهەرحاڵ

ئینجا بە ویستی خوای بێ ئەندازە
سڵاوات بدەن لەو گوڵە تازە

# باسی جەنگی (ئوحد)

قورەیـــــــــشی دۆڕاو هـــــــــەر ڕانەوەســــــــتان
بـــــۆ تۆڵـــــەی (بـــــەدر) شــــێتانە هەســــتان

چـــونکە ئابـڕوویـــــان چووبـــــوو لـــــە (بـــــەدر)
بۆیـــــــــە شــــــــاڵاوی تـــــــاوان و غـــــــــەدر

کۆبـبوونـــــــــەوە بـــــــۆ هێـــــــرش کـــــــردن
تـــــا بـــــە خواناســــــان کـــــەچ بکـــــەن گـــــەردن

زیـــــاد لـــــە ســـــێ هـــــەزار کـــــەس بـــــە ژمـــــارە
تـــــاکو لـــــــەرەگیان دەرکـــــــەن ئـــــــەمجارە

بـــــە سەرپەرشـــــــتی (ابـــــو ســـــــوفیان)ی
ئـــــەو بـــــوو ســـــەرکردەی ســـــوپای نـــــەزانی

ڕەحمـــــــەتی خـــــــودا لەســـــــەر (عـــــــەباس)ی
ئـــــەوکاتیش هـــــەیبوو مـــــەیلی خواناســـــی

نامـــــــەکی نوســـــــی زۆر دوور و درێـــــــژ
نوســـــی مەبەســـــتی قورەیـــــشی ســـــەر گێـــــژ

بـــــە پـــــەنهانی نـــــارد لـــــە بـــــۆ پێغەمبـــــەر
کـــــەوا کـــــافران بـــــۆ جـــــەنگ دێنـــــەدەر

هەرچـــــەند(موحەممـــــەد) نوێنـــــەری خـــــوا بـــــوو
لـــــە تەڵـــــەی دوژمـــــن زۆر بـــــێ ئاگـــــا بـــــوو

کـــــاتێ پێغەمبـــــەر بـــــەم شـــــتەی زانـــــی
هـــــەواڵی دایـــــە گـــــشت یارەکـــــانی

بە یارانی کرد زۆر پرس و ڕاوێژ
چۆن بگرن بەرگەی کافری سەرگێژ

هەرچەند پێغەمبەر پێی خۆش بوو لەشار
بجەنگن دژی دوژمنی بەدکار

بەلاّم هەندێکیان خوێنیان گەرم بوو
جەنگ لە نێو مالآن لایان شەرم بوو

پێغەمبەری خوا و یارانی بەسەنگ
بەسامن وەکو شێری شەوە زەنگ

هەرچەندە یەخەی وا لێ گرتوون جەنگ
دەبێ ڕایماڵن زوو بێ یا درەنگ

ئەوسا کە هەستان لەبۆ بەرگری
هەتا بەرنامەی کوفر سەرنەگری

هێزیان کۆ بۆوە هەر هەزار کەس بوون
بۆ لوت شکانی دوژمنان بەس بوون

هەزاران درود لە پێغەمبەری
دایە دەست (موصعەب) ئالأی کۆچبەری

ئالأی (خەزرەجی)ش دای بە (خەباب)ی
(خەباب)ی بەڕێز (منذر) بوو بابی

ئالأی (ئەوسی ) بوو ئەوەی کە مابوو
درایە (ئوسەید) ، مەردی خودا بوو

کەوتنـــە ڕێگـــا ، بـــەرەو (ئوحـــد) چـــوون
یـــا خـــود ســـەرکەوتن یـــاخود شـــەهید بـــوون

بـــەڵام (عبداللـــە بـــن ابـــی ســـلول)
کـــوفری نـــاو دڵـــی کەوتـــە جولـــەجول

هەرچـــی دوو ڕوو بـــوو وەك ئـــەوی یـــاخی
کـــوفر و ناپـــاکی چـــووبوو بـــە نـــاخی

بڕوایـــان نـــەبوو بـــە خـــوای کردگـــار
بـــۆ کـــێ شـــەڕ بکـــەن ئـــەوانی بـــەدکار

چونکـــە مرۆڤـــی دووڕوو نـــاتوانـــێ
بـــۆ خـــودا گیـــانی لەســـەر دەســـت دانـــێ

لـــەو هـــەزار کەســـە گـــەڕاوە ســـێ ســـەد
بـــە هـــۆی (عبداللـــە)ی بـــێ بـــاوەڕ و بـــەد

تـــەنها ڕێـــی ئیـــسلام ڕێـــك و تـــەواوە
مرۆڤـــی دووڕوو خـــەیاڵی خـــاوە

هەرچـــەندە بـــەهۆی ئـــەوانی دڵتـــار
پەرتـــەیی کەوتـــە ســـوپای بـــڕوادار

بـــەڵام خواوەنـــدی گـــەورە و ئاگـــادار
بـــۆ پێغەمبـــەری نایـــەت نـــاردە خـــوار

ئـــەوهای ڕاگەیانـــد ، وازیـــان لێ بێنـــن
چـــونکە دوو ڕووەکـــان گێـــرە شـــێوێنن

هەرچـــی دوو ڕووبـــوون گـــشت گەڕانـــەوە
خواناســـــی تــــەواو لـــــەوێ مانـــــەوە

ئەوســـا ئـــەوانیش لـــە گـــەڵ پێغەمبـــەر
بـــەرەو ســـەرکەوتن ڕێیـــان گرتـــە بـــەر

گەیـــــشتنە (ئوحـــــــد) زۆر دلێرانـــــــە
ڕوو بـــە ڕووی دوژمـــن وەســـتان شـــێرانە

زۆر لێـــك نزیـــك بـــوون هـــەردوو ســـوپاکە
ســـــوپای دادوەری و دوژمنـــــی چـــــاکە

(ئـــەبو عـــامری)ی فاســـقی ئەوســـی
کـــە کـــەوتبوە دوای ئـــارەزوو و نەفـــسی

پێغەمبـــەری خـــوا ئـــەو نـــاوەی نـــابوو
هـــەر فاســـقیش بـــوو تـــاوەکو مـــابوو

لـــە ســـەر کـــوفر بـــوو نەگەڕایـــەوە
یەکـــەم کـــەس ئـــەوبوو شـــەڕی نایـــەوە

شـــەڕ دەســـتی پێکـــرد ئـــاگر داگیرســـا
چـــەند کەســـێك لەگـــەڵ (عیکرەمـــە) ئەوســـا

ویـــستیان لـــە چـــەپە هێـــرش کـــەن ، بـــەڵام
بـــە بـــەردیان داوە بەرپـــەرچ و وەڵام

لـــەو کـــاتی (حـــەمزە)ی مـــامی پێغەمبـــەر
هـــەر دەچـــوو و دەهـــات لـــەم ســـەر بـــۆ ئـــەو ســـەر

گرمـــەی لـــێ دەهـــات دژ بـــە ئـــەو مـــزە
هـــاواری دەكـــرد دەیگـــوت:- بكـــوژە

لـــە دەســـت (طلحـــە) بـــوو ئـــالآی كـــافران
هـــاواری دەكـــرد :- بـــۆم وەرنـــە مەیـــدان

(زوبـــەیر)ی دلێـــر لـــەو ســـاتی بـــۆی چـــوو
لـــە ناوەڕاســـتی مەیـــدان كوشـــتی ، زوو

(الله اكـــبر) پێغەمبـــەر فـــەرمووی
دەدرەوشـــایەوە وەك مانگـــە شـــەو ڕووی

(حـــەمزە)ی دلێـــریش هـــەروا یـــەكی كوشـــت
كـــاتێ كـــە لێیـــدا دەریكـــرد لـــە پـــشت

لـــە نێوانیانـــا شـــەڕ زۆر گـــەرم بـــوو
ورەی زۆرداران ســـست و نـــەرم بـــوو

یـــەك لـــەدوای یـــەكی نۆیـــان لـــێ كـــوژران
تـــەرمی گلاویـــان مـــاوە لـــە مەیـــدان

ئـــەو ملهوڕانـــە بـــێ شـــەرم كـــردن
دەهـــاتن یـــەك یـــەك بـــە پـــیری مـــردن

(ســـەواب)ی (حەبـــەش)وەكـــو بەســـتەزمان
دوازدەمـــین كـــەس بـــوو ، هاتـــە نـــاو مەیـــدان

هـــەلگری ئـــالآی كـــوفر بـــوو هـــەمان
كەوتـــە بـــەر نـــوكی شمـــشێری (قـــەزمان)

بـــــە هاوکـــــاری خـــــوای ڕاگـــــری ئاسمـــــان
وا دەکـــــەین باســـــی (حـــــەمزە)ی پاڵـــــەوان

وەکـــــو بڵێـــــسە و گڵپـــــەی ئـــــاگر بـــــوو
لـــــە کـــــاتی هەڵمـــــەت زۆر خـــــۆڕاگر بـــــوو

خـــەڵکان بـــەهۆی جـــەنگ گـــەلێ ســـەرقاڵ بـــوون
لـــە بـــەر نزیکـــی مـــەرگ بـــێ حـــاڵ بـــوون

بـــە نـــاوی (وەحـــش) یـــەك لـــە کـــافران
لـــە پـــەنای خـــەڵکی هاتـــە نـــاو مەیـــدان

تـــا شـــەهید بکـــا حـــەمزەی پاڵـــەوان
خـــۆی ڕزگـــار بکـــا لـــە بەنـــدەی بەنـــدان

دڵ و دەروونـــی پـــڕ لـــە تـــرس بـــوو
چـــونکە کوشـــتنی (حـــەمزە) قـــورس بـــوو

ئەگـــەر شـــەهید کـــا (حـــەمزە )لـــە هـــەرکات
گـــەورە و مەزنەکـــەی ئـــازادی دەکـــات

جـــا ئەگـــەر (وەحـــش) بکـــا ئـــەم کـــارە
(هینـــد) یـــش پێـــی دەدات ســـامان و پـــارە

ســـەرقاڵی شـــەڕ بـــوو (حـــەمزە) بـــەبێ بـــاك
(وەحـــش) خوێنەکـــەی ڕژانـــدە ســـەرخاك

گـــەر ســـەخت نـــەبا زام و برینـــی
(وەحـــش)یـــش ڕێـــك وەکـــو ئـــەو خـــۆی دەبینـــی

بەنـــدەی (جوبـــەیر)ی (مـــوطعم) بـــوو ئەمـــە
ڕۆژی ڕونـــاکی کـــردە ئـــەو تەمـــە

(حــــەمزە)ی پاڵـــەوان ڕەحمـــــەت لـــــە گــــۆڕی
بــــــە ڕاســـــــتی پەنــــــدن داســــــتانی زۆری

(ئــــەبو دوجانــــــە)ش لاوێـــــك بـــــوو تــــازە
مـــــەردبوو لـــــە ڕوویـــــان بـــــە بـــــێ ئەنــــدازە

دەســـــــەسڕی ســـــوور بەســــــتبووی لــــــە ســــەر
بــــــە شمـــــــشێرەکەی تیــــــژی پێغەمبــــــەر

هــــــەڵی کوتایــــــە نــــــاو ڕیــــــزی پیـــــسان
گرمـــــــەی لێـــــدەهات وەك (هــــــەوری نیــــسان)

وەکـــــو پڵنگــــــی لێ هـــــات بـــــە جـــــاری
ئــــــەوەی لێــــــی دەدا دەکەوتــــــە خــــــواری

دوژمنــــــی بــــــەزیو لــــــە ترســــــی مــــــەرگ
دونیـــــای لێ ببــــوو بــــە کــــونی گــــورگ

بــــــە پــــــشتیوانی خــــــودای تـــــەنیا و تــــاك
ئــــاڵای قورەیــــشی تێکــــەڵ بــــوو بــــە خــــاك

کــــە ســــەرکەوتنیان بــــۆ هـــــات لــــە خـــــواوە
دوژمنــــــی بـــــەدکار بـــــۆ پـــــاش گـــــەڕاوە

ســــــوپای خاناســـــــان لەســـــــەرکەوتن بــــــوو
تــــــەنها هــــــەڵاتن بەشـــــی دوژمــــــن بــــــوو

کاتێـــــك ســـــــەرکەوتن هێـــــزی خواناســـــان
چـــــوون کۆکەنـــــــەوە دەســــــتکەوت و ســـــامان



تـــیر ئەنـــدازەکان چـــونکە یـــەك دەســـت بـــوون
لـــە پـــێش کافرەکـــان وەکـــو بەربەســـت بـــوون

وەســـــتابوون لـــــە ســـــەر ســـــەری کەژەکـــــە
دژ بـــــە بێــــبڕوا و یـــــاخیبووی (مەککـــــە)

چـــونکە پێغەمبـــەر پێـــی دابـــوون فـــەرمان
کەژەکـــــە بگـــــرن دژ بـــــە بـــــێ شـــــەرمان

پێیـــــدابوون فـــــەرمان هـــــەرگیز کۆڵنـــــەدەن
تـــــا دواهەناســـــە جێگـــــا چـــــۆڵ نەکـــــەن

پێیـــــانی فـــــەرموو :- مەشـــــکێنن فـــــەرمان
نـــــەوەك زاڵـــــببن دوژمـــــن بەســـــەرمان

بـــــۆ ئێـــــوە نـــــابێ ، ســـــوپا بـــــشدۆڕێ
جێگاتـــــان بـــــەردەن نیازتـــــان بگـــــۆڕێ

بـــــەڵام کافرەکـــــان چـــــاك کۆڵییـــــان دابـــــوو
چـــەندین گـــەلێك ســـامانیان لـــێ بـــەجێ مـــابوو

خواناســـــان وتیـــــان :- چـــــی بکـــــەین لێـــــرە ؟
ســـــامان کـــــۆکردن چـــــاکتر و خێـــــرە

هەنـــــدێکیان وتیـــــان :- بوەســـــتن جـــــارێ
بـــــۆ پەلەدەکـــــەن ، بـــــۆ دەچـــــنە خـــــوارێ ؟

بـــــرا گـــــەورەیان کـــــە (عبـــــدالله) بـــــوو
لـــــە ژێـــــر فـــــەرمانی (رســـــول الله) بـــــوو

(عبـــدالله)ی بـــەرێز لــــە بـــۆ ئــــەو خەڵکــــە
وتـــــارێكی دا ، بـــــــەڵام بــــــێ كەڵکـــــە

گێويـــــان بــــە جێهێـــــشت بـــــەرەو گۆڕەپــــان
بـــــۆ کـــــۆکردنی دەســــــتکەوت و ســــامان

گـــەر دەرنەچـــووبان لــــە قـــسەی ســـەروەريان
هـــــەرگيز شکــــــستی نەداتـــــــە ســــــەريان

بــــــە (عبـــــدالله) و (دە) کـــــەس مانـــــەوە
بۆيـــــــە دوژمنـــــــان ســــــووك گەڕانــــــەوە

(خاليـــــد)ی (وەليـــــد) ئـــــازابوو گـــــەلێك
چـــــاوەڕێی دەکـــــرد بڕەخـــــسێ هـــــەلێك

خـــوا ويـــستی وا بـــوو ڕەخـــسا ئـــەو هەلـــە
بـــــەرەو کەژەکـــــە هــــاتن بــــە پەلــــە

کـــــەمی لــــێ مـــابوون بۆيـــە بـــە ناســـان
کەوتـــــە ژێـــــر دەســـــتی خودانەناســــــان

قورەيـــــشی دۆڕاو بــــێ شـــــەرم کـــــردن
هاتنـــــەوە مەيـــــدان بـــــۆ هێـــــرش بـــــردن

موســـــڵمانەکان سەرســــــام بــــــوون لەمــــە
چـــونکە نـــەما بـــوو ئـــەم مـــز و تەمـــە

دەســـــتيان دايـــە چـــەك بـــۆ هەڵمـــەت بـــردن
دژ بـــە هێرشـــيان ، يـــان مـــان ، يـــان مـــردن

وەرەی خواناســــان لەوســـــات و وەختــــــی
لـــە نزمــــی دابــــوو بـــە تونــــد و ســـەختی

کــــەس بــــە کەســــەوە نــــەبوو لــــەو کاتــــە
چــــونکە ســــەخت بــــوو ئــــەو کارەســــاتە

خواناســــێك لــــەو کــــات نــــاوی (یــــەمانی)
بــــە بتپەرســــت و کافریــــان زانــــی

گــــەمارۆیان دا هەرچــــەندە یــــار بــــوو
ڕێبــــواری ڕێگــــای پــــەروەردگار بــــوو

کــــوڕێکی هــــەبوو نــــاوی (حــــذیفــــە)
وتــــی :- باوکمــــە مــــەیکوژن حەیفــــە

زۆر هــــاواری کــــرد ئــــەو لاو بــــەو ڕەنگــــی
بــــەڵام خواناســــان نــــەیان بیــــست دەنگــــی

بــــە هەڵــــە کوشــــتیان لــــەو کــــات ئــــەو مــــەردە
چــــونکە گــــەر وره نــــەمێنێ دەردە

ســــلاو لــــە گیــــانی (حــــذیفــــە)ی دلێــــر
خــــوێنی بــــاوکی خــــۆی وەرنــــەگرت بــــە خێــــر

(موصــــعەب)ی (عــــەمر)یــــش ئــــالا هەڵگــــر بــــوو
لــــە ڕەنــــگ و ڕوخــــسار وەك پێغەمبــــەر بــــوو

(ابــــن قیمئــــە) بــــۆی چــــووە پێــــشی
چــــونکە لــــەدڵی هــــەبوو نەخۆشــــی

شـــــەهیدی کـــــرد ئــــــەو ئالأهــــــەلگرە
وای لـــــێ حــــاڵی بــــوو ، کــــە پێغەمبــــەرە

ئەوســـــاکە پــــڕ بـــــەدەنگ ڕایدەگەیــــــەنێ
گــــشت خــــەڵکی بــــە درۆ تێدەگەیــــــەنێ

کــــــە موســــــڵمانان بیــــــستیان دەنگــــــی
چــــوونە ژێــــر بــــاری خــــەم و دڵتــــەنگی

هــــــەموویان دامــــــان بێهێـــــز و پــــــەرۆش
بــــــەڕەنگی کــــز و تــــۆزاوی و خــــامۆش

ئەگــــــەر ئــــــەو نــــــەما چــــۆڵە (مەدینــــــە)
کــــێ دەبێتــــــە ســــــەرقافڵەی ئــــــەم دینــــــە؟

(ئەنــــــەس)ی (نــــــذیر) دەهــــــات لــــــەولاوە
دیتــــــی ئــــــەو خەڵکــــــە هــــــەمووی دامــــــاوە

وتــــی :- ئــــەی (عومــــەر) ، ئــــەی (طلحــــە) هەســــتن
نــــازانم ئێــــوە لەســــــەر چــــی پەســــتن؟

بــــــــە پەرێــــــــشانی وەڵامیــــــــان داوە
وتیــــــان :- پێغەمبــــــەر شــــــەهید کــــــراوە

(ئەنــــەس) پێــــی وتــــن :- گــــەر ئەمــــە ڕاســــتە
ئــــەی بــــۆ بــــێ دەنگــــن ئێــــوە لــــەم ئاســــتە؟

باشــــــترە بۆتــــــان لــــــەم ژینــــــە مــــــردن
نــــــەوەك بــــۆ دوژمــــن کــــەچ بکــــەن گــــەردن

بۆچی وا خۆتان خامۆش کردووە؟
بمرن بۆ ئەوەی ئەو بۆی مردووە

خوا لێی ڕازی بێت بەمەی زۆر نێشا
بۆ هەڵمەت بردن شمشێری کێشا

خۆی کوتا ناویان وەك شێر بە مەردی
زۆر کەسی بە دەم خستەسەر عەردی

بەڵام شەهید بوو ، حەفتا برینی
لە لاشەی گران لە پێناو دینی

هەمووی زامدار بوو لاشەی ئەو گەنجە
کە ناسیانەوە بە سەری پەنجە

بەڵام وا نەبوو ، پێغەمبەر مابوو
وەك کەژی (ئوحد) ڕەگی کوتابوو

بە خۆڕاگری گرتبووی سەنگەر
بە فیدای تۆ بین ڕابەری سەروەر

لەوکات دوژمنان وەك شێتوهاران
بۆ سەر پێغەمبەر چوون بە بەرد باران

لەو کات و ساتی (عوتبە)ی سەرسەری
توند بەردێکی گرت لە پێغەمبەری

ددانی پاکی لێ شکاند بە بەرد
بەڵام خۆی گوزرا و تەرمی کەوتە عەرد

(ئـــیبن قەمیئـــــە) کـــــوفری هـــــۆش بــــــەتاڵ
پێغەمبـــــەرمانی زۆر کـــــرد پەشـــــێو حـــــاڵ

ئـــــەویش بـــــەردێکی دا لـــــە ڕووی شــــاکار
ئەڵقـــــەی زرێکـــــەی بـــــە ڕووی بردەخــــوار

پێغەمبـــــەری خـــــوا بینـــــی زۆر ئـــــازار
لەدەســـــــت کـــــافرانی بێـــــبڕوا و زۆردار

ئەگەرچـــی (ئـــەبو ســـوفیان)یـــش لـــەو کـــات
لـــە نـــاو تەرمـــەکان هەردەچـــوو و دەهـــات

دەســـــوڕایەوە بـــــۆ ئـــــەوەی بـــــەڵکی
بزانـــــێ ڕاســـــتە هـــــاواری خـــــەڵکی

چـــونکە بیـــستبوی لـــە دەنـــگ و باســـان
کـــەوا کـــوژراوە گـــەورەی خواناســـان

(ئوبەییـــەی خەلـــەف) ئـــەویش وەك نـــەزان
پیـــسی بـــێ هۆشـــی هـــەروا بـــێ ئیمـــان

هـــۆش و ژیریەکـــەی لـــە ســـەر فـــڕی بـــوو
بـــۆ یـــە وڵاخـــێ باشـــی کـــڕی بـــوو

مەبەســـــتی وا بـــــوو ئـــــەو شـــــەرمەزارە
لەســـەر ئـــەو ئەســـپە بکـــا ئـــەو کـــارە

کـــە شـــەهید بکـــا پێغەمبـــەری خـــوا
کـــە ســـەروەر بیـــستی بـــەمجۆرە دوا

فەرمووی :- دەیکوژم گەر خودا یار بێ
گەر پشت و پەنام پەروەردگار بێ

ئەو سەرشێواوە دوژمنی خوا بوو
وادیاربوو کەمێك تەمەنی مابوو

دژ بە پێغەمبەر ئەوسا چووە پێش
زۆر بێ سەنگیش بوو وەکو ڕەشەمێش

پێغەمبەری خواش ڕمێکی لەو وەخت
خشاند لە ملی (ئوبەییە)ی سەر سەخت

هەر کە پێی کەوت وەك (گا) بۆڕاندی
لە هەردوو دونیا تێچوو ، دۆڕاندی

وەك بیستومانە ، لەمە بەولاوە
بەدەست پێغەمبەر کەس نەکوژراوە

موسڵمانانیش کە حەسانەوە
دوبارە بەرەو کەژ گەڕانەوە

(خالید بن وەلید) لەگەڵ چەند پیسان
بینیان بەرە و کەژ هاتەوە دیسان

تیر ئەندازەکان بەڵام بە یەك دەست
لە ڕوویان وەستان وەك قەڵا و بەربەست

کەخۆی گرتەوە سوپای پێغەمبەر
دوژمنی شێواو سامی کەوتەسەر

کــــەمێکیان چــــێژا تــــامی شکــــستی
چــــوونە ژێربــــاری بــــێ هێــــزی و ســــستی

لایــــان بــــوو تــــەرمی گــــشت کوژراوەکــــان
تــــەرمی شــــەهیدە خــــوێن ڕژاوەکــــان

بیریــــان کــــردەوە کەللــــە گەرمــــەکان
کــــە ناشــــیرین کــــەن ســــەرجەم تەرمــــەکان

(هینــــد)ی خێزانــــی (ئــــەبو ســــوفیان)ی
کــــە هێــــشتا مــــابوو لــــە ڕێــــی شــــەیتانی

بــــە دەســــتی (حــــەمزە)ی دەروون و دڵپــــاك
کەســــێکی زۆری چــــووبوونە ژێرخــــاك

بۆیــــە لــــە (حــــەمزە) خەفــــەت و داخــــی
هێنــــدە زۆر ببــــوون ، چــــووبوون بــــە نــــاخی

کــــردی کــــارێکی زۆر جــــەرگبڕی
ســــکی پــــیرۆزی (حــــەمزە)ی هەڵــــدڕی

جــــەرگی دەرێنــــا و ویــــستی کــــە بیخــــوات
تــــاوەکو کینــــەی لــــە دڵــــدا بــــڕوات

لەگــــەڵ تەرمەکــــەی کــــردی بــــەدکاری
جــــەرگی پــــیرۆزی خــــستە نــــاو زاری

زۆری هێنــــا و بــــرد ، تــــا بیخــــوا جــــەرگی
هەرچــــەند هــــەوڵی دا ، نەچــــووە قــــوڕگی

لـــــەدوای ئـــــەو كــــارە كـــــوفری داخ لـــــە دڵ
كوژراوەكانيـــــان خــــــستنە ژێـــــری گــــــڵ

بـــــە پـــــەژارە و خـــــەم بـــــە دامانـــــەوە
مەيـــــدانيان چــــۆڵ كـــــرد جـــــا گەڕانـــــەوە

ئەوســــــا ســــــەروەر و گـــــشت يارەكـــــانی
چــــوون بـــــەرەو تــــەرمی هاوەڵـــــەكانی

بينـــــی وا (حـــــەمزە) ســـــك هەڵــــدڕا بـــــوو
لـــــە نـــــاو ســـــكيدا جـــــەرگ نـــــەمابوو

كـــــە بينـــــی تــــەرمی مـــــامی بـــــەڕێزی
چــــووە ژێـــــر بــــاری خـــــەم و بێهێـــــزی

فـــــەرمووی :- بـــــەڵێن بـــــێ بڕەخـــــسێ هـــــەلێك
تۆڵـــــە بـــــە تۆڵـــــە و زيـــــاتريش گـــــەلێك

گـــــەرخوا بيـــــەوێ تۆڵـــــە دەســـــتێنين
حـــــــەفتا جەســـــتەيان لێ دەشـــــێوێنين

لـــــەو دەم و كـــــاتی خـــــودای بـــــالآ دەســـــت
دەربـــــارەی كـــــوفری بێـــــدينی سەرمەســـــت

نيگـــــای نـــــاردە خـــــوار بـــــۆ ســـــەر پێغەمبـــــەر
لـــــە گـــــەڵ دوژمنـــــان كردنـــــان ئەگـــــەر

نابـــــێ ستـــــەم كـــــەن وە نابـــــێ بۆتـــــان
نابـــــێ پێـــــشێل كـــــەن ســـــنووری خۆتـــــان

بەلام باشترە گەر بيانبوورن
هەرچەندە مەستن لە ڕاستی دوورن

پێغەمبەر لە سەر تۆڵەی گەرم بوو
کاتێ نايەت هات ، دڵی نەرم بوو

حەفتا خواناسی بالاّ وەك نەمام
بە دەست دوژمنی بێهۆش و نەفام

دونيايان جێهێشت بەرەو خودای تاك
لە پێناو دينی پڕ بەزەيی و پاك

ئەوسا پێغەمبەر فەرمووی :- وا چاکە
ياران ماندوو بوون لەبەر هەراکە

شەهيدان دوو دوو سێ سێ بە جۆرێك
بيانننێژن و بخەنە گۆڕێك

لاشەی شەهيدان ئيتر ناشتيان
نەمامی ئيسلام بە خوێن داشتيان

خوايە گيان ئێمەش لە گەڵيان لەوسەر
ئاو بخۆينەوە لە حەوزی (کوثر)

# ڕووداوی (ڕەجیع)

ئەوانـــــــەی کـــــــەوا دڵیـــــــان ناپاکـــــــە
خراپـــــەکارن لەســـــەر ئـــــەم خاکـــــە

بیردەکەنـــــەوە بـــــە تـــــاك و بـــــە کـــــۆ
ڕاســـــــتی لەناوبـــــــەن ، ســـــــەربخەن درۆ

بـــــا ســـــەیرێ بکـــــەن لـــــەم ڕابـــــردووە
ئـــــاخۆ ئەوانـــــە چـــــیان کـــــردووە

خـــــەڵکێك لـــــە بـــــەرەی (هـــــوزەل) و (قـــــارە)
چـــوونە (مەدینـــــە) لـــــە بـــــۆ ئـــــەم کـــــارە

چـــوونە خزمـــــەتی گـــــەورەی ئـــــەم دینـــــە
کەچـــی هـــــەناویان پـــــڕ بـــــوو لـــــە کینـــــە

وتیـــــان :- پێغەمبـــــەر ئێمـــــە دوو هـــــۆزین
خـــــاوەن بـــــەڵێن و پـــــەیمان و ســـــۆزین

کـــــە لـــــەم دوورەوە هاتووینـــــە ئێـــــرە
مەبەســـــتمان کـــــاری خواویـــــستی و خێـــــرە

کـــــام یـــــارت زۆر لـــــە دیـــــن شـــــارەزایە
بینێـــــرە ، نیازمـــــان ناســـــینی خوایـــــە

ســـــەروەریش دەیویـــــست جـــــا بـــــە هـــــەر حـــــاڵێ
دەســـــتی خێرخـــــوازی تێیـــــان بنـــــاڵێ

هـــــەموو مەبەســـــتی خێـــــر و چـــــاکە بـــــوو
چـــــاکترین کەســـــی ســـــەر ئـــــەم خاکـــــە بـــــوو

دەست نیشانی کرد شەش یاری بەڕێز
شەش بڕواداری بە توانا و بەهێز

(عاصم)ی کوڕی (ثابت) لەو خێرە
بوو بەسەر کردەی ئەم دەستە شێرە

(خوبەیب) و (خالید)لەگەڵ(زەید)ی پاك
(عبداللە)لەگەڵ(مورسەد)ی بێباك

سەروەر بژاردی ئەو هەر شەش یارە
تا بڕۆن ، بکەن ئەو چاکە کارە

نەشیاندەزانی کە کۆتا جارە
دەمرن بەدەست ئەو خەڵکە زۆردارە

گەیشتنە (ڕەجیع) بۆ سەر ئاوەکە
دەکەوتە نێوان (عەسفان) و (مەککە)

هەموویان لەوێ ڕاوەستان تاوێ
تا بخۆنەوە لە بیران ئاوێ

بەرەی (لحیان)یش وەکو گورگی هار
خۆیان چەکدار کرد ، دەوری سەد سوار

بە شمشێر و تیر کەوتنە شوێنیان
تا دەم و دەستیان سورکەن لە خوێنیان

خوداناسانیش بە یەك دڵ و دەست
ئەوێیان جێ هێشت بۆ شوێنی مەبەست

گەیشتنه شوێنێ به ناوی (فەدفەد)
بێ ئاگا بوون له ناپاکانی بەد

ئینجا بۆ پشوو وەستان له شوێنێ
تا ماندووبوونیان لەلا نەمێنێ

بەرەی (لیحیان)یش بەبێ مەترسی
دەوریان لێدان وەك گورگی برسی

وتیان گەر ئێوه بەدەست و هۆشن
چەكتان دانێن و شەڕیش مەفرۆشن

لەگەڵ ئێوەشدا بەڵێن دەبەستین
له دژی ئێوه بە شەڕ ناوەستین

شەش كەس و سەد كەس كەی وەك یەك وایه؟!
سەد كەس سەد چەكیان لەدەستی دایه

(عاصم)یش فەرمووی :- ئەمه مەحاڵه
شەرت و بەڵێنتان درۆ و بەتاڵه

بۆ خۆ و دوو یاری هێرشیان كردن
تاكو شەهید بوون ، حەوت دوژمن مردن

هێشتا نەوەد و سێ كەس هەر مابوون
هەر هەموو یاخی و دوژمنی خوا بوون

(زەید) و (خوبەیب) و (عبدالله)ی بەڕێز
بەدیلیان گرتن نەیان بوو هیچ هێز

بــــەڵام (عبداللــــــە) وتــــــی :- زۆر شـــــەرمە
دەســـــتی كــــافران زاڵ بــــێ بەســــەرمە

دەســـــتی كردنـــــەوە زۆر بــــــە پــــــەنهانی
بــــەڵام كافرەكــــان كـــــە پێیـــــان زانـــــی

بــــە بــــەرد و بــــەدار دەیخەنـــــە ســـــەر خــــاك
دەبێتـــــە شــــەهید بــــۆ خــــوای بــــەرز و تــــاك

هـــــەروەها (زەیــــــد) و (خوبــــــەیب)ی دڵــــسۆز
ئــــــەمانیان بــــردن بــــۆ (مەككــــــە)ی پــــیرۆز

لـــــە (مەككـــەیی)انــــیش زۆر كــــەس كــــوژرا بــــوو
بـــــە دەســـــت موســــڵمان خوێنیــــان ڕژابـــــوو

گـــــەر بۆیـــــان ببـــــوا ، زەحمـــــەت ، یــــان ئاســــان
دەیـــــان خــــــواردەوە خــــــوێنی خواناســــــان

(صـــــــەفوان)ی كـــــوڕی(ئومەیـــــــە) وابـــــوو
بەدەســــــت خواناســــــان بـــــاوكی كــــوژرا بــــوو

بــــــەماڵ و پــــــارە (زەیـــــــد) ئەســـــێنێ
تــــا تۆڵــــەی بــــاوكی لــــە ئــــەو بســــتێنێ

(حــــارث)ی بــــاوكی (عوقبــــە)ش كـــوژرا بــــوو
بـــــۆ دۆزەخـــــی خــــوا ڕەوان كـــــرا بــــــوو

ئــــەویش(خوبــــەیب)ــــی كڕیــــەوە بــــەماڵ
لــــە تۆڵــــەی بــــاوكی ژیــــانی بكــــا تــــاڵ

(خوبـــەيب) يـــاری خـــوا و پێغەمبـــەر بـــوو
لـــەماڵی (عوقبـــە) دەســـتی لەســـەر بـــوو

بـــاوەڕی گـــەرم و تونـــد و بـــەتينی
وەكـــو دەرمـــان بـــوو لـــە ژيـــان و ژينـــی

منـــداڵی ئـــەو مـــاڵ لـــەوكات بـــە خرۆشـــی
(خوبـــەيب)ی بينـــی خـــۆی كوتـــا كۆشـــی

لـــەو كـــاتی دايكـــی ئـــا ئـــەو منداڵـــە
نـــاو دڵـــی پـــڕ بـــوو لـــە تـــرس و ناڵـــە

لـــە داخـــان گيـــانی هاتـــە گـــەردنی
نـــەوەك (خوبـــەيب) بـــەر لـــە مردنـــی

ئـــەو منداڵـــەيان لێ بخنكێنـــێ
بـــەر لـــە مردنـــی تۆڵـــە بـــستێنێ

دايكـــی كـــە ديتـــی ئـــەو جگـــەر گۆشـــە
لـــەلای (خوبـــەيب)ە و زۆريـــش دڵ خۆشـــە

(خوبـــەيب)يـــش لـــەو كـــات پرســـی لـــەو داكـــە
پێـــی وت :- لەبەرچـــی دڵـــت خەمناكـــە؟

بـــە هەڵـــە داچـــووی شـــتی واناكـــەم
پـــەروەردەی دەســـتی ئـــەو دينـــە پاكـــەم

ئينجـــا شـــالأوی ڕەشـــی زۆرداران
ڕووی كـــردە (زەيـــد)ی هـــەروەكو هـــاران

نزیـــــك بوونــــــەوە لـــــــەوی بــــــرپوادار
تــــــا لـــــــە داری دەن ئــــــەوی چـــــاکەکار

دوو دەســــــــتەکانی لێ بەســــــــترا بـــــــوو
(ئەبوســـــوفیان)یـــش لـــــەلای وەســــتا بـــوو

وتـــــی :- ئـــــەی (زەیـــــد) حەزناکـــــەی نایـــــە
(موحەممــــــەد) ئێـــستا لـــــە جێـــی تـــۆ بایـــە؟

تـــۆش لـــــە ماڵـــت بـــای لـــــە نـــاو منـــداڵت
نەبەســــــــــترابا دوو دەســـــــــت و باڵــــــــت

(زەیـــــد)یـــش بـــــەوی وت :- حەزناکـــــەم هـــــەرگیز
بـــــــەهۆی یـــــــەك درك ســـــــەروەری ئــــــازیز

بنـــــی پێـــــی بێـــشێ و منـــیش لـــــە مـــــاڵ بم
ئاوێتـــــــەی کـــــەیف و شـــــەوقی منــــــداڵ بم

(ئەبوســـــــوفیان)یـــــش لــــــەوکات و دەمــــــە
گـــــەلێك سەرســـــام بـــوو ، کـــــە بیـــستی ئەمــــە

وتـــــــی :- لـــــــە دونیـــــا گــــــەڕاوم زۆر زۆر
بینیـــــومن گـــــەلێ گـــــەورەی جـــــۆرا و جـــــۆر

نەمـــــــدیوە خـــــــەڵکی وەکــــــو ئەوانــــــە
لـــــە بـــــۆ (موحەممــــــەد)چـــــەند بەوەفانــــــە ؟!

ئـــــیتر ئەوانـــــــەی مەســـــت و ســـــــەرگێژن
خوێنـــــــە ئاڵەکـــــــەی (زەیـــــــد) دەڕێــــــژن

کــــە گیـــانی ئەســـپارد (زەیـــــد)ی دەروون پـــاك
بـــوو بــــە میـــوانی خـــودای بـــەرز و تـــاك

ئـــیتر(خوبـــــەیب)ی لــــــە مــــاڵ دەردێــــنن
تــــاکو کۆتـــــای بــــە ژیــــانی بێــــنن

(ئەبوســـــوفیان)یـــش وەك چـــۆن لەمــــەو بــــەر
لەگــــەڵ (زەیــــد)ی کــــرد باســـــی پێغەمبـــــەر

کـــە پێـــــی وت :-(زەیـــــد) حەزناکـــــەی ئایـــــە
(موحەمـــــەد) ئێـــستا لــــە جێـــی تـــۆ بوایـــە؟

لــــەلای (خوبــــەیب)یـــش هـــەمان قـــسەی کــــرد
(خوبـــەیب)ی مــــەردیش هـــەر بەدەســـت و بــــرد

وەڵامــــــــــی داوە زۆر بــــــــــەبێ بـــــــاکی
دەم کــــوتی کـــــردن هــــــەموو بــــە چـــاکی

ئینجــــا کــــــە وتـــــی بــــەوانی خـــــوێن ڕێــــژ
لـــــێم گــــەڕێن بکــــەم دوو ڕەکــــەعات نوێـــــژ

ئــــەو کـــات بمکـــــوژن چــــۆنتان مەبەســـــتە
چــــی دەکــــەن ، منتـــــان وا لەبـــــەر دەســــتە

ڕێگایــــــان پێـــــــدا ئــــــەوانی ســــــەرگێژ:-
ئــــەویش بــــۆ خـــوای کـــرد نوێـــژێکی درێـــژ

کـــە نوێـــژ تـــەواو بـــوو ، چــەند قـــسەی کـــردن
وتـــــی :- ئـــــەك بڵــــێن لـــــە ترســـی مـــــردن

دەمێنێتەوە ئا لەم نوێژە
نەك زۆرتر دەبوو ئەم وتو وێژە

ئیتر هێنایان هەردوو پێ و دەستی
بێ ویژدانانە توندیان لێ بەستی

هەزاران سڵاو لەو خودا ناسە
بەرلەوەی بدا کۆتا هەناسە

فەرمووی :- ئەی خوایە تۆ ئاگاداری
چیمان لێ دەکەن کوفر و زۆرداری

یەك یەك بزمێرە و بیان فەوتێنە
بە پێغەمبەریش ڕابگەیەنە

کەوا یارانی هەمر هەموو مردن
بە ناپاکی و فێڵ لە ناویان بردن

داواکاریشم لە تۆی بەرز و تاك
سڵاوم ببەی بۆ سەروەری پاك

خواوەندی گەورەش دڵی ناشکێنێ
پێغەمبەری خۆی تێدەگەیەنێ

# ڕوداوی (بیری مەعونە)

لـــــە دوای ڕوداوی (ڕەجیـــــــع ) ، دووبـــــــارە
ڕوودەداتــــــەوە دیـــــــسان ئــــــەم کـــــارە

ببیـــــــــنن ڕۆژی بـــــــــیری (مەعونـــــــــە)
ئـــای لـــــەم تاوانــــە چـــەند زەق و ڕوونــــە؟!

بـــــەناوی (عـــــامر) ، وەکــــو لەمـــــەو بــــەر
هاتـــــــە مەدینــــــــە بــــــۆلای پێغەمبـــــــەر

وتـــــی :- ئـــــەی ســـــەروەر بیرمـــــان ڕووناکــــە
حەزدەکـــــەین فێـــــربین لـــــە کـــــاری چـــاکە

بروامـــــــان بــــــەخوا و بـــــە تـــــۆ بەتینــــــە
تـــــازە هاتووینـــــــە نـــــاو ئـــــەم ئاینـــــــە

ئەگـــــەر بنێـــــری چـــــەند کەســـــی زانــــــا
وەکـــــو مامۆســــــتا لــــــە بـــــۆ ناومانـــــــا

ئەگەرچـــــی (عـــــامر)کەســـــێکی چـــاك بـــــوو
لەگـــــەڵ خواناســــان مەبەســــتی پـــاك بـــــوو

بــــــەڵام زۆر خـــــــەڵك لـــــــە دەوروبـــــــەری
دەجـــــــەنگان دژی خـــــــوا و پێغەمبـــــــەری

ســــــەروەریش فـــــەرمووی ، نـــــەك لەوكاتـــــەوە
ڕووداوی (ڕەجیـــــــــــع) ڕوویداتــــــــــــەوە

(عـــــامر)یـــــش وتـــــی :- بـــــە هـــــەموو هێـــــزم
پـــــــــــەنایان دەدەم ، دەیانپـــــــــــارێزم

ئینجـــا پێغەمبـــەر بـــە نیـــازی خێـــرێ
چــــل کەســـی زانــــا و دانــــا دەنێـــرێ

هــــەمووی ڕێبـــواری ڕێگـــای قورئــــان بـــوون
پـــاك و خـــاوێن و نـــەرم و نیـــان بـــوون

هــــەموویان یـــەك یـــەك قورئـــان لەبـــەر بـــوون
خــوانــاســـی پـــاك و دڵ بـــەخـتـــەوەر بـــوون

بـــــەڵام ناپاکـــــان دەکـــــەن ناپـــــاکی
دەجــــــەنگن دژی خـــــــۆر و ڕونـــــــاکی

بـــەر لـــەوەی بگـــەن بەشـــوێنی مەبەســـت
هـــەموویان کوشـــتن بەیـــەك هێـــز و دەســـت

لـــەو چـــل خواناســـە هـــەر یـــەکیان مـــابوو
ئـــەویش زۆر چـــاکەی لـــە چـــاویان دابـــوو

ئــــەویش هاتــــەوە بــــەدڵ پەرۆشـــــی
لـــــەداخی یـــــاران نـــــەیمابوو خۆشـــــی

ئـــەم بەســـــەرهاتەی کـــــە گێڕایـــــەوە
پێغەمبـــــەر لـــــە خـــــوا زۆر پاڕایـــــەوە

نزیکـــــەی مانگێـــــك تـــــەواو بـــــۆ ئـــــەوان
(قـــنـــوت)ی دەخـــوێـــنـــد لـــەنـــوێـــژی بـــەیـــان

## دەرکردنی جوولەکەی (بنو نضیر) لە (مەدینە)

ئـــەو جوولەکانـــەی لـــە نـــاو مەدینـــە
بەرامبـــەر ئیـــسلام پـــڕ بـــوون لـــە کینـــە

تـــــوانج و پـــــلار و تەشـــــەر و تانـــــە
زۆریـــــان لـــــێ دەدان بـــــە بـــــێ شـــــەرمانە

بـــە چـــاوی ســـوك و زۆر بـــەها هـــەرزان
(مەعونـــــە) و (رەجیـــــع) وەبیریـــــان دێنـــــان

لـــــە و دوو شـــــوێنانە زۆر یـــــاری بەســـــەنگ،
بـــە ناپاکانـــە کوژرابـــوون ، بـــێ جـــەنگ

فێـــڵ و تەڵەکـــەبازی خوویـــان بـــوو
ســـەرومریش کـــاری زۆر لـــە ناویـــان بـــوو

چـــونکە پێـــشتری یـــەك لـــە یـــارانی
دوو پـــەنا دراوی کوشـــت بـــە نـــەزانی

بـــۆ کـــۆکردنی تۆڵـــەی ئـــەو خوێنـــە
پێغەمبـــەر دەچـــێ لـــەبۆ ئـــەو شـــوێنە

هاوڕێیانیـــشی (عـــەلی) و (عومـــەر) بـــوون
هـــەردوو دڵـــسۆزی زۆر بەختـــەوەر بـــوون

لـــەوکات جوولەکـــە و خـــەڵکی موســـڵمان
لەگـــەڵ یـــەك دەژیـــان وەکـــو هاوپـــەیمان

بـــەڵام ناپاکـــان دەکـــەن ناپـــاکی
ســـەیرە ، سەیرشـــی دەکـــەن بـــە چـــاکی

پێغەمبەری خواش بە سەر فرازی
چۆ ناویان ، لێشی کرا پێشوازی

بەڵام لەو کاتی گەیشتە ناویان
زۆر بێ ئاگا بوو لە فێڵ و داویان

جێیان بۆ دانا لەتەنیشت دیوار
هەتا ئەنجام دەن گڵاوترین کار

پێغەمبەر دانیشت لەگەڵیان لەوێ
بۆیانی باس کرد ئەوەی دەیەوێ

جوولەکەی (بنو نذیر) ی سەر فاڵ
هەر سەرزارەکی بێ بوون پێخۆشحاڵ

وە لەو لاشەوە ئەوانی سەر گێژ
دژ بە پێغەمبەر دەیانکرد ڕاوێژ

تاوەکو خۆی و دەستوور و باوی
بەیەکجار هەمووی ببەن لەناوی

(عومەر)ی (جەحجاش) وەکو نامەردێ
لەگەڵ خۆیدا برد بۆ سەربان بەردێ

تاکو لەسەرومر بدات ئەو بەردە
چونکە ئەوانە دڵیان پڕ دەردە

ئاواتە خواز بوون نەمێنێ یەکجار
بەڵام پەنای بوو خودای کردگار

(ســــەلام)یـــش وتـــی :- وامەکــــەن شــــێتن
شــــتی زۆر خــــراپ بەســــەرتان دێــــتن

هــــەر پێــــی دەزانــــێ ، خــــودا یاریــــەتی
سەرپــــشکی هــــەموو ئــــیش و کاریــــەتی

بەرلــــەوەی دوژمــــن پــــیلان بنــــوێنی
پێغەمبــــەری خــــوا هەســــتا لــــە شــــوێنی

چــــونکە خواوەنــــدی گــــەورە و کردگــــار
پێغەمبــــەری خــــۆی زوو کــــرد ئاگــــادار

کــــاتێ کــــە هەســــتا ســــەرداری ســــەروەر
بــــەرەو (مەدینــــە) ڕێگــــای گرتەبــــەر

ئــــەو جوولەکانــــە گــــەلێك نــــەفام بــــوون
بۆیــــە بــــە چــــوونی ســــەروەر سەرســــام بــــوون

پێغەمبــــەر کــــاتێ چــــووەوە شــــاری
بــــە ویــــستی خــــودای پــــەروەردگاری

موســــڵمانانی هــــەر هــــەموو کــــۆکرد
باســــی پیلانــــی جوولەکــــەی بــــۆ کــــرد

ســــەلامی لــــێ بــــێ پــــڕ بــــەم زەمینــــە
دەریــــان دەکــــاتن لــــە نــــاو مەدینــــە

یــــەکی نــــارد ، پێیــــان ڕابگــــەیێنێ
جوولەکــــەی بــــەدکار بارکــــات ، نــــەمێنێ

نـــاوی ئەويـــشيان هـــەر (موحەممـــەد) بـــوو
دوژمنـــی كـــاری جوولەكـــەی بـــەد بـــوو

كـــاتێ (موحەممـــەد) گەيـــشتە ناويـــان
لـــە بـــەرناپاكی هەڵنـــەهات چـــاويان

ئينجـــا (موحەممـــەد) وتـــی :- ئـــەی خەڵكـــە
پاكانـــە كـــردن ئـــەمڕۆ بـــێ كەڵكـــە

هـــەردەم ســـەرقاڵی ئـــاژاوە و فـــێڵن
دەبـــێ بـــار بكـــەن ، ئێـــرە جێبـــێڵن

بـــە قـــسەی پێغەمبـــەر هاتوومـــە ئێـــرە
تـــا (دە) ڕۆژی تـــر باربكـــەن لێـــرە

وتيـــان :- (موحەممـــەد) ، ئـــەی كـــوڕی (ســـەلمە)
بەڕاســـتی بـــۆ تـــۆ شـــورەيی و شـــەرمە

چـــونكە خزمێكـــی لێهـــاتوو و ژيـــر بـــووی
خـــاوەن هەڵويـــست و گـــەلێ ڕاو بـــير بـــووی

بۆچـــی لـــەو خەڵكـــە تـــۆ ئـــەم هەواڵـــە
بۆمانـــــت هێنـــا پـــڕ ئـــاه و ناڵـــە

كەوتـــە جموجـــۆڵ جوولەكـــە ، ئـــيتر
نـــابێ لـــە قـــەڵا بمێـــنن چـــيتر

جـــا بـــە ناچـــاری ڕايـــان هاتـــە ســـەر
لـــە قـــەڵاكانيان باركـــەن ، بـــچنەدەر

بەلام (عبدالله)ی (ئوبەیە)ی بەدکار
خەبەری دانێ دووڕووی شەرمەزار

پێی وتن :- شەرمە هەرگیز بار مەکەن
شەریان لەگەڵ کەن پشت لە شار مەکەن

پەیمانیش دەدەین، کە پشتتان دەگرین
خۆم و دووهەزار تاوەکو دەمرین

هەرچەند جوولەکە بەو دووزمانە
هەرگیز نەیان بوو بڕوا و متمانە

(حەی کوڕی ئەختەب) سەرۆکی وان بوو
کەللە ڕەقێکی سووك و نەزان بوو

وتی :- گەر وابێ ، بە ڕاستی چاکە
لە دەستمان ناچێ بستێ قەلاکە

ڕای هاتە سەر جەنگ ئەو خوا نەناسە
وتی :- هەر نارۆین تا دوا هەناسە

ئیتر لەو کاتە (حەی)ی کەللە ڕەق
ئەو هەواڵەی نارد بۆ ڕابەری حەق

وتی :شەڕ دەکەین بە هەموو شێوە
قەلا چۆل ناکەین هەرگیز بۆ ئێوە

پێغەمبەری خواش بە لەسەرخۆیی
ڕاوەستا ، تا ئەو (دە) ڕۆژە ڕۆیی

پاشـــان خـــۆی لـــە گـــەڵ یـــارانی ئـــەوکات
هـــەڵیان گـــرت چـــەکی هەڵمـــەت و خـــەبات

ئەوســـا پێغەمبـــەر (عەبـــدولا)ی یـــاری
بـــۆ ســـەر پەرشـــتی جێهێـــشت لـــە شـــاری

(عـــەلی) ئـــامۆزای پێغەمبـــەری خـــوا
بـــوو بـــە هـــەڵگری بەیـــداغی بـــڕوا

چـــوونە ســـەریان و ئابڵۆقـــەیان دان
پـــانزە ڕۆژی ڕێـــك بـــەمجۆرەی خایـــان

خواناســـان هـــەموو هێزیـــان خـــستە کـــار
هـــیچ نـــەکرا لەگـــەڵ جوولەکـــەی زۆردار

دانیـــان نـــەهێنا بـــە ڕاســـتی و حـــەقی
هەرســـووربوون لـــە ســـەر ناپـــاکی و ڕەقـــی

ســـەرومەریش باغیـــان لێ دەســـوتێنێ
تـــاکو هیوایـــان کـــەمێك نـــەمێنێ

کـــە ئەمـــەی بینـــی جوولەکـــەی بـــێ دیـــن
دڵیـــان کـــزەی کـــرد ، زۆر پێـــی بـــوون غـــەمگین

وتیـــان :- (موحەممـــەد) کـــەی ئەمـــە کـــارە؟
بـــۆ دەیـــسوتێنی ئـــەم ڕەز و دارە؟

خەریکـــە دڵمـــان ببوڕێتـــەوە
کـــاری وا لـــە تـــۆ ناوەشـــێتەوە

خوداش لە جیاتی گەورەی گشت بەشەر
پێنجەمین ئایەت لە سووەی (حەشر)

ئەم ئایەتەی نارد لە بۆ پێغەمبەر
تا دەمکوت بکات جوولەکەی بەدفەڕ

ئەوسا داوایان کرد لە پێغەمبەر
ڕێگایان بدات بارکەن ، بچنەدەر

پێغەمبەر ڕێگای پێدان بە شەرتێك
نابێ چەك ببەن تەنانەت کەرتێك

هەر بە سێ کەسیش وشتر و بارێ
تووشی ملکەچی هاتن بەجارێ

وایان بە سەر هات ، چونکە گلاو بوون
بەم شێوە ، ئیتر پەرت و بلاو بوون

بەلام لە ناویان دوو کەس بە چاکی
هاتنە سەر ڕێگەی ئیسلام بە پاکی

دەسا ئەی خەڵکان باش بیانناسن
جوولەکە بە خراپ شایستەی باسن

بەرامبەر بە خوا و بە پێغەمبەران
گەلێك دڵڕەشن ، نییانە ئیمان

# بوختان کردن بە (عائیشە)

باسـی بوختـانی خـەڵکانی شـێواو
بـۆ ڕاسـتی ویـستان دەخەینـە بـەر چـاو

بوختانیـان هەڵبەسـت بـۆ( عائیـشە) خـان
بـۆ داوێـن پـاکی دایکـی خواناسـان

ئـەو دڵ پیـسانەی دڵیـان مـردووە
وتیـان :- ( عائیـشە) (زینـا) کـردووە

بـەلام ئـەی خـەڵکی لێـزان و ئـازیز
دەریـا بـە دەم سـەگ پـیس نـابێ هـەرگیز

بۆئـەوەی بوختـان ڕوون ببێتـەوە
خـاتوو (عائیـشە) دەگەڕێتـەوە

دەڵـێ :- پێغەمبـەر ڕەحمـەتی خـوا بـوو
لـە گەشـت و لـە جـەنگ ڕەوشـتی وا بـوو

لـە نێـوان هـەموو خێزانـەکانی
تـیر و پـشکێکی دەکـرد بـە جـوانی

نـاوی هـەر کاممـان دەرچـووبا ، دەچـووین
بـە ژیـن و مـردن هـەر لـە گـەڵی بـووین

بـەرەی (موسـتەلەق) هـەر تێدەکۆشـی
تـا لای خواناسـان نـەمێنێ خۆشـی

پێغەمبـەری خـواش بـە شـەڕ چـۆ سـەریان
تـا ڕێگـای ڕاسـتی بگرنـە بـەریان

لــەو تــیر و پــشکە لــە بــۆ ئــەو جەنگــە
نــاوی مــن دەرچــوو ، هــەروا بــەم ڕەنگــە

کــەژاوەم هــەبوو لــە بــۆ ســواری
لەگــەڵ ســەروەر و زۆر دۆســت و یــاری

لــە شــەڕی ئــەوان دەهاتینــەوە
بــەدڵێکی پــڕ ورە و تینــەوە

شــەوێك لــە ڕێگــا خــستمان لــە شــوێنێ
تــا مانــدوو بوودمــان لــەلا نــەمێنێ

شــەو زۆر تاریــك بــوو ، ئەنگوســتە چــاوە
منــیش هاتمــەدەر لــەناو کــەژاوە

بــۆ کــاری تایبــەت چــوو بــووم بــەولاوە
زانــیم ملوانکــەی جــوانم نــەماوە

تــا دۆزیمــەوە بــەو شــەوە تــارە
پێغەمبــەری خــوا و ئــەو هــەموو یــارە

باریــان کردبــوو لــەم شــوێنە و نــاوە
کەســیش نەچــوو بــوو بــەلای کــەژاوە

ئــەو تەمەنــەی کــە لــەو کاتــە هــەم بــوو
ســێزدە ســاڵان بــووم ، کێشیــشم کــەم بــوو

وایــانزانیبوو مــن هــەر لــەو نــاوم
هەســت بــەمن ناکــەن ، کــە بــەجێ مــاوم

منـــيش درێـــژ بـــووم هـــەر لـــەو شـــوێنەوە
دەمـــــــوت :- بـــــە دوامـــــــدا دەگەڕێنـــــــەوە

(صـــەفوان)ی کـــوڕی (موعتـــەل)يـــش لـــەوکات
ئـــەويش جـــێ مـــابوو لـــە دوای لەشـــکر هـــات

بەرلـــــەوەی نايـــــەی (حيجـــاب) بێتـــــە خـــوار
منـــــی بينـــــی بـــــوو ئـــــەوی تەوبـــــەکار

منـــی ناســـيەوە ئـــەو دەســـت بـــە خێـــرە
وتـــــی :- لەبەرچـــــی جێمـــــاوی لێـــــرە؟

منـــيش بـــێ دەنـــگ بـــووم چـــونکە غـــەمبار بـــووم
وشـــتری يـــخ کـــرد ئينجـــا ســـوار بـــووم

(صـــفوان) بـــە پێيـــان منـــيش بـــە ســـواری
لـــە چێـــشتەنگاو دا چوينـــەوە شـــاری

ئـــەو دووڕووانـــەی کـــە وێـــڵ و مەســـتن
دەکەونـــە قـــسە و بوختـــان هەڵبەســـتن

هەرچـــی هەڵبەســـت و قـــسە و بوختـــان بـــوو
(عبداللـــە)ی کـــوڕی (ئوبـــەی) نـــەزان بـــوو

کـــام ئـــافرەت وەکـــو( عائيـــشە) پاکـــە
لـــە وێنـــەی نـــەبوو لەســـەر ئـــەم خاکـــە

نموونـــەی پـــاکی و ڕەوشـــت جـــوانی بـــوو
ئـــەم بوختانەشـــی هـــەر نـــەزانی بـــوو

(عائیشە) دایکی خەڵکی خواناسە
دەگێڕێتەوە هەموو ئەو باسە

سەروەر و باوك و دایکیشم لەمە
ئاگادار ببوون لەو کات و دەمە

هەستم پێدەکرد سەروەری یاران
بە کەیف نەبوو وەك جاری جاران

هەرمنیش مابووم ، ئەمە بزانم
نەخۆشیش کەوتم زۆر دێشا گیانم

بەلاَم لەو کاتیش لەگەڵم چاك بوو
چوونکە ڕەحمەتی خواوەندی تاك بوو

جارێك لێی پرسیم ، من وتم :- چاکم
گەر مۆڵەتم دەی ، دەچمە لای داکم

چونکە نەخۆشم بۆ دڵنەوایی
ئەوێ باشترە ، دێمەوە دوایی

مۆڵەتی پێدام ، منیش چوومەوە
نزیکەی بیست ڕۆژ جیا نەبوومەوە

لە دوای ئەو دەردە ، کە زانیم چاکم
هاتمەوە خزمەت سەروەری پاکم

ئالەم قسەیە و بوختانە تاڵە
تا ئەوکات دڵم هەر بێ هەواڵە

ڕەوشـــتیش وابـــوو ژنـــان پـــێش خـــەوێ
بـــۆ کـــاری پێویـــست دەردەچـــوون شـــەوێ

مـــن لەگـــەڵ دایکـــی (مـــسطح)بـــە هـــەرحاڵ
بـــۆ کـــاری خۆمـــان دەرکـــەوتین لـــە مـــاڵ

دایکـــــی (مـــــسطح)ی قاچـــــی هەڵـــــەنگوت
لەبەرخۆیـــــــەوە یـــــــەك دوو قـــــــسەی وت

وتی :- ئـــەی (مـــسـطـــح) بـــەخـــتـــت نـــەمـێـنـێ
ویـــــستی لـــــە بوختـــــان تـــــێم بگەیـــــەنێ

پـــێم وت :- وامـــەڵێ بـــە (مـــسطح) ، غـــەدرە
(بەشـــدار بـــوو)ی جـــەنگی پـــیرۆزی بـــەدرە

پێـــی وتم :- دیـــارە تـــۆ نـــەت زانیـــوە
چ بوختانێکیـــان بـــۆ تـــۆ تـــەنیوە؟

پـــێم وت :- ئـــەی خوشـــکی قـــەدرگرانم
چ ڕوویـــــنـــــەداوە تـــــاکو بـــــزانم

بـــۆ منـــی باســـکرد لـــە بـــن هـــەتا ســـەر
درۆ و بوختـــانی خـــەڵکی ئابڕووبـــەر

کـــە ئەمـــەم زانـــی دەرد و نەخۆشـــی
بـــە جـــارێ منیـــان ڕووخانـــد و پۆشـــی

ئـــیتر هاتمـــەوە بـــە خـــەم و ناڵـــە
دەمـــوت :- ئـــەی هـــاوار مـــن و ئـــەو حاڵـــە

وتم :- ئــــەی ســــەرومر چــــۆنه ئــــەو رایــــه
بــــچمەوه مــــاڵی بــــاوکم و دایــــه

ویــــستم تێبگــــەم تــــەواو لــــەو باســــه
بــــەجارێ منیــــان هێنــــابووه تاســــه

کــــه چــــوومەوه بــــەو دڵــــه دامــــاوه
وتم :- ئــــەی دایــــه هــــیچ شــــت ڕووی داوه؟

دەزانم ، وەك مــــن ئــــەتۆش دڵ تــــەنگی
بــــەڵام تــــا ئێــــستا بۆچــــی بــــێ دەنگــــی؟

دایکــــم هاتــــه دووان زۆر بــــه هێواشــــی
وتــــی :- ئــــەی کــــچم تــــۆ پــــاك و باشــــی

گــــوێ مــــەده لۆمــــەی خــــەڵکی بــــەو جــــۆره
دووژمنــــی دوو ڕوو بــــێ ژمــــار زۆره

(عائیــــشه)ش بــــه خــــۆ و بــــه ڕەنگــــی زەردی
وتــــی :- هــــەر بــــۆ خــــوا باشــــه بــــێ گــــەردی

لــــه شــــەرمان ، بــــەکوڵ دەگریــــا بــــه تــــاو
وەك ئــــاو فرمێــــسکی دەهــــاتن لــــه چــــاو

پێغەمبــــەری خــــواش چــــونکه لێزانــــه
زۆری کۆڵیــــەوه ئــــا لــــەو بوختانــــه

لــــه چــــەند یــــارێکی نزیکــــی پرســــی
گەرچــــی لــــەم کــــاره نــــەیبوو مەترســــی

ئـــــەوانیش وتیـــــان :- خـــــاتوو (عائیـــــشه)
ڕەوشـــــتی پـــــاك و بـــــەرزه ، هەمیـــــشه

لـــــه (چـــــاكەكاری) چـــــیكه بـــــەو لاوه
لـــــەو دەروون پاكـــــــه نەبیـــــــستراوه

ســـــەروەریش یـــــەكجار مـــــەرد و خـــــۆگر بـــــوو
خواوەنـــــدی گـــــەورەی دۆســـــت و هـــــۆگر بـــــوو

خـــــەڵكی كـــــۆكردن لـــــه مـــــاڵی خـــــودا
وتـــــارێكی زۆر جـــــــەرگ بـــــــڕی دا

فـــــەرمووی:- لەبەرچـــی بەقـــسه و بـــه بوختـــان
دڵ و دەروونم پـــــــڕ دەكـــــــەن لـــــــه ژان

(عائیـــــشه) و (صـــــەفوان) ئـــــەو خواناســـــانه
خـــــاوێنن ، دوورن لـــــه ئـــــەو باســـــانه

(ئوســـــەید)ی كـــــوڕی (حـــــوزیر) یـــــش ئەوســـــا
لـــــه نـــــاو ئـــــەو خەڵكـــــه زۆرەدا هەســـــتا

وتـــــی :- بـــــا بـــــبڕین ملـــــی ئـــــەو كەســـــه
كـــــه هەســـــتاوه بـــــەو بوختـــــان و قـــــسه

پێغەمبـــــەر لـــــه دوای وتـــــاری جـــــوانی
چـــــۆ مـــــاڵی بـــــاوكی (عائیـــــشه)خـــــانی

(عائیـــــشه) و بـــــاوك و دایكـــــی لـــــەماڵ بـــــوون
گـــــیرۆدەی خـــــەمی بوختـــــانی تـــــاڵ بـــــوون

بـــــەلاّم (عائيـــــشه) بـــــه كـــــولّ دەگريـــــا
بـــه هەناســـــەی ســـــارد ، بـــــه ئـــــاهو بريـــــا

پێغەمبـــــەری خـــــوا دانيـــــشت لـــــەو دەمـــــه
سوپاســـــی خـــــوای كـــــرد لەســـــەر ئـــــەو غەمـــــه

ئينجـــــا ڕووی كـــــردە خـــــاتوو (عائيـــــشه)
دەيزانـــــی ، خـــــاتوون دوورە لـــــەو نيـــــشه

وتـــــی :- ئـــــەی خـــــاتوون خـــــودا نەخواســـــته
قـــــسەی ئـــــەو خەڵكـــــە گـــــەر لـــــەجێ و ڕاســـــته

تەوبـــــەی چـــــاك بكـــــە خـــــودا غـــــەفوورە
مـــــەڵێ خـــــوای گـــــەورە ڕەحمـــــەتی دوورە

(عائيـــــشه)خـــــانيش بـــــێ دەنـــــگ بـــــوو ، بـــــەلاّم
وتـــــی :- ئـــــەی باوكـــــە تـــــۆ بـــــدە وەلاّم

باوكيـــــشی وتـــــی :-ئـــــەی كـــــچم هـــــەرگيز
نـــــادرێ وەلاّمـــــی ســـــەروەری ئـــــازيز

بـــــۆ جـــــاری دووەم وتـــــی :- ئـــــەی دايـــــه
وەلاّمـــــی دەوە ، ڕاستيـــــشت لايـــــه

دايكيـــــشی وتـــــی :- گيـــــانی ڕەوانم
هـــــەروەكو باوكـــــت ، نەمـــــە نـــــاتوانم

هەرچـــــەند (عائيـــــشه) پێـــــی شـــــەرم و عـــــار بـــــوو
بـــــەلاّم هاتـــــە دووان ، چـــــونكە ناچـــــار بـــــوو

سـوورەی (یوسـف)ی ئایـەتی هـەژدە
لـە بـۆ وانـی خوێنـد هـەروەکو مـزدە

ئـارام و سـەبـر گـەلـێك بـاشـترە
خـودا لـە و خەڵکـە زۆر زانـا تـرە

(عائیـشە)دەڵـێ :- هـەر لـەدوای ئەمـە
ڕاکـشام لەبـەر ژانـی ئـەم غەمـە

پێغەمبـەری خـوام لەوکاتـدا بینـی
دەمزانـی (جوبریـل) وەحـی بـۆ دێنـی

چـونکە دەلـەرزی دیـاربوو بەیـەك جـار
وەك ئـاو ئارەقـەی لێ دەهاتـە خـوار

جـا سـەیری کـردم فـەرمووی :- (عائیـشە)
بـەزەیی خـودا زۆرە هەمیـشە

خواوەنـدی گـەورە وای تێگەیانـدم
ئـەم مـزدە خۆشـەی پـێ ڕاگەیانـدم

وەحـیم لـە بـۆ هـات تـازە بـە چـاکی
ئەمـە بوختانـە ، لـەم کـارە پـاکی

دایکـی (عائیـشە)ش وتـی :- ئـەی ڕۆڵـە
خـوا لەسـەرمانی لا بـرد ئـەو کۆڵـە

سـوپاس گـوزاری سـەروەر بـە ، گیانـە
تـۆی دوور خـستەوە ئالـەو بوختانـە

(عائیـــــشە)ش وتـــــی :- مـــــەمنونی خوامـــــە
لابـــــەری غـــــەم و دەرمـــــانی زامـــــە

خواوەنـــــدی گـــــەورە لـــــە ســـــورەتی (نـــــوور)
لـــــە بـــــۆ پـــــاکێتی (عائیـــــشە)ی ڕوو ســـــوور

ئـــــەم ئایەتانـــــەی هێنایـــــە خـــــوارێ
بوختـــــان ڕووی زەرد بـــــوو وەك گـــــەڵای دارێ

لـــــە ئایـــــەی یـــــازدە تـــــاکو بیـــــست و ســـــێ
خـــــوا حـــــاڵی دەکـــــا هـــــەر هـــــەموو کەســـــێ

بوختـــــان کـــــەرانیش زۆر شـــــەرمەزار بـــــوون
ڕووبـــــەڕووی تـــــۆڵـــــەی پـــــەروەردگـــــار بـــــوون

# باسی شەڕی (خەندەق)

بـــا بکـــەین باســـی ڕوودوای خەنـــدەق
باســـی ڕیســـوایی کـــافری دڵ ڕەق

لـــە دوای ناپـــاکی و فیتنەگـــێڕی و جـــەنگ
هیوایـــان نـــەما جوولەکـــەی بێـــسەنگ

ئـــەم جوولەکانـــەش هـــەوبوون لەمـــەوپێش
لـــە قـــەلاگانیان کـــران ڕیـــشە کـــێش

دیـــسان بـــۆ پـــیلان هەســـتان جوولەکـــە
ڕێکـــەوتن لەگـــەڵ قوڕەیـــشی (مەککـــە)

دژبـــە خواناســـان تـــاکو نـــەمێنن
ڕەگ و ڕیـــشەیان یەکجـــار دەربێـــنن

(قوڕەیـــشی)ـــش هێنـــدە مەســـت و ســـادە بـــوون
چـــوار هـــەزار کەســـیان زوو ئامـــادە بـــوون

هۆزەکـــەی (بنـــو غلفـــان) شـــەش هـــەزار
بوونـــەوە بەیـــەك هـــەر هـــەموو چـــەکدار

لـــەژێر فەرمانـــدەی (ئـــەبو ســـوفیان)دا
ئـــاڵای لەشـــکریان بـــە دەســـت (عثمـــان)دا

هەرچـــەند پێغەمبـــەر خۆشـــەوی خوابـــوو
کـــە بەمـــەی زانـــی ، ترســـی پـــەیا بـــوو

چـــونکە دوژمنـــان نـــەبوون بـــەم جـــۆرە
ئامـــادەی جـــەنگ بـــن ئـــەو هێنـــدە زۆرە

بەڵام مرۆڤی خواناس بەجەرگە
لەو هێزە زۆرە گرتیان بەرگە

(سەلمانی فارس) فەرمووی :- پێغەمبەر
با خەندەق لێدەین لەم سەر بۆ ئەو سەر

پێغەمبەری خوا ڕایەکەی (سەلمان)
بە باش دەزانێ و دەریکرد فەرمان

درا (دە) کەسان چل گەزی تەواو
تا لەمڕووی کوفر بێتە تەڵە و داو

پانایی نۆ باڵ ، قوڵیشی حەوت باڵ
پێنج هەزار باڵیش درێژ بەهەر حاڵ

ئیتر خواناسان وەکو بەرزە باز
هەر کاریان دەکرد بە شیعر و ئاواز

پێغەمبەری خواش وەکو یارانی
خەریکی کار بوو بەڕێك و جوانی

کاتیش زستان بوو ، گەلێ سەرما بوو
هەرچی پێویستە کەمیان لەلا بوو

لە کاتی خەندەق هەڵکەندن ، بەردێك
لە بۆیان بووە بەربەست و دەردێك

زۆری نەمابوو ، وازی لێ بێنن
چونکە توانایان نەبوو بیشکێنن

ئینجـــا هـــەواڵیان دا بــــە پێغەمبـــەر
هـــەرگیز لـــەو بـــەردە نـــاکرێ چارەســـەر

ســـەروەریش دەســـتی دایـــە قازمـــە و چـــوو
خواوەنـــدی گـــەورەش هێـــزی پێـــدا زوو

ســـێ قازمـــەی بـــە هێـــز کێـــشای بـــە بـــەردی
بـــەردی دەرهێنـــا لـــە نـــاخی عـــەردی

فـــەرمووی :- مـــوژدەبێ ئـــەی یـــارانی خـــۆم
(حـــیرە) و (مـــەدائین) (یەمـــەن) لەگـــەڵ (ڕۆم )

گومانتـــان نـــەبێ هـــەر بـــە هـــیچ شـــێوە
هـــەمووی دەکەونـــە ژێـــر دەســـتی ئێـــوە

* * *

دەگێڕێتـــــــەوە (جـــــابر)ی یـــــاری
ســـــەروەری دیبـــــوو لەبـــــەر ناچـــاری

بـــەردی بەســـتبوو لـــەزگ لـــە برســـان
ســـــەرەڕای دەردی بێهێـــــزی و ترســـــان

(جـــابر)یـــش پێـــی وت :- ســـەروەر بەهـــەرحاڵ
گـــەر مۆڵـــەتم دەی ، دەچـــمەوە تـــا مـــاڵ

پێغەمبـــەری خـــواش وا بـــە هـــەر حـــاڵێ
مۆڵـــەتێ پـــێ دا ، ئـــەویش چـــۆ مـــاڵێ

(جـــابر) چـــووە مـــاڵ ، وتـــی :- ئـــەی خێـــزان
چـــیت هەیـــە بیخـــۆین لـــە خـــواردن و نـــان؟

چونکە نیازم کارێکی خێرە
پێغەمبەری خوا دێنم بۆ ئێرە

خێزانی پێی وت :- گەر نازانی تۆ
بزنێکمان هەیە لەگەڵ چوار مست جۆ

ئیتر کرا چێشت جۆ لەگەڵ بزن
بۆ پێغەمبەری خوای گەورە و مەزن

(جابر) هاتەوە وەکو هەژارێك
وتی :- ئەی سەروەر تۆ و یەك دوو یارێك

لە بۆ نانخواردن وەرن بۆ ماڵمان
لەبەر نەداری پەشێوە حاڵمان

پێغەمبەری خواش وتی :- ئەی بەندە
پێم بڵێ ، ئەوەی هەتانە چەندە؟

(جابر) یش وتی :- دڵم بە غەمە
ئەی تاجی سەرمان خواردنمان کەمە

باسەرتان نێشێ ، گشت موسڵمانان
بەویستی خودای بەرز و میهرەبان

لەگەڵ سەروەر چوون بۆ میوانداری
بەڵام خوایە گیان تۆ ئاسانکاری

گشت خەڵکان تێربوون لە ڕزق و ڕۆزی
چونکە پێغەمبەر خودی پیرۆزی

لەسەر مەنجەڵی خواردن وەستا بوو
هەزار کەس تێریان خوارد و هەر مابوو

* * *

ئیتر بەویستی خودای ڕاست و حەق
دەچینەوە سەر باسەکەی خەندەق

بە ماوەی شەش ڕۆژ خەندەق تەواو بوو
لەمڕووی کافرەکان وەك تەڵە و داو بوو

هەر چەند کافرەکان لە هێزیان زۆر بوون
تاریکی خوازی نەزان و بۆر بوون

گەیشتن بەجێ سوپای کوفری ڕەق
گەلێ سەرسام بوون بە بوونی خەندەق

چونکە بەربەست بوو بۆیان ئەو کارە
بۆیە هەر لەوێ کەوتن بێ چارە

هەزاران سڵاو لە سەر پێغەمبەر
ئەویش بەخۆی و سێ هەزار نەفەر

لەوبەری خەندەق زۆر دلێرانە
وەستا بوون بەرەو ڕوویان شێرانە

ئەوانیش لەمدیار خەندەق مانەوە
دەرفەتیش ئاوری لێ نەدانەوە

ئەوساکە (حویەی) کوڕەکەی (ئەختەب)
بۆ پیلان گێران چوو بۆ لای (کەعب)

(کــــەعب)ی (ســــالم)یـــش زۆر بێنیمـــــان بـــوو
ســــــەرۆکی هـــــۆزی جوولەکــــــەکان بــــــوو

هەرچـــــەند بێـــدین و پـــیس و نـــەزان بـــوو
هاوپـــــــــەیمانێکی موســــــــڵمانان بـــــــوو

وتـــــی بــــــە (کــــــەعب)ی وەك قـــــسەزانان :-
مەکـــــــە هاوکـــــــاری بـــــۆ موســـــــڵمانان

چـــونکە ئـــەو (کـــەعب)ـــە زۆر بـــە دڵـــسۆزی
یارمــــــــــــەتی دەدان بـــــــــــە ڕزق و ڕۆزی

(حویـــەی ئەختـــەب)یـــش (کـــەعب)ی دەمـــاودەم
پەشـــــیمانی کــــــرد بـــــەماوەیێ کــــــەم

کەموســـــــڵمانان پێـــــــی ئاگـــــــادار بـــــوون
بـــــە ناپـــــاکی وان زۆرخەفـــــەت بـــــاربوون

چـــــونکە گــــــەر (کــــەعب) پاشـــــگەزبێتەوە
لـــــــە بـــــۆ دوژمنــــــان ڕێ دەگرێتـــــــەوە

پێغەمبـــەری خـــواش کـــەمێ پێـــی تـــەنگ بـــوو
بـــەڵام هـــیچ قـــسەی نـــەکرد ، بـــێ دەنـــگ بـــوو

(عبداللــــــە) و (خـــــەووات) هــــــەردوو ســـــەعدەکان
ســــەرەومر پێـــی وتـــن :- بـــرۆن بـــۆ ناویـــان

تـــــاکو بــــــزانن ، ئـــــــەو شـــــــتە وایــــــە
چـــــونکە جوولەکـــــە ناپـــــاکی تیایــــــە

جـــا ئەگـــەر وابـــوو بەرێـــی نهێنـــی
پـــێم بلـــێن ، نـــەوەك وره نـــەمێنی

بـــەلام جوولەكـــەی ناپـــاك لـــەو وەختـــی
وەلامیـــــان داوە زۆر زۆر بەســـــەختی

كـــاتی هاتنـــەوە چـــوونە لای ســـەروەر
پێیـــان وت :- راســـتە ئـــەی گـــەورەی بەشـــەر

پێغەمبـــەری خـــواش زۆر خەفـــەت بـــار بـــوو
بـــەلام خـــوای گـــەورە بـــۆی پـــەنا و یـــار بـــوو

لەبـــەر ناپـــاكی جوولەكـــە و بـــاوی
كـــەمێ راكـــشا و خـــەو چـــووە چـــاوی

لـــە ناكـــاو هەســـتا و هـــەروا بـــە ئاســـان
مـــوژدەی ســـەركەوتن دای بـــە خواناســـان

پێـــشتر ئـــەزنۆیان لـــەق و لـــەرز بـــوو
بـــەلام ورەیـــان لـــەوكات بـــەرز بـــوو

ئەوســـا (عیكرەمـــە) وجـــا (عـــەمری ودی)
یـــەكجار ســـەرخۆش بـــوون هـــەروا بـــێ حـــەدی

ولاغـــەكانیان تـــاودان سەرســـەری
لەخەنـــدەقی قـــووڵ چـــوون بـــۆ ئەوبـــەری

كـــاتێ پەڕیـــەوە ئـــەو (عـــەمر)ی ئـــەزان
وتـــی :- كـــێ هەیـــە بـــۆم بێتـــە مەیـــدان؟

ئەوسا (عەلی) بۆی مەیدان دەخوازی
تاکو لەگەڵیا بکات گیانبازی

بەڵام (عەمر)ی بەد بە دەمەقاڵی
وتی :- حەزناکەم چونکە منداڵی

ئەوسا کە (عەلی) وتی بە ئەوی:-
حەزدەکەم لاشەت بخەمە زەوی

جا (عەمر) رقی هەستا و هاتە پێش
(عەلی)ش پێی نۆشی مردنی بەئێش

(کوڕی عبداللە)ش ئەوەی (موغەیرە)
ناوی (نەوفل) بوو ، سەیری ئەو سەیرە

(زوبەیری کوڕی عەوام ) بە مەردی
لاشەی ئەو پیسەی خستە سەر عەردی

لە بەری تەرمی (نەوفل)ی نەزان
(ئەبوسوفیان) رێك سەد وشتری دان

پێغەمبەری خواش رەتی کردوەوە
تەرمی (نوفل)یان بەلاش بردەوە

لەوسات خێزانی موسڵمانەکان
لە قەڵایەك بوون نزیك جوولەکان

جوولەکەیەکی بەد رەوشت لەو کات
لە دەوروبەری قەڵا خول دەخوات

(صـــەفیە)ـــش ناچـــار بـــوو تـــاوی دایـــە دار
بـــــەداران کوشـــــتی ئـــــەوی بـــــەدکردار

لـــەو کـــات و دەمـــی کـــوفری عـــەقڵ ســـست
بـــۆ هێـــرش بـــردن ســـێ تیپیـــان ڕێـــك خـــست

هـــەر ســـێ تیپەکـــە دوور لـــە خـــودا و حـــەق
هـــاتن تـــاوەکو ســـەر ڕۆخـــی (خەنـــدەق)

یـــاران سەرســـام بـــوون بـــەو هێـــزە زۆرە
نـــەیان بینـــی بـــوو دوژمـــن بـــەو جـــۆرە

بـــەڵام ورەیـــان وەك ڕەگـــی داری
بـــەناخی زەوی ڕۆیـــشتبووە خـــواری

بـــۆلای ســـەرومەر چـــوون هەنـــدێکان لـــەو ســـات
تـــاوەکو نـــزای خێریـــان فێـــر بکـــات

پێغەمبـــەری خـــواش زوو فێـــری کـــردن
فێـــرە نزایـــێ پـــڕ خێـــری کـــردن

بۆئـــەوەی تـــرس و ســـامیان نـــەمێنی
ورەیـــان هـــەرس بـــە دوژمـــن بێنـــێ

کـــەمێ لەمەوبـــەر ســـەروەری بـــێ گـــەرد
کـــە بەســـێ قازمـــان شـــکاندبووی بـــەرد

بـــە موســـڵمانان دابـــووی مزگێنـــی
بـــە ســـەر (کیـــسرا) و (ڕۆم) ســـەرکەوتن دێنـــی

لـــەو كـــات ئەوانـــەی كـــە بـــڕوا ســـست بـــوون
گـــەلێك دەترســـان بـــە پستەپـــست بـــوون

یـــەك یـــەك دەیـــان وت :- هـــاوار لـــە بـــۆ خـــۆم
كـــوا بەڵێنەكـــەی (كیـــسرا) ، یـــاخود (ڕۆم)؟

ئەوســـا ئەوانـــە ئـــەوەبوو حاڵیـــان
لـــەوكات دەیانویـــست بـــچنەوە ماڵیـــان

بـــەڵام خـــوای گـــەورە كـــە میهرەبانـــە
هـــەموو كـــات پـــەنای ڕاستیویـــستانە

كەســـێ گـــەر پـــەنای خـــوا بێـــت ، نـــادۆڕێ
بـــەڵـــێـــنی خـــوداش هـــەرگـــیز نـاگـۆڕێ

# فیڵکردن لە جەنگ

ئابڵوقەی خەندەق چەند ڕۆژی خایاند
بەڵام زیانێکی زۆری نەگەیاند

لەبەر سەرما و (با) دوژمن ناچاربوون
ئیتر لە خۆیان یەکجار بێزار بوون

(نەعیمی کوڕی مەسعود)یش ئاسان
چوو بۆلای سەروەر ، گەورەی خواناسان

چونکە لەم جەنگە ببووە موسڵمان
تازە هاتبووە ناو بازنەی ئیمان

وتی :- ئەی سەروەر ئەگەر لەوبارە
ئەتۆ ڕازی بیت دەکەم ئەم کارە

دەڕۆم بە دوژمن دەکەم یەك کارێ
تووشی شکست بن بڕۆن بە جارێ

پێغەمبەری خواش فەرمووی :- ئەی گیانە
شەڕ لێزانین و فێڵە ، بزانە

ئەگەر پێت بکرێ ، کارێ زۆر چاکە
پاڵپشتی ڕاستی خواوەندی تاکە

(نەعیم)ی بەڕێز بۆ پیلان و فێڵ
چووە ناو کوفری ڕێگا ون و وێڵ

چوو بۆ ناو بەرەی (قریظة) لەوکات
تاکو ڕەشەبای پەرتەیی هەڵکات

پێـــی وتـــن :- بـــەرەی (قـــریظة) ئەگـــەر
ئێـــــوە بجـــــەنگن لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەر

گـــەر ســـەر نەکـــەوتن بەراســـتی دەردە
لـــە دەســـتو دەڕوات ئـــەو زەوی و عـــەردە

چـــونکە قورەیـــشی ئەگـــەر بـــشدۆڕێ
دەچـــنەوە شـــوێنیان ، هیـــچیان نـــاگۆڕێ

تـــاکو هەنـــدێ کـــەس نـــەدەن بـــەئێوە
وەکـــو بارمتـــە هـــەر بـــە هـــیچ شـــێوە

بـــــەگوێیان مەکـــــەن ، بـــــزانن (داو)ە
قـــسەکانی مـــن هـــەمووی تـــەواوە

ئەوســـاکە (نـــەعیم) زۆر یـــان بـــۆ دەڵـــێ
بـــەرەی (قـــریظة)ـــش دیـــانوت :- بـــەڵێ

(نـــەعیم)یـــشی هـــەزار ڕەحمـــەت لـــە گیـــانی
موســـــڵمان ببـــــوو و نەیانـــــدەزانی

چـــۆ نـــاو (قـــورەیش)یـــش بـــۆ هـــەمان مەبەســـت
بـــەڵکو ســـەرکەوتن بهێنێتـــە دەســـت

گەیـــشتە ناویـــان پێـــی وتـــن :- خەڵکـــە
پـــەیمانی ئێـــوە بێـــسوود و کەڵکـــە

بـــەرەی (قـــریظة) لەگـــەڵ ئێـــوە نـــین
وەك دەتانـــەوێ ، ئەبـــەو شـــێوە نـــین

داوای بارمەتـــــــــە دەكــــــــەن ئەوانــــــــە
چـــــــونكە بــــــەئێوە ناكـــــــەن موتمانــــــــە

نەكــــــەن پێیانـــــدەن ، چـــــونكە زۆر ئاســـــان
دەیدەنــــــــە دەســـــــتی ســــــوپای خواناســـــان

ئەوانـــــــە هــــــــەردەم دوژمنـــــــی چـــــاكەن
هاوكـــــاری ئێـــــوە لــــــەو شــــەڕە ناكـــــەن

پاشـــان چـــوو بــــۆ نــــاو بـــەرەی (غطفـــان)یـــش
تــــــاكو بــــــە هەڵــــــە ببـــــا ئــــــەوانیش

پێـــــی وتـــــن :- ئێــــوە پیـــــاوی زۆر چـــــاكن
بــــــەڵام (قــــــورەیش)ی پـــــیس و نــــــا پـــــاكن

لــــــەپێناو حــــــەزیان بـــــۆ ســــــەر دەنــــوێنن ؟
بۆچـــــی خێزانتــــــان بــــێ كــــــەس بمێــــنن ؟

ئینجــــــا وا باشــــــــە ، پــــــەیمان بـــــــشكێنن
چـــــونكە پــــێم حەیفــــــە ، خـــــۆ بــــرووخێنن

ســــلاو لـــــە (نــــەعیم) ، زوو بــــە دەســـــت وبـــــرد
ئـــــەم كـــــارە جوانـــــەی لــــە بـــۆ خـــــودا كـــــرد

ئینجــــــا قورەیـــــــشی زۆر ســـــــووك و ســــــادە
وتیــــــان :- لـــــەبۆ جـــــەنگ بـــــبن ئامــــــادە

تــــــاكو بـــــــزانن ، ئــــــــەوان گـــــــۆڕاون
یــــــان لەســـــــەر وەعــــــد و پـــــەیمانیان مــــــاون

بەرەی (قـریظة) وتیان :- ناجەنگین
ئێوە ڕاست ناکەن ، بۆیە بێ دەنگین

چونکە وادیارە ئێوە بە فێڵن
لە بن شمشێریان بەجێمان دێڵن

گەر وەك بارمتە چەند کەسێك لێتان
لەلای ئێمە بن ، دەکەین بە گوێتان

بەسەر (قـورەیش)ی داهات دڵگیری
قسەی (نەعیم)یان هاتەوە بیری

(ئەبو سوفیان) بوو سەرۆکی هێزیان
پەرت وبڵاوی کەوتە ناو ڕیزیان

باران و سەرما ژینی لێ کرد تاڵ
بۆیە بیری کرد لە چوونەوە ماڵ

★ ★ ★

لێرە (حذیفە)ی ڕۆڵەکەی (یەمان)
دەگێڕێتەوە ئەو باسە بۆمان

دەڵێ شەوێکیان سارد بوو بە سەختی
پێغەمبەری خواش کە هات لەو وەختی

فەرمووی :- کێ دەکات ئەو کارە خێرە ؟
هەواڵی دوژمن بێنێتە ئێرە

هەرکەس بەم کارە ئەگەر هەڵبستێ
لە ڕۆژی دوایی لەلام دەوەستێ

سـێ جـاران پرسـی پێغەمبـەر ، بـەلام
هـیچ کـەس لـە یـاران نەیـداوە وەلام

ئەوسـا بـۆ لام هـات فـەرمووی:- (حذیفـە)
ئـەو کـارە بکـەیت جێـی خۆشـی و کەیفـە

جـامنیش پـێم وت :- هەرچـی بفـەرمووی
ئـەنجامی دەدەم گـەر بکـرێ هـەمووی

ئەوسـا پێـی فـەرمووم :- هەسـتە ئـەی گیانـە
نیـاز و هـەواڵی دوژمـن بزانـە

چـونکە ئەوانـە بـۆ جـەنگ هاتوونـە
ئێـستاکەش بێـدەنگ لـەوێ کەوتوونـە

(حذیفـە) دەڵـێ :- سـارد بـوو سـەرمام بـوو
نـزای بـۆ کـردم لـەو کـات گـەرمام بـوو

زۆر بەکەیفـەوە کـە هەسـتام و چـووم
لـە ئاگرەکـەیان گـەڵێ نزیـك بـووم

جـا بـە پـەنهانی ڕۆیـشتمە ناویـان
شـەویش تاریـك بـوو ، نـەیبینی چـاویان

ئەوسـا کـە بینـیم یـەکێ قـەد ئەسـتوور
لـە ڕۆخ ئاگرەکـە نـە نزیـك ، نـە دوور

زۆر لێهـاتوو بـوو یـەکێ چـوار شـانە
زوو ناسـیم کـەوا (ئەبوسـوفیان)ە

گـــــەر نەیفـــــەرمووبا ســــــەرداری ســــــەروەر
هـــــــەواڵ وەرگـــــــرە و وەرەوە یەکـــــــسەر

(ئەبوســـــــوفیان)م زۆر ئاســـــــان دەکوشـــــــت
هــــــەر لـــــەو جێگایـــــە خـــــوێنم لێدەڕشـــــت

ئـــــا لـــــەو کاتـــــەدا (حذیــــــة)ی(یـــــەمان)
باشـــــە گـــــوێ لـــــێ بـــــوو کـــــە (ئەبوســـــوفیان)

دەیـــــوت :- زۆر تونـــــدە گـــــڕی ئـــــەو بایـــــە
لێـــــی بـــــێ ئاگـــــا بـــــوون کـــــە تۆڵـــــەی خوایـــــە

دوایـــــی بـــــانگی کـــــرد ، وتـــــی :- هـــــۆ خەڵکـــــە
مانـــــەوەی ئێمـــــە لێـــــرە بـــــێ کەڵکـــــە

بـــــەرەی (قـــــریظە)یـــــش وا پەشـــــیمانن
چـــــارەمان چـــــی یـــــە ئەگـــــەر دەزانـــــن؟

ئەوســـــا وشـــــتری هێنـــــا بـــــە هـــــەرحاڵ
بەناچـــــاریەوە ڕووی کـــــردەوە مـــــاڵ

زۆر دڵگوشـــــادبوو (حذیفـــــە) لـــــەوکات
چـــــونکە هـــــەواڵێك بـــــۆ ســـــەروەر دەبـــــات

دەڵـــــێ لـــــەودەمی زۆرم ســـــەرمابوو
کراســـــێ تـــــەنك و کـــــورت لەبـــــەرما بـــــوو

دەڵـــــێ :- چـــــوومەوە ، پێغەمبـــــەر لـــــە نوێـــــژ
لەگـــــەڵ خـــــودای تـــــاك دەیکـــــرد وتووێـــــژ

باسی دوژمنم بۆی گێرایەوە
ئەویش لە خوای تاك زۆر پارایەوە

لە سورەی (ئەحزاب) چاك دەكات باسی
لە ئایەتی نۆ خوا دەیانناسی

ئەوسا خواناسان چێژتیان خۆشی
کە دوژمن تامی شکستی نۆشی

پێغەمبەری خواش هەزاران دروود
لە گیانی پاکی بە قسە و بە سروود

زۆری دەربڕی سوپاسگوزاری
نزای خێری کرد لە کردگاری

چونکە بە بایێ بێهێز و لاواز
ڕایماڵی هێزی دوژمنی شەڕخواز

# دەرکردنی جوولەکەی(بنوقریظة)

دوای شـــــەڕی (خەنـــــدەق) ســـــوپای زۆرداران
(مەدینـــــە)ی جـــێ هێـــشت بـــۆ شـــوێنی جـــاران

ئەوســـــا خواناســـــان خـــــۆش بـــــۆوە حاڵیـــــان
بـــــە دڵگوشـــــادی چـــــوونەوە ماڵیـــــان

پێغەمبـــــەری خـــــواش بـــــۆ مـــــاڵ چـــــوو ، بـــــەڵام
(جبرائیـــــل)ی خـــــوا (علیـــــه الـــــسلام)

پێـــی فـــەرموو :- هـــاتووم لـــەلای کردگـــار
تـــاوەکو (بـــەرەی قریظـــە)ی بـــەدکار

لـــەڕەگ و ریـــشە یـــەك جـــار دەربێـــنن
چـــونکە ناپـــاکن ، بـــا هـــەر نـــەمێنن

ئەوســـا پێغەمبـــەر بـــۆ چـــاکە خـــوازی
لـــە نـــاو یـــارانی کـــرد بانگـــەوازی

فـــەرمووی :- فـــەرمانی خواوەنـــدی تاکـــە
بـــەرەی (قریظـــە) یـــەکجار ناپاکـــە

جـــا یـــاران هەســـتن لـــەبۆ ئـــەو خێـــرە
بنبڕیـــان بکـــەین یـــەکجاری لێـــرە

ســـێ هـــەزار کەســـی تـــەواوی ڕێکخـــست
دژ بەجوولەکـــەی پـــیس و عـــەقڵ ســـست

دای بەدەســـت (عـــەلی) ئـــاڵای بـــەرزی جـــەنگ
زۆر لێهـــاتوو بـــوو شـــێری شـــەوە زەنـــگ

هـــــەروا (عبداللـــــە)ش لـــــەو ڕاپەڕینـــــە
کرايـــــە چـــــاودێر لەســـــەر مەدينـــــە

ناپاکـــــان لەســـــەر ناپـــــاکی ســـــوور بـــــوون
چـــەند (میـــل) لـــە شـــاری مەدينـــە دوور بـــوون

ئەوســـــاکە (عـــــەلی) بـــــەخۆ و ئالأکـــــە
دەچـــــوو لـــــە پێـــــشی هـــــەموو ســـــوپاکە

جوولەکـــــە لـــــەوکات کـــــە ديتيـــــان ئەمـــــە
هـــــات بەســـــەرياندا چـــــی دەرد و خەمـــــە

چـــونکە شـــوێن کـــەوتووی ڕێگـــای (ئيبلـــيس) بـــوون
دژ بەســـــەروەريش زۆر زمـــــان پـــــيس بـــــوون

لەگـــــەڵ جوولەکـــــەی ناپـــــاکی خوێنڕێـــــژ
پێغەمبـــــەری خـــــوا کـــــردی وتـــــو وێـــــژ

پێيـــــانی فـــــەرموو :- ئێـــــوە فێڵبـــــازن
بـــــرای مـــــەيمون و بـــــرای بـــــەرازن

زانيـــــان ســـــەروەر لـــــەم کـــــارە گەرمـــــە
جـــا بـــە گـــەڕيان خـــست کـــام زمـــان نەرمـــە

بـــــەڵام بـــــێ ســـــوود بـــــوو ئـــــيتر دواجـــــارە
چـــــونکە فـــــەرمانی خـــــوای کردگـــــارە

ورە و خـــــۆگری نـــــەما لـــــە ناويـــــان
(تيـــا چـــوون )و (مـــردن) ، هاتـــە بەرچـــاويان

(کــــەعب)ی (ئەســــەد)یـــش ســـەرۆکی وان بـــوو
دوژمنـــــی ســـــەختی ئیـــسلامی جـــوان بـــوو

بـــــە ناچـــــاریەوە وتـــــی :- هـــــۆ خەڵکـــــە
گـــەر بـــەگوێم دەکـــەن ، جێـــی ســـوود و کەڵکـــە

یـــــا موســـــڵمان بـــــین ، وەرن ، ئەوســـــاکە
ڕزگـــــاریش دەبـــــین لـــــە مـــــردن ، چـــــاکە

بـــــەڵام گەلەکـــــەی وتیـــــان :- دان نـــــادەین
تـــــەوراتی خۆمـــــان بـــــە قورئـــــان نـــــادەین

ســـــەیرکەن خـــــەڵکی تێنەگەیـــــشتوو!
چـــــۆنە مرۆڤـــــی پێنەگەیـــــشتوو؟!

زۆر ڕاســـــتە (بـــــزن گـــــەر ئەجـــــەلی هـــــات
خـــــۆراک و نـــــانی شـــــوانی خـــــۆی دەخـــــوات)

لـــــە بـــــۆ گەلەکـــــەی ناپـــــاکی بێـــــسۆز
زۆر ڕێگـــــای دانـــــان (کـــــەعب)ی ســـــەرۆک هـــــۆز

چـــــونکە گەلەکـــــەی لـــــە ئاشـــــتی خـــــوازی
دوور بـــــوون ، بۆیـــــە هـــــەر نـــــەدەبوون ڕازی

ناچـــــار یـــــەکیان نـــــارد بـــــۆ لای پێغەمبـــــەر
تـــــاکو ڕێگایـــــان بـــــدات بـــــچنەدەر

ســـــەروەریش پێـــــی وت :- نـــــابێ ، وامـــــەڵێن
خـــــۆ بەدەســـــت بـــــدەن بـــــێ مـــــەرج و بـــــەڵێن

بەلام پێغەمبەر ئەوهای بیستبوو
هەندێکیان لەوان نەیان ویستبوو

لەکاتی خەندەق پەیمان بشکێنن
تا دەستی ڕەشیان لێ بوەشێنن

جا مۆڵەتیاندا بەوان کە هەڵێن
ئەویش باریان کرد بە مەرج و بەڵێن

ئەوانەی لەوان کەوا مانەوە
زۆر تکایان کرد ، زۆر پاڕانەوە

بەلام سەروەر و یاران لێی دوور بوون
لەسەر فرمانی خوای گەورە سوور بوون

لەو کاتەی (سەعدی کوڕی معاذ)ی
لەنێوان ڕاستی و دەستەی شەڕخوازی

بوو بەداد گەر و بە ناوبژیوان
بۆیانی گێڕا دادگاییەکی جوان

(سەعد)ی بەرێزیش بەویستی (الله)
جوولەکەی بەدی دەرکرد لە قەلا

خوا لێتان خۆش بێ هەزار هەزار جار
دەرتانکرد لە ڕەگ جوولەکەی بەدکار

# پەیمانی (حودەیبیە)

لــــە دوای کـــۆچ کـــردن شـــەش ســـاڵی تـــەواو
یـــاران ، (مەککـــــە) یـــان نـــەدیبوو بـــە چـــاو

هیـــوا و ئاواتیـــــان (مەککـــــە)ی پـــیرۆز بـــوو
رووگـــــەی خواناســــی ژیـــــر و دڵـــسۆز بـــوو

ســـــەرمڕایی ئـــــەوەش بـــــووکی شـــاران بـــوو
شـــــوێنی لـــــەدایك بـــــوونی یـــاران بـــوو

رۆژێــــك پێغەمبـــــەر لەگـــــەڵ چـــــەند یـــاران
لـــــەماڵی خوابـــــوون هـــــەروەکو جـــــاران

فـــــەرمووی :- مزگێنـــــی بـــــەدڵی روونـــــاك
ئـــەو شـــەو بینیومـــــە خـــــەونێکی زۆر چـــاك

ئەوســـا پێیـــــی وتـــــن مانـــــای خەونەکـــــە
کـــە شـــاد دەبنـــەوە بـــە کەعبـــە و (مەککـــە)

کـــاتێ بیـــــستیان ئەمـــــە لـــــە ســـــەروەر
پـــــڕ بـــــە دەم وتیـــــان :- (اللە اکــــبر)

بـــــە مـــــژدەی خـــــاوەن رێـــــی راســـــتەقینە
ئاگـــــادار کـــــرا خـــــەڵکی (مەدینـــــــە)

لـــە نـــاو خەڵکانـــدا گـــەڕا بـــاس و دەنـــگ
کـــەوا بـــۆ (کەعبـــە) دەچـــن بـــە بـــێ جـــەنگ

جـــا خـــــەڵکی زۆر و لێهـــاتوو لـــــەو کـــات
بـــــەدەم ئـــــەم بـــــاس و مژدەیـــــەوە هـــات

ئەوسا سەروەری شیرین و بەرچاو
خۆی و هەزار و چوارسەد کەس تەواو

بە سەحرادا چوون هەروا سەردەمێك
بێ ئەوەی لە کەس بترسن کەمێك

جیا دەنگی وشەی یەکتاپەرستی
بەرەو عەرشی خوا ڕێزی دەبەستی

بڕێکی کەمی شمشێر و کەوان
لایان بوو چونکە مەبەستی ئەوان

وەدیهێنانی کارێکی خێر بوو
بەڵام (قوڕەیشی) ئاژاوە گێڕ بوو

لە (ذوالحلیفة) خەڵکەك دەوەستن
دابەزین لەوێ ئیحرام دەبەستن

ڕۆیشتن ، پاشان بە ورەبەرزی
کاتێ (قوڕەیش) پێی زانی ، لەرزی

زۆر خەفەت بار بوون دڵیان پێ ئێشا
مەترسی باڵی بەسەر یان کێشا

بڕیان کردەوە (قوڕەیش)ی سەرمەست
تا لە ڕێگایان بن بە بەربەست

دووسەد سواریان نارد لە بۆ پێشیان
تا نەبنە مایەی ئازار و ئێشیان

(عیکریمـــــــە) هەســـــتا زۆر بـــــە ناســـــانی
لـــــەو کاتیـــــدا خـــۆی بـــە ڕاســـت دەزانـــــی

(خالیـــــدی کـــــوڕی وەلیـــــد)یـــــش هـــــەروا
پـــــشتی کردبـــــوو لـــــە بەرنامـــــەی خـــــوا

لـــــەو دووســـــەد کەســـــە سەرپەرشـــتیار بـــــوون
چـــالاك و مـــــەردی بەرچـــاو و دیـــــار بـــــوون

پێغەمبـــــەری خـــــواش گەیـــــشتە (عـــــەفان)
لەوکاتـــــە بینـــــی (بیـــــشرِ بـــــن ســـــوفیان)

فـــــەرمووی :- ئـــــەی (بیـــــشر) نـــــازانی ئایـــــە؟
خـــــەڵکی قورەیـــــشی لـــــە چ حـــــاڵ دایـــــە ؟

وتـــــی دەزانـــــن کـــــەوا ئێـــــوە دێـــــن
هاتوونـــــە ڕێتـــــان لـــــە فلاَنـــــە شـــــوێن

پێغەمبـــــەری خـــــواش وەســـــتا ئـــــەلێرە
تـــا چـــۆن ئەنجامـــدات ئـــەم کـــارە خێـــرە

ئەوســـــاکە فـــــەرمووی :- وەرن ئـــــەی یـــــاران
ڕای ئێـــــوە چـــــیە دژ بـــــە زۆرداران؟

چـــــونکە زۆرداران دەنـــــێن ئـــــاژاوە
چـــۆن ڕزگارمـــان بێـــت لـــەم کۆســـپ و داوە ؟

(عیکریمـــــە) و (خالیـــــد) دوژمنـــــی دیـــــن بـــــوون
دژ بـــــە خواناســـــان لـــــە ڕێ و کـــــەمین بـــــوون

یـــارانی پـــاکیش مـــەردن هـــەر هـــەموو
لـــە قـــسەی پێغەمبـــەر لانـــادەن بـــە مـــوو

دووبـــارە فـــەرمووی :- تـــاوەکو ئاســـان
رزگارمـــان ببـــێ لـــە خوانەناســـان

بـــڕۆین ئـــە لێـــرە بـــۆ جێگـــایێ تـــر
ڕێگـــاش بگـــۆڕین بـــۆ ڕێگـــایێ تـــر

پیـــاوێ لـــە ( بـــەرەی ئەســـلەمی) لـــەو کـــات
کـــاتێ پێغەمبـــەر فـــەرمووی ئـــەویان هـــات

ئـــەو ڕێگانـــاس بـــوو کەوتـــە پـــێش یـــاران
ســـلاوی لـــێ بێـــت وەك لێزمـــەی بـــاران

لـــە (حودەیبیـــە) وەســـتان خواناســـان
تـــاکو بـــزانن چـــەند دەنـــگ و باســـان

ئەوســـا ڕۆیـــشتن بـــۆ لای پێغەمبـــەر
وتیـــان :- فیـــدات بـــین پێـــشەوا و ســـەروەر

لەبـــەر بـــێ ئـــاوی بـــێ ســـوودە ئێـــرە
ئەســـتەمە بۆمـــان مانـــەوە لێـــرە

پێغەمبـــەری خـــواش لـــەو کاتـــە تیرێـــك
دەریکـــرد و دای بـــە دەســـتی ژیرێـــك

لـــە بنـــی بیرێـــك ئـــەویش چـــەقاندی
بـــیر پـــڕ بـــوو لـــە ئـــاو کـــاتێ لەقاندی

گـــــەورەیی بـــــۆ تـــــۆ خـــــودای کردگـــــار
لـــە بـــۆ بەنـــدەی خـــۆت ئاســـان دەکـــەی کـــار

قورەیـــــشیش هـــــەرگیز دانـــــانێن باویـــــان
بۆیـــــە چـــــەند کەســـــیان ناردنـــــە ناویـــــان

کـــاتێ کـــە دەچـــوون چـــاویان پـــێ دەکـــەوت
کـــەوا شـــەڕ خـــوازنین بۆیـــان دەردەکـــەوت

کـــــە موســـــڵمانان بـــــە ســـــەرفرازی
ئەنجامـــــدەن ئـــــەوەی دڵیـــــان دەخـــــوازی

دوا کەســـــیان (عـــــەروە) وەکـــــو نوێنـــــەر زوو
بـــــۆ نـــــاو کۆمـــــەڵی موســـــڵمانان چـــــوو

بـــانگی کـــرد لـــەو کـــات هـــەروەك و ســـەرخۆش
چـــیتان مەبەســـتە ، خـــەڵکی شـــەڕفرۆش

پێغەمبـــەری خـــواش فـــەرمووی :- بومەســـتە
تـــــاکو بزانـــــی چـــــیمان مەبەســـــتە

فـــەرمووی :- ئـــەی (عـــەروە) زۆر بـــاش بگـــرە گوێـــت
بـــۆ (عـــەمرە) هـــاتووین چـــیترمان ناوێـــت

لـــەڕۆخی یـــەك بـــوون ئەوســـا هـــەردووکیان
لـــە گفتوگـــۆ بـــوون ، بگـــەن بـــە پـــەیمان

پاشـــانیش (عـــەروە) زۆر بەدڵگـــەرمی
دەســـتێکی مـــاڵی بـــە ڕیـــشی نـــەرمی

کــــه دەســـــتی بـــــرد بــــۆ ڕیــــشی ســــەروەری
لــــــه دڵـــــی یــــــارانی کــــــرد کاریگــــــەری

تــــووره بـــــوو بەمــــــه یــــــەك لــــــه یارەکــــــان
دەســــــتی (عــــــەروه)ی گــــــزت ، تونـــــدی ڕاتــــــەکان

وتـــــی :- ئـــــەی (عــــــەروه) دەســــــت لاده لەســــــەر
ڕیــــــــشی پـــــــیرۆز و پــــــــاکی پێغەمبــــــــەر

(عــــــەروه) دوای ئەمــــــــه کــــــــەمێك مایــــــــەوه
لــــــــەدوای گفتوگــــــــۆ ســــــــووك گەڕایــــــــەوه

گەڕایــــــــــەوه لای خــــــــــەڵکی (قوڕەیــــــــــشی)
وتــــــی :- شــــــورەییه گــــــەر بــــــچنه پێــــــشی

(موحەممــــــــــەد) کــــــــەوا هاتۆتــــــــه ئێــــــــره
شــــــــەڕی ناوێــــــــت و مەبەســــــــتی خێــــــــره

باشــــــیش بــــــزانن ، وتــــــی :- بــــــه خــــــەڵکی
ئاگــــــــادار نــــــــەبن لــــــــه وانــــــــه بــــــــەڵکی

لــــــه هــــــەر بارەیــــــەك ئەگــــــەر دەپرســــــن
دلێــــــــــر و مــــــــــەردن ، زۆر چاونەترســــــــــن

مــــــن چــــــوومەته لای زۆر ســــــەرۆك تــــــیران
زۆر گــــــەوره پیــــــاو و مــــــەلیك و ژیــــــران

وەکــــــو (موحەممــــــــەد) کەســــــم نــــــەدیوه
شــــــوێن کــــــەوتوەکانی بــــــەم جــــــۆر و شــــــێوه

گـــوێ رايــــەڵی بـــن ، لــــە قـــسەی دەرنەچـــن
لــــە بــــەر دەســــــتيدا وا ئامـــــادە بـــن

بــــە تێـــری چـــاويان ســــەيريان نــــەدەكرد
بــــە دەنگــــی بــــەرز دەنگيـــان نــــەدەكرد

بـــــە يـــــــەك ئامــــــاژە فەرمانــــــەكانی
جـــێ بــــەجێ دەكرێــــت گەلــــێ بــــەجوانی

گەلــــێ زەحمەتــــە ئێـــــوە پێــــی بگــــەن
گــــــەر بتانــــــەوێ زەبــــــری لێ بـــــدەن

ئـــەو ســــەلامەت بــــێ ئــــەوان هـــــەمووويان
گرنگــــــی نـــــادەن بــــــە ئــــازار و ژان

بـــەلام قورەيـــــشی گەلــــێ نـــەگريس بـــوون
دژبــــە پێغەمبـــــەر زۆر هــــەناوپيس بــــوون

بڕيارێــــــــشی دا قورەيـــــــــشی بــــــــەفيز
نابێــــت (موحەممــــەد) (عـــومرە) كـــات هــــەرگيز

موســــــــڵمانانيش ئــــــــەوها مانــــــــەوە
بــــۆ هــــەڵێك لــــە خـــوا دەپاڕانــــەوە

ســـــەرومريش نــــاردی يـــــەكێك بـــۆ ناويــــان
بزانـــێ ، مــــاوە خـــوێن لەبـــەر چــــاويان؟

جــــا ئـــــەويش دەڕوا زۆر بـــــەبێ ترســــــی
تـــــاكو مەبەســــــتی لێيـــــان بپرســــــی

ئـــەو موســـڵمانەش نـــاوی (خـــەراش) بـــوو
خوداناســـێکی لەســـەرخۆ و بـــاش بـــوو

بـــەڵام (قورەیـــشی) مەســـت و ســـەرگەرم
ســـەری وشـــتریان بـــڕی بـــێ شـــەرم

هـــەروا ویـــستیان (خـــەراش) بکـــوژن
وەك وشـــترەکەی خـــوێنی لێ بـــڕژن

بـــەڵام لـــە خۆیـــان چـــەندین سەرمەســـتێك
تـــاکو نـــەکوژرێت ، بـــوون بـــە بەربەســـتێك

لەپاشـــی ئەمـــەش (عثمـــانـــی عـــەفان)
پێغەمبـــەری خـــوا نـــاردی بـــۆ ناویـــان

کـــاتێ کـــە (عثمـــان) گەیـــشتە شـــاری
گفتوگـــۆی دەکـــرد لەگـــەڵ زۆرداری

تـــاکو بـــۆ (عـــومرە) ڕێگـــا دەن ، بـــێڵن
چـــونکە خواناســـان ڕاســـت و بـــێ فـــێڵن

ئـــەوانیش وتیـــان :- ئـــەمان نـــاردووە
کـــە نـــابێ هـــەرگیز ، ســـوێندمان خـــواردووە

بـــە هـــیچ جـــۆر نـــابێ (عـــومرە) کـــەن ئەمـــساڵ
بـــە نیـــازێکی وا خـــۆ مەکـــەن ســـەرقاڵ

وتیـــان :- ئـــەی (عثمـــان) تـــۆش وا لـــە (مەککـــە)ی
هـــیچ بەربەســـت نیـــە گـــەر (طـــواف) دەکـــەی

(عثمـــان)یـــش فـــەرمووی :- كـــاری وا هـــەرگیز
بـــــەر لەســـــەرومری لێهـــــاتوو و ئـــــازیز

ناكـــەم ، ئەگـــەر چـــی جێـــی هیـــوا و خێـــرە
مـــن بـــەو مەبەســـتە نەهاتمـــە ئێـــرە

(قورەیـــشی) دووربـــوون لـــە دڵنـــەرم بـــوون
چـــونكە دڵـــرەش و زۆر بـــێ شـــەرم بـــوون

ئـــیتر لـــە (مەككـــە) (عثمـــانی عـــەفان)
دەیكـــرد ســـەردانی یـــاری موســـڵمان

پاشـــان ناپاكـــان وەكـــو نیـــوە هێـــز
پـــەنجا كەســـێكی سەرمەســـت و بـــێ رێـــز

بـــۆ ئـــەوەی بـــڕۆن كـــەوا لـــەولاوە
دایبگیرســـێنن ئـــاگری ئـــاژاوە

پێغەمبـــەری خـــوا لـــەبۆ بـــەرگری
كـــوڕی ســـەلەی نـــارد ، پێـــشیان لێبگـــری

ئـــەو شـــێرە ســـوارەش نـــاو (موحەممـــەد) بـــوو
ژیـــرو لێهـــاتووی گـــەلێ نەبـــەرد بـــوو

وەك شـــێری بێـــشەی مـــەرد و هەڵمـــەت بـــەر
هـــەر هـــەمووی كردنـــە دیـــل و دەســـت بەســـەر

چـــونكە مانگەكـــەش رێـــزدار بـــوو بۆیـــە
كەســـیان نەكوشـــتن لەبـــەر ئـــەو هۆیـــە

پێغەمبـــــەر پاشـــان ئـــازادی کـــردن
ڕزگـــاربوون ئـــیتر لـــە مـــەرگ و مـــردن

ئەوســا (قورمیـــشی) و گـــشت خـــەڵکی نـــەفام
بـە کـــرداری وا گـــەلـــێ بـــوون ســـەرسام

# پەیمانی (رضوان)

(عثمـــانی عفـــان) بـــە دواکـــەوت کـــەمێك
یـــاران چـــوونە ژێـــر بـــاری چـــەند خـــەمێك

ســـــــۆراغی نـــــــەبوو ، زوو نەگـــــــەڕاوە
وایـــــان گومـــــانکرد ، (عثمـــــان) کـــــوژراوە

ئەوســـــا پێغەمبـــــەر گـــــوڵی نێـــــو باخـــــان
گـــەڵێ غـــەمبار بـــوو فـــەرمووی لـــە داخـــان :-

هـــەرگیز بـــەبێ جـــەنگ نـــاڕۆین نـــەلێرە
چـــیمان بەســـەر بـــێ لـــەڕێی خـــوا خێـــرە

جـــا کـــە بـــانگی کـــرد پێغەمبـــەری خـــوای
هـــەر هـــەموو یـــاران خێـــرا چـــوونە لای

لـــە دەوری کـــۆ بـــوون هـــەموو بـــەجارێ
هـــەر هـــەموو لـــە ژێـــر ســـێبەری دارێ

ســـەرومەریش فـــەرمووی :- یـــاران بـــە تاکـــە
ئەگـــەر پـــەیمانم بـــدەنێ چـــاکە

یـــاران فـــەرموویان :- ئـــەی پێغەمبـــەرمان
لەگـــەڵتاین ، ئەگـــەر تێبـــچێ ســـەرمان

یەکەیەکـــە چـــوون ، بـــەڵێنیان بەســـتی
بەڕاســـتی ، دەســـتیان خـــستە نـــاو دەســـتی

ئەگـــەڕابوەوە (عثمـــان) لـــەوکاتی
ســـەرومەر بـــەڵێنی بەســـتی لـــە جیـــاتی

لــــە ترســـی پـــەیمان دوو ڕووێکـــی پـــیس
لـــــە پـــەنای وشـــتر زۆر پـــیس و نــــەگریس

تـــاکو نـــەیبینن خـــۆی حەشـــار دابـــوو
چـــونکە بڕواکـــەی هـــەر لـــە زار دا بـــوو

ئەوانـــەی لـــە ژێـــر دار بـــە سەربەســـتی
پـــەیمانیان لەگـــەڵ پێغەمبـــەر بەســـتی

مـــژدەی بـــۆ نـــاردن خـــودای میهرەبـــان
کـــەوا خۆشـــبووە لەوانـــە هـــەموان

دڵخۆشـــی و ورە پـــڕ بـــوو لـــە ناویـــان
ئەگـــەر چـــی مـــردن هـــاتبۆ بـــەر چـــاویان

دەیـــان وت :- ئێـــستاش نـــەبێ ، پـــاش کـــەمێ
لەگـــەڵ قورەیـــشی شـــەڕ هـــەر دەقـــەومێ

لـــەم گوفتـــارە بـــوون ســـەروەر و یـــاران
گـــەڕاوە ناویـــان (عثمـــانی عـــەفان)

چـــۆ لای پێغەمبـــەر ، کـــە گەڕایـــەوە
باســـی (قورەیـــشی) بـــۆ گێڕایـــەوە

فـــەرمووی :- (قورەیـــشی) دەزانـــن حـــەقی
بـــەڵام هـــەر ســـوورن لـــە ســـەر دڵڕەقـــی

لـــە دوای هاتنـــەوەی (عثمـــانی عـــەفان)
(قورەیـــشی) چـــوونە ژێربـــاری دامـــان

وتیـــــان :- بقـــــەومێ ئـــــازاوە ، ڕەنگـــــە
تاوانبـــــار بــــبین ئێمـــــە لــــەو جەنگـــــە

(ســـوهەیلی عـــەمر) لـــەو کـــات هەڵدەســـتێ
بـــــۆ موســـــڵمانان دانـــــێ بەربەســـــتێ

چـــونکە پـــێش ئیـــسلام زۆر کەللـــەڕەق بـــوو
دوژمنـــــی هـــــەموو کـــارێکی حـــەق بـــوو

وتـــی :- (موحەممـــەد) هـــاتووم بـــە هـــەرحاڵ
کـــە (عـــومرە) نەکـــەن ، بـــچنەوە ئەمـــساڵ

یـــاران بـــەو مەرجـــە خـــەمیان هاتەســـەر
بـــەڵام دەرنەچـــوون لـــە قـــسەی پێغەمبـــەر

پاشـــان (ســـوهەیل) وتـــی :- دوو هـــەم خـــاڵ
نـــابێ جـــەنگ ببـــێ تـــا مـــاوەی دە ســـاڵ

پێغەمبـــەری خـــواش زوو پێـــی ڕازی بـــوو
ئەگەرچـــی یـــاران بۆیـــان تـــازی بـــوو

ســـێهەمین خـــاڵیش هەرکەســـێ لـــەوان
هـــەڵات بـــۆ ناویـــان بـــوو بـــە موســـڵمان

دەبێـــت بـــۆ هـــۆزی بگەڕێتـــەوە
ئـــەوەکا پـــەیمان هەڵـــوەشێتەوە

موســـڵمانانیش هەرکەســـێ ئەگـــەر
چـــوونەوە ناویـــان ، نەدرێنـــە ســـەروەر

خـــاڵی چـــوارەمیش نابێـــت هـــیچ لایـــەك
بـــە هـــیچ شـــێوەك و بـــە هـــیچ ڕێگایـــەك

هێـــرش ببەنــــە ســـەر هاوپـــەیمانان
هــــی (قورەیـــشی) بــــێ یـــان موســـڵمانان

ئـــەو چـــوار خاڵانــــە لای یـــاران زۆر بـــوون
ئـــیتر ســـەرقاڵی پـــەیمان و مۆربـــوون

لـــەو کاتــــە دەبێــــت (ئـــەبو جەندەلـــە)
بـــۆ بەرنامـــەی خـــوا دەهـــات بـــە پەلـــە

(ئـــەبو جەندەلـــە)ی کـــوڕی (ســـوهەیل)ی
بـــۆ خواناســـیەتی ڕاســـت ببـــوو مـــەیلی

(ســـوهەیل)یـــش وتـــی ئـــا بـــەو دڵێـــرە
شـــێت بـــووە ، بۆیـــە هاتۆتـــە ئێـــرە

گـــەر نەمدەنـــەوە ئاشـــەم نەزانـــە
هـــەرگیز مۆرناکـــەم مـــن ئـــەم پەیمانـــە

هـــەر چـــەند هـــەوڵی دا پێغەمبـــەری خـــوای
بـــەڵام (ســـوهەیل) ســـوور بـــوو لـــە داوای

(ئەبوجەندەلـــــــە)ش دەپاڕایـــــــەوە
بـــەڵام پێغەمبـــەر هـــەر پێیدایـــەوە

ئەوســـا داوای کـــرد ســـەروەر لـــە (ئـــەوس)ی
تـــاکو پـــەیمانیان لـــە بـــۆ بنوســـی

(ســـوهەیل)یـــش وتـــی :- (ئـــەوس) نـــا ، (عثمـــان)
ئەگـــــەر نـــــا (عـــــەلی) بنوســـــێ بۆمـــــان

بنووســـــە (عـــــەلی) ، پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی
(بـــسم اللـــــه الـــــرحمن الـــــرحيم) بـــــۆی

ســـــوهەیل وتـــــی بـــــە بـــــاوکی قاســـــم :-
مـــــن ئـــــەو ڕەحمانـــــە هـــــەرگیز نـــــا ناســـــم

ئەوســـــاکە وتـــــی ئـــــەو زمـــــان لووســـــە
(بـــــسمكَ اللـــــهمّ) ، وا بنووســـــە

پاشـــان پێغەمبـــەر فـــەرمووی بـــە(عـــەلی)
بنووســـــە کـــــەوا لەگـــــەڵ (ســـــوهەیل)ی

پێغەمبـــەر ڕێککـــەوت بـــەو چـــوار خاڵانـــە
کـــە شـــەڕ روونـــەدات هێنـــدە ســـاڵانە

(ســـــوهەیل)یـــش وتـــی زۆر بەشـــانازی
گـــەر وا بنوســـی پێـــی نـــابم ڕازی

چـــونکە ئەگـــەر مـــن بـــڕوام هەبوایـــە
کـــەوا (موحەممـــەد) نوێنـــەری خوایـــە

موســـــڵمان دەبـــــووم یەکـــــەم هەناســـــە
هـــەرگیز نەمـــدەکرد ئـــەو دەنـــگ و باســـە

بـــەڵام پێغەمبـــەر نەیفـــەرموو ، نـــابی
نـــاوی خـــۆی پاشـــان (عبداللـــە)ی بـــابی

(عـــەلی) بـــۆی نووســـی لـــەو کـــات و دەمـــی
بەدەســـــت لــــەرزین و بــــەدڵ پــــڕ غــــەمی

بــــە گفتوگۆیـــــان ئــــیتر کۆتــــا هــــات
(ســـوهەیل)یـــش هەســـتا ، ویـــستی ، کـــە بـــڕوات

کورەکـــــــەی خۆشـــــــی (ئەبوجەندەلــــــــە)
بــــە پێـــشی خـــۆی دا ، ڕۆیـــشت بـــە پەلـــە

(ئەبوجەندەلـــــە)ش هــــــەردەیکرد هـــــاوار
مەمدەنــــــەوە دەســـــت خــــەڵکی تاوانبـــــار

دەبیـــــنن ، کـــــە وا چـــــم بـــــە ســـــەردێنێ
لـــــەوەش دەترســـــم بـــــڕوام نـــــەمێنێ

پێغەمبـــــەری خـــــواش پێـــــی دەوت :- گیانـــــە
ئـــــارام بنوێنـــــە ، خـــــوا میهرەبانـــــە

بـــــە بینینـــــی ئـــــەم دیمەنـــــە یـــــاران
غـــــەم بـــــاری بۆیـــــان هـــــەروەکو بـــــاران

ئەوســـــا (عومـــــەر)ی کـــــوڕی (خطـــــاب)ی
(ئەبوجەندەلـــــە)ی دیـــــت لەگـــــەڵ بـــــابی

زۆر غەریبانـــــــە هاتـــــــە بەرچـــــاوی
بۆیـــــە هەســـــتا ، چـــــوو ، بـــــە ڕاشـــــکاوی

وتـــــی بـــــە (ئەبوبـــــەکر) و بـــــە ســـــەروەر:-
ڕاســـــتە ئـــــەو دینـــــەی کـــــە ئێمـــــەی لەســـــەر؟

لـــــەو بارەیــــــەوە ، (عومـــــەر) زۆر دەڵـــــێ
بــــەڵام پێغەمبـــــەر هـــــەر فـــــەرمووی :- بــــەڵێ

لــــە دوای چـــەند پرســـیار ، ئەوســـاکە (عومـــەر)
دیـــــــسانەوە ڕووی کـــــــــردە پێغەمبـــــــەر

وتــــی :- کـــــە ئێمـــــە حـــــەقین و حـــــەقبین
بــــا لــــە پێنــــاو دیـــن کـــەمێکیش ڕەق بـــین

پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی بـــــەو پـــــەڕی ڕێـــــزی
خواوەنـــــــــدی گـــــــــەورە دەمانپـــــــــارێزی

ئەوســـــا خواناســــــان بــــــە نــــــا نومێـــــدی
لــــە (عـــومەرە) شـــل بـــوون هـــەر هێـــدی هێـــدی

ســــەروەر پێـــی فـــەرموون ، خواناســـی باشـــن
دیــــــاری ســــــەربېڕن ، ســــــەریش بتاشــــــن

ســـێ جـــار لەســـەر یـــەك پێغەمبـــەر فـــەرمووی
کەســـــێ هەڵنەســــتا بێـــدەنگ بـــوون هـــەمووی

پێغەمبــــەری خـــــواش زۆر خەفـــەت بـــار بـــوو
بــــەڵام بــــە ویـــستی خـــوای کردگــــار بـــوو

جـــــا (دایکـــــی ســــەلە) وەکـــــو خێزانـــــی
پێـــی وت:- بۆچـــی وای؟ کـــاتێ پێـــی زانـــی

ســــەروەریش فـــەرمووی :- ئـــەی دایکـــی (ســـەلە)
شــــــتێ زۆر خـــــراپ هــــــاتووە بەســـــــەرما

وتم بـــە یـــاران ، ســـەرتان بتاشـــن
بـــە گوێمیـــان نـــەکرد ، ئەگەرچـــی باشـــن

ئەوســـا خێزانـــی وتـــی :- وا باشـــە
هەســـتە ، بـــەر لـــەوان ســـەرت بتاشـــە

چـــونکە یارانـــت خواناســـی ژیـــرن
نـــا حـــەقیان مـــەگرە ، چـــونکە دلگـــیرن

ئـــەو رایـــەی وەرگـــرت ســـەروەر بـــە باشـــی
دیـــاری ســـەربڕی و سەریـــشی تاشـــی

دڵـــی یـــارانی بێگـــەرد و پاکـــە
پێیـــان دانایـــە شـــوێن پێـــی ئـــەو چـــاکە

لـــە دوای ئـــەوکارە یـــاران و ســـەروەر
بـــەرەو مەدینـــە ڕێیـــان گرتەبـــەر

جـــا (عومـــەر) دەڵـــێ :- ئـــەو کـــات بەترســـی
ســـێ جـــار شـــتێکم لـــە ســـەروەر پرســـی

بـــەلام داخەکـــەم هـــیچ نـــەبوو دەنگـــی
دەڵـــێ ، هەســـتم کـــرد زۆر بـــەدڵ تـــەنگی

پاشـــان زۆر ترســـام ، هـــەلاتم بـــە غـــار
نـــەوەك ، دەربـــارەم ئایـــەت بێتـــەخوار

ئینجـــا هاتـــە دوان ســـەرداری ســـەروەر
فـــەرمووی :- گـــوێ بگـــرە لـــەو مـــژدە (عومـــەر)

وابــــــۆم هـــــــات (إنـــــا فتحنـــــا لـــــكَ)
کـــەوا ســـاڵی تـــر دەڕۆیـــن بـــۆ (مەککـــە)

کـــاتێ ئایـــەت هـــات هـــەموو خواناســـان
لـــە لایـــان نـــەما پـــەســـتی و هـــەراسـان

# ڕووداوی (ئەبو بەصیر)

یـــــــەکێ تـــــــریش وەك (ئەبوجەندەلـــــــــە)
یـــــاران بینیـــــان دەهـــــات بـــــە پەلـــــە

(ئـــەبو بەصـــیر) بـــوو ، کـــاتێ هاتـــە پـــێش
دەروونـــــی خـــــەڵکی پـــــڕ دەکـــــرد لـــــە ئـــێش

دەرچـــــووبوو لـــــە ژێـــــر یاســـــای هەڵـــــەکار
خـــۆی کوتایـــــە نـــــاو خـــــەڵکی بـــــڕوادار

پێغەمبـــــەری خـــــواش پێـــــی فـــــەرموو :- گیانـــــە
چـــــونکە پـــــەیمانێك لـــــە نێوانمانـــــە

وا باشـــــە ، هەســـــتی ، بـــــچیەوە ناویـــــان
بـــــەڵام نەچـــــیەوە ژێربـــــاری باویـــــان

لـــــەو کاتـــــەش لـــــەوان دوو دوژمنـــــی خـــــوای
هـــــەر لـــــە (مەککـــــە)وە هاتبوونـــــە دوای

دەیـــــانبردەوە جـــــا ئـــــەو دوو کەســـــە
دەچـــــوون بـــــە ڕێگـــــا قـــــسە بـــــە قـــــسە

ئـــــەویش بـــــەنیازی کوشـــــتن و مـــــردن
لـــــە ڕێگـــــا بـــــە قـــــسە ســـــەرقاڵی کـــــردن

لێیـــــان نزیـــــك کـــــەوت ئـــــەو مـــــەردی دلێـــــر
تـــــا دەســـــتی ئـــــاڵا لـــــە دەســـــکی شمـــــشێر

جـــــا(ئـــــەبو بەصـــــیر) یـــــەکێکیانی کوشـــــت
ئـــــەوی تریـــــشیان هـــــەڵات پـــــشتا و پـــــشت

دوای مـــــاوەیێ کــــەم وەك جـــاری جـــاران
هاتـــــەوە بـــــۆ لای ســــەروەری یـــــاران

کــــاتێ هاتـــــەوە بـــــۆ لای پێغەمبـــــەر
تێگەیـــشت ، دەبـــێ چـــی بکـــا یەکـــسەر

بۆیـــە ، هەســـتا ، چـــوو بـــۆ جێگــایێ دوور
چـــوو لـــە بـــۆ شـــوێنێك نزیـــك دەریـــای ســـوور

ئەوســـا بـــیری کـــرد (ئەبوجەندەلـــە)
کـــەوا لـــە دەســـتی ئـــەڕوا ئـــەم هەلـــە

ئـــەویش دڵـــسۆزی خـــوای کردگـــار بـــوو
وەك (ئەبوبەصـــیر) ، لـــە بـــت بێزاربـــوو

ئەوســـاکە هەســـتا وەکـــو شـــێری شـــەو
نەوەســـتا تـــاکو خـــۆی گەیانـــدە ئـــەو

بـــوون بـــە حـــەفتا کـــەس بـــە ووردە ووردە
(ئەبوبەصـــیر)یـــش بـــوو بـــە ســـەرکردە

لـــە بـــۆ (قورەیـــشی) بوونـــە ســـەر ئێـــشە
ڕووتیـــان دەکـــردن بـــە شـــەڕ و کێـــشە

هەریـــەکیان لـــەوان دیبـــا ، دەیانکوشـــت
نزیـــك و دوور بـــا ، هـــەر خوێنیـــان دەڕشـــت

ئەوســـا (قورەیـــشی) بـــەوە بـــوون ناچـــار
بۆیـــە بـــۆ ســـەروەر بردیـــان هـــاوار

بـــــه هـــــاوارێکی نـــــەرم و خزمانـــــه
وتیـــان :- (موحەممـــەد) ئـــەو چـــەند کەســـانه

بێنـــــەوه لای خـــۆت ، لـــــه کۆڵمـــــان کـــەوه
ئـــەو مەرجـــەش لـــه نـــاو پـــەیمان بـــسڕەوه

پێغەمبـــــەری خـــواش بـــەڕێز و هەســـت بـــوو
لـــه هـــەموو کارێـــك ئاشـــتی مەبەســـت بـــوو

بـــــۆ (ئەبوبەصـــــیر) نامەیـــــەکی نـــــارد
کـــه نامەکـــه چـــوو ئـــەو گیـــانی دەســـپارد

تـــەرمی ئـــەو شـــێره ، مـــەردی بـــێ وێنـــه
ئەســـپەردەیان کـــرد بـــه خـــاك لـــەو شـــوێنه

# فەتح كردنی قەلاّی (خەيبەر)

بـــــەهاوكاری خـــــوا وا دەرۆينـــــــە ســـــەر
ئـــــازادكردنی قەلاّكـــــــەی (خەيبـــــــەر)

جوولەكـــــەیێ زۆر لـــــە نـــــاو خەيبـــــەر بـــــوون
دوژمنـــــی ســـــەختی خـــــوا و پێغەمبـــــەر بـــــوون

ســـەد ميـــل لـــە بـــاكور دوور دەبـــوو (خەيبـــەر)
لـــــە (مەدينـــــە)وە ، شـــــاری پێغەمبـــــەر

بـــــەلاّم پێغەمبـــــەر لـــــە هـــــەموو شـــــوێنێ
دوژمنـــــانی خـــــوا لـــــە رەگ دەردێنـــــێ

ئينجـــــا پێغەمبـــــەر فرمـــــانی دەركـــــرد
پێويـــــستی شـــــەڕيان هـــــەلگرت دەســـــت و بـــــرد

چـــــونكە بـــــە هـــــەلی زانـــــی پێغەمبـــــەر
هێرشـــــێك ببـــــات بـــــۆ قـــــەلاّی (خەيبـــــەر)

هـــــەزار و چوارســـــەد كەســـــی كـــــۆكردن
چـــــاونەترس بـــــوون لـــــە ئاســـــتی مـــــردن

ئـــــەوانيش ئـــــەوبوون كـــــەوا لـــــە بـــــن دار
بەلێنيانـــــدابووە ســـــەرداری نـــــازدار

ئـــەو يارانـــە هێنـــد تامـــەزرۆی جـــەنگ بـــوون
دلێـــــر و مـــــەردی رۆژگـــــاری تـــــەنگ بـــــوون

(ســـــەباع)ی دلێرلـــــەو راپەرينـــــە
كرايـــــە جـــــاودێر لەســـــەر (مەدينـــــە)

ئــــیتر لــــەو کـــاتی ڕێیـــان گرتەبــــەر
بـــــەرەو جوولەکـــــەی قەلاّکــــەی (خەیبــــەر)

لــــەلای قـــــەلاّکان کـــاتێ وەســــتا هێـــز
تــــا لــــە ڕەگ دەرکـــــا دەســــتەی شـــەڕانگێز

کــــە لــــە خـــــەو هەســـتان کـــاتی بـــــەیانی
زۆربــــــــــێ ئاگــــــــابوون ، نەیانـــــــــدەزانی

هــــەموو دڵــــڕەش بـــوون هـــــەروا خوانـــــەناس
هــــەڵیان گـــــرت قازمــــە لەگــــەڵ خاکــــەناس

بـــــەیانی زوو زوو وەکــــو هــــــەموو جــــار
بـــــۆ نـــــاو کێلگـــــە چـــوون خـــەڵکی کرێکــــار

کـــــاتێ بینیــــــان هێـــــزی خواناســــــــان
ترســـــان و یـــــەك جـــارێی بـــوون هەراســــان

مـــــــردن نزیــــــــك بـــــــوو زۆر لێیانــــــــەوە
بۆقــــــــــــــەلاّکانیان زوو گەڕانـــــــــــــــەوە

وەکـــــو بـــــەرازی بــــــەد و وره ســـــــــت
چـــــوونەوە قـــــــەلاّ دەرگایــــــان داخـــــست

(ســــەلامی مـــــشکی) ئــــەو بـــوو ســـــەرۆکیان
کەوتــــــــە ڕاوێـــــــژ و گرتـــــــی بـــــــەرۆکیان

وتـــــی :- ئــــەی خەڵکـــــە گـــــەر کۆڵــــدەن ئێـــوە
شـــــەرمەزار دەبـــــین بـــــە هـــــەموو شـــێوە

جـــا یـــاران لـــەوکات بـــەخۆ و ئالآیـــەك
كـــە هـــەڵیان دا بـــوو نزیـــك قەلآیـــەك

(خـــەباب) هـــات ، وتـــی :- ئـــەی گـــەورەی یـــاران
ئێـــرە بـــاش نیـــە لەبـــەر تیربـــاران

پێغەمبـــەری خـــواش زانـــی ، كـــە وایـــە
كـــەمێ بـــەدوور كـــەوت لەســـەر ئـــەورایـــە

ئەوســـا خواناســـان زۆر بەدەســـت و بـــرد
بـــۆ خـــودا نوێـــژی بەكۆمـــەڵیان كـــرد

ئـــالآی ئـــەو هێـــزە بـــڕوا بەتینـــە
درایـــە دەســـتی خـــەڵكی (مەدینـــە)

شـــەڕ دەســـتی پێكـــرد تـــاكو خۆرئـــاوا
ســـەركەوتن بـــۆ كـــەس نـــەهات لـــەخواوە

یارێـــك شـــەهید بـــوو ، (ســـەلام)یـــش كـــوژرا
خـــوێنی گـــلآوی بـــە فـــیڕۆ ڕێـــژرا

چـــەند ڕۆژی خایانـــد ، كـــەمێ بێـــزار بـــوون
لـــە هـــەردوو لایـــان گـــەڵێ زامـــداربوون

ئینجـــا ئالآیـــان دا (ئەبوبـــەكر)
ئـــەو پاڵەوانـــە بـــوو بـــە سەرلەشـــكر

جـــا لـــە دوای ئـــەویش درا دەســـت (عومـــەر)
بـــەلآم پێـــی نـــەكرا ئـــەویش چارەســـەر

بەویستی خودا سەروەر دەیزانی
هەربۆیە فەرمووی :- سبەی بەیانی

ئاڵا و بەیداغی یەکتاپەرستی
بە هاوکاری خوا دەدەم بەدەستی

مەرد و ژیرێکی وا کە هەمیشە
خۆشەویستی خوای گەورە و منیشە

(عومەر) لەو کاتی دەیفەرموو :- خوایە
بریا ئەو کەسە هەرمن بوومایە

بوو بە بەیانی ئەوسا پێغەمبەر
فەرمووی :- بۆم بانگ کەن (عەلی) بەختەوەر

ئەوسا یارێکی لێ هاتە پێشی
وتی :- ئەی سەروەر ئەو چاوی دێشی

(عەلی) پاڵەوان گوێی لێ بوو لەو کات
گوێی نەدا ئازار بەدەمیەوە هات

کاتێ (عەلی) هات بە چاو بەسراوی
سەروەر نزای کرد ، چاك بۆوە چاوی

چاوەکەی چاك بوو هەتاهەتایە
لە پاشان ئاڵای سوپاکەی دایە

لەوکات پێغەمبەر بۆ (عەلی) دلێر
کردی زۆر نزای پڕ لە بەهاو خێر

تـــــاوەكو (عــــــەلی) لـــــەژیانا مــــــابوو
لـــــەژێر چـــاو دێــــری میهــــری خـــودا بـــوو

تینـــــی تـــــیٚ نـــــەكرد زســــتان و ســــەرما
هـــــەروا هــــــاوینیش نەیــــــدەدی گـــــەرما

ئەوســــا كــــە (عــــەلی) وەكــــو ســــەركردە
لــــە پێــــشەوەی هێــــز چـــــوو وردە وردە

بەدەســــــتیەوە بــــــوو لــــــەوكات ئالآكـــــە
ڕۆیـــــــی تـــــاوەكو بــــــەردەم قەلآكــــــە

ئەوســـــا ڕووبـــــەڕووی پــــیس و ناحــــەقان
وەســــتا و ئالآكــــەی لـــــە خـــــۆلآ چــــەقان

دۆڕاوێـــــك نــــاوی (مەرحــــەب) بـــوو ئەوســــا
گـــــەورەی قـــــەلآ بـــوو بـــۆ مەیـــدان هەســــتا

(عــــەلی) بـــۆی چـــۆ پـــێش گـــەلیٚ بەمـــەردی
لاشـــــەی گــــلآوی خــــستە ســــەر عــــەردی

پاشــــان بــــۆ قـــــەلآ هێرشـــــێكیان بــــرد
بـــــە هاوكـــــاری خـــــوا زوو ئازادیــــان كــــرد

ئەوســــا جوولەكـــــەی بـــــەد و نــــابڕوو چــــوو
بــــۆ قـــــەلآیٚ تـــــر هــــــەلآتن هـــــەموو

بـــــەلآم وەك (مەرحـــــەب) یاســــر هاتـــــەپێش
تـــــاكو بــــە (زوبێـــــر) بگەیــــەنیٚ نـــێش

(زوبێـــــر) لـــــەبۆی چـــوو بـــــەدەروونی پـــاك
خـــوێنی (یاســـر)ی تێكـــەڵ كـــرد بـــە خـــاك

(ئەبودوجانـــــــە) و (حـــــــەباب)ی بـــــوێر
یەكـــــە و یـــــەكێكیان كوشـــــتن بـــــە شمـــــشێر

بـــــە هاوكـــــاری خـــــوای بالأدەســـــت و تـــــاك
قـــــەلاّ بـــــە قـــــەلاّ لێیـــــان كـــــرا پـــــاك

بـــــەلاّم خۆیـــــان گـــــرت لـــــە دوایـــــن قـــــەلاّ
لـــــە مـــــاڵ و خۆێنیـــــان ببوونـــــە بـــــەلاّ

زۆربـــــێ هـــــودە بـــــوو هـــــەوڵی خواناســـــان
هیـــــچیان بۆنـــــەكرا زەحمـــــەت یـــــا ئاســـــان

كـــــە مەنجـــــەنیقیان لێ خـــــستنەكار
وەرەی جوولەكـــــە تـــــەواو هاتـــــە خـــــوار

قـــــەلاّ و خانوویـــــان بەســـــەردا ڕمـــــا
بۆیـــــە مـــــل كـــــەچ بـــــوون ، چـــــارەیان نـــــەما

ســـــەرۆكەكەیان هـــــەنارده خـــــوارێ
هـــــەتاكو بۆیـــــان وەبینـــــی چـــــارێ

لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەر پاشـــــان دانیـــــشتن
لەســـــەر چـــــەند مـــــەرجێك بەیـــــەك گەیـــــشتن

ئینجـــــا ســـــەروەری زۆر ژیـــــر و لێـــــزان
لـــــەبۆ جوولەكـــــە چـــــەند مـــــەرجی دانـــــان

دەبــــێ جوولەکــــە (خەیبــــەر) جــــێ بێڵــــێ
لەگــــەڵ پێغەمبــــەر نەکــــەن هــــیچ فێڵــــێ

هەریەکــــەو بارێــــك لەگــــەڵ خــــۆ ببــــەن
هەرچــــی ســــامانە حەشــــاری نــــەدەن

لەگــــەڵیان بــــچێ ژن و منــــداڵیان
یــــەك دەســــتیش پۆشــــاك لــــە هــــەمووماڵیــــان

هەرکەســــیش مــــەرجێك تێکــــدا و بــــشکێنێ
مــــافی پاراســــتن لــــە بــــۆی نــــامێنێ

ئەگــــەر چــــی مــــاڵ و زێڕیــــان حەشــــاردا
لــــە ژێــــر کــــەلاوەی ڕووخــــاوی شــــاردا

ئــــەوانیش دوو بــــوون ، کردیــــان ئــــەوکارە
بــــەلام شمــــشێریان بــــۆ بــــوو بــــە چــــارە

بــــە ســــەروەریان وت ، ئــــەو جوولەکانــــە:-
بیــــدەوە دەســــتمان گــــشت ئــــەو کێڵگانــــە

بــــا بــــەنیوەش بــــێ هەرهــــەموو بەرهــــەم
ناپــــاکیش ناکــــەین بــــایی نیودەرهــــەم

پێغەمبــــەری خــــواش پێیــــدان بــــە هــــەرحاڵ
بــــۆ ئــــەوەی یــــاران پێــــی نــــەبن ســــەرقاڵ

پێــــشیانی فــــەرموو ســــەروەر لــــە دوایــــی
بــــەلام بــــەو مەرجــــەی فــــەرمانڕەوایی

هەرگیز نابێتن لەدەستان دابێ
هەر فەرمانێکمان دا ، دەبێ وا بێ

ئەوسا زۆربەیان لەوێ مانەوە
بە ملکەچیەوە دەجوولانەوە

پێغەمبەری خواش بەلاّم بەوپەڕی
ڕێزی دەزانین زۆر بە دادگەری

هەرچی داهات بوو دەکرا بەدوو بەش
لێی سەر پشکیش بوو جوولەکەی ڕووڕەش

تا ماوەکی باش دەژیان بە چاکی
لەگەڵ جوولەکەی پڕ لە ناپاکی

تاوەکو کاتێ فەرمانڕەوایی
(عومەر)ی (خطاب) ، لە خۆبوون بایی

(عبداللەی کوڕی عومەر)ی ڕێزدار
شەو لەسەر بانی هەڵیاندایە خوار

بە دەست جوولەکەی ناپاکی بێ خێر
دەستی سەقەت بوو (عبداللە)ی دلێر

(عومەر)یش چونکە فەرمان ڕەوا بوو
دوژمنی وان و ملکەچی خوا بوو

فەرمانێکی دا ئەوساکە (عومەر)
هەموو جوولەکەی دەرکرد لە (خەیبەر)

چەندساڵ پاش کۆچی سەرداری سەروەر
جوولەکەی بەدکار ئەوهای هاتە سەر

گەر نەیکردبا ڕەفتاری گڵاو
هەرگیز نەدەکران وا پەرت و بڵاو

## گۆشتی ژەهراوی

ئەوسا سەلامی خوابێ لە سەروەر
دڵنیا بوو لە جوولەکەی (خەیبەر)

بەڵام جوولەکە هەر قین لەدڵ بوون
نەفام و دڵ ڕەق دوژمنی گوڵ بوون

بۆیە (زەینەبەی ژنی سەلام)ی
بۆ پیلان هەستا ، زۆر بە نەفامی

کەللاکێك مەڕی بە جوانی برژاند
پاشانیش ژەهری بەناویا ڕژاند

گۆشتەکەی کە برد مەبەستی وابوو
چونکە دوژمنی (رسول الله) بوو

نەمانی سەروەر ببووە مەبەستی
بۆیە ، گۆشتەکەی برد بۆ بەر دەستی

ئەوسا بێ گومان دەستیان لەبۆ برد
کاتێ خواردیان( بشیربراء) مرد

بە هاوکاری خوای گەورە و باڵادەست
ڕابەری ئیسلام خێرا پێی کرد هەست

چونکە خوای گەورە بۆی یاربوو ، بەڵێ
بۆیە ، گۆشتەکە لەو کات پێی دەڵێ

ئەی سەروەر مەمخۆ ژەهرم پێوەیە
خودا تێیگەیاند ئا بەم شێوەیە

جـــا لـــەوكات هەســـتا ، زوو بـــە دەســـت و بـــرد
(زەینەبـــــەی ژنـــــی ســــەلام)ی بـــــانگ كـــــرد

پێـــی وت :- ئـــــەی ناپـــــاك كـــــردت ئـــــەوكاره
چـــــۆن نەتـــــدەزانی خـــــوا ئاگـــــاداره؟

(زەینـــــەب)يـــش ئـــاوای پـــێ دەڵێتـــەوه
ئـــەوەی پێـــت كـــردوين نـــا شـــارێتەوه

جـــا وتم :- ئەگـــەر قـــسەی درۆ بـــن
داوا و مـــەرامی بۆخـــودی خـــۆ بـــن

لـــە نـــاوی دەبـــەم بـــەم ژەهـــر و دەرده
تـــا پـــشوو بـــدەين لەســـەر ئـــەم عـــەرده

گـــەر پێغەمبـــەر بـــێ و ڕاســـتی بنـــوێنێ
ئـــەوا خـــوای گـــەوره تێیدەگـــەیێنێ

هەنـــدێك كـــەس دەڵـــێن ، دەســـت بـــەجێ كـــوژرا
لـــە تۆڵـــەی (بیـــشر) كوڕەكـــەی ( بـــەرا)

هەنـــدێكیش دەڵـــێن لـــەوكات ســـەروەرمان
(زەینـــەب)ی بـــووری و بـــوو بـــە موســـڵمان

كۆتـــایی هـــات بـــە (خەیبـــەر) و باســـی
(پـــازده)ش لەوانـــەی خودایـــان ناســـی

بەدەســـتیان هێنـــا ســـەربەرزی ئەوســـەر
لـــە پێنـــاو خـــودا و ڕێگـــای پێغەمبـــەر

نـــــەوەد و ســـــێ كـــــەس لــــــەوانیش مـــــردن
خـــــودای بــــــە توانــــــا لــــــەناوی بـــــردن

ســـــاڵی حەوتــــــەم بـــــوو لــــــەمانگی (ســــــەفەر)
ئـــــــازادكرن و ڕزگــــــاریی (خەیبــــــــەر)

مــــــانگی ســــــەفەری ســــــاڵی هەشــــــتەمین
ســــێ پاڵـــــەوانی تـــــر هاتنــــــە نـــــاو دیـــــن

(خالیــــد بـــن ولیـــد) ، (عـــــەمری كـــوری عـــاص)
(عثمـــــان بـــــن طلحــــــە) ، بوونــــــە خودانــــاس

## بەشکردنی دەسکەوت وکۆچکەرانی (حەبەشە)

بـــــەهاوکاری خـــــوای ڕاگـــــری ئاســــــمان
کـــــۆچ و دەســــــکەوتە ئـــــەمجارە باــــــسمان

کـــــە ئـــــازادکرا هەرهـــــەموو خەیبـــــەر
کەوتـــــە ژێردەســــــتی ســــــوپای پێغەمبـــــەر

هێـــــزی خواناســــــان کاتێـــــك بەســـــەرکەوت
کۆیـــــان کـــــردەوە ســــــامان و دەســــــکەوت

پێغەمبـــــەری خـــــواش بـــــەو پـــــەڕی جـــــوانی
دابەشــــــی دەکـــــرد بـــــە ســـــەر یــــــارانی

ئـــــەو کۆچـــــکەرانەی کـــــە لـــــە (حەبەشـــــە)
مـــــاوەی (دە) ســــــاڵ بـــــوو لەبـــــەر هەڕەشـــــە

کـــــە دوورکـــــەوتبوون لـــــە یارەکانیــــــان
بۆیـــــە ، لـــــەداخان ، (مـــــردن) بـــــوو ، مانیــــان

لـــــە کـــــاتی دابـــــەش کردنـــــی ســــــامان
ئەوچـــــەند کەســـــانە گەیـــــشتنە مــــالآن

گـــــەڵ دڵـــــشاد بـــــوو بەمـــــە پێغەمبـــــەر
دوو دەســــــتی کـــــردن لـــــەملی (جەعفـــــەر)

ئەوســـــاکە فـــــەرمووی :- خۆشــــیەکەی (خەیبــــەر)
تێکـــــەڵبوو لەگـــــەڵ هاتنـــــەوەی (جەعفـــــەر)

بـــــەهۆی هاتنـــــەوەی کۆمـــــەڵێ یــــــاران
خۆشـــــی دابـــــاری هـــــەروەکو بــــــاران

کۆچـــــکەرانیش وەك خـــــەڵکی جـــــەنگاوەر
بـــەشـیـــان پــێ بــڕا بـــــە ویســـــتی ســـــەروەر

# نامه بۆ (کیسرا)

پێغەمبـــــەر بـــۆ ئــــەم دینـــــه ئارامــــــه
خـــــەڵکی بـــانگ دەکـــــرد بــــه قـــسه و نامــــه

بـــۆ گــــەورەی فــــارس نووســـی بــــه چــــاکی
بــــەڵکو لــــه دڵــــی هــــەڵکات ڕوونــــاکی

نامەکـــــەی دایــــه دەســــــتی (عبداللـــــــه)
بــــۆ خوایـــــان دەدا هــــــەوڵ و تەقـــــەلا

نازنــــاوی گـــــەورەی فــــارس (کیــــسرا) بـــوو
دۆســـــــتی تــــــاریکی و دژی چــــــرا بـــــوو

(کیـــسرا) (خەســـــرەو) بــــوو نـــاوی تــــەواوی
هەرچـــــی ڕاســــتی بــــوو نەیـــــدەدیت چـــاوی

گــــــەڵ بــــــەهێز و لـــــه خۆبـــــایی بـــــوو
ڕوورەشــــــــی دنیـــــاو ڕۆژی دوایـــــــی بـــــوو

نامـــــەی پێغەمبـــــــەر گەیـــــشته دەســــــتی
کــــاتێ خوێندیــــەوه ، پڕبـــــوو لــــه پەســــتی

چـــــونکه نووســــــرابوو لـــــه نامــــەی چـــاکی
ملکـــــەچ کـــــه بـــۆ خـــــوا و ئـــــاینی پـــاکی

وەکـــــو ســــــەر خۆشـــــان نامــــــه دەدڕێنــــێ
کۆتـــــایی بـــــه خـــــۆ و بـــــه تــــەختی دێنـــێ

وتـــــی :- چــــۆن دەبــــێ یـــــەکێ وەك ئەمـــــه
بــــــه دەســــــەڵاتی مـــــن بکـــــات گەمــــــه؟

نامـــــــەکی نووســــــــی زۆر بــــــــه ڕق و قــــــین
دایــــــــه دوو کەســــــــی نـــــــــەزان و بێـــــــدین

بـــــــەو دوو کەســـــــەی وت :- نامەکـــــــەم ببــــــەن
بیدەنــــــــــه دەســــــــتی ســــــــەرۆکی یەمــــــــەن

وای بـــــــۆ نوســــــیبوو :- دوو پیـــــــاو بنێـــــــره
تـــــــا (موحەممــــــــەد)م بــــــۆ بێننـــــــه ئێـــره

ســــــــەرۆکی یەمــــــەن نــــــاوی (بــــــازان)بـــــوو
مرۆڤـــــی (کیـــــسرا)ی مەســــــت و نـــــەزان بـــوو

زۆرداریـــــــی (کیــــــسرا) بــــــێ وێنــــــه زۆر بــــوو
وەك هەورەڕەشـــــی پـــــێش تیـــــشکی خـــــۆر بـــــوو

بۆیـــــــه شـــــــەوێکیان لــــــه نیـــــوه شـــــەوێ
بــــــه دەســــــتی کــــــوڕی کـــــوژرا لــــــه خـــــەوێ

کوڕەکـــــــەی (کیــــــسرا) نـــــاوی (شـــــێرۆ)بـــــوو
هـــــــەروەکو بـــــابی ، ڕەنـــــج بـــــه فـــــیڕۆ بـــــوو

نامـــــــه بەرەکـــــــه هـــــــەر لـــــــەو کاتـــــــەوه
لـــــــه مەملەکـــــــەتی (کیــــــسرا) هاتـــــــەوه

وتــــــی :- ئـــــەی ســــــەروەر ئـــــەی تـــــاجی ســــــەرم
نامــــــەی تـــــۆی دڕانـــــد (کیـــــسرا)ی ســــــەرگەرم

ســـــــەروەریش فــــــەرمووی :- هـــــــەر هــــــەرەس دێنــــێ
خـــــــــودا ولاتــــــــــی لــــــــێ دەڕوخێنــــــــێ

نامـــــەی (کیــــــسرا)یـــــان کـــــاتێ کــــــه هـــــانی
دایانــــــــه دەســــــــتی ســــــــەرۆك (بــــــازان)ی

چــــونكه بـــه (بـــازان) نـــەدرا بـــوو هـــەواڵ
كـــه دۆزەخ لـــه بـــۆ (كیـــسرا) بۆتـــه مـــاڵ

بۆیـــــه هـــــەناردی دوو كـــــافری وێـــــڵ
دوو خوانەناســـــی بـــــێ ڕیـــــش و سمێـــــڵ

تـــــاوەكو ببـــــەن ئـــــەو ڕووگەشـــــاوه
نەشـــــیان دەزانـــــی (كیـــــسرا) نـــــەماوه

ســـەروەر كـــه دیتـــی ، زانـــی ، نـەزانـــن
كـاســەلـێـــــسانی دیـــوەخـانـــــن

وتیـــان :- كـــه هـــاتووین لـــه بـــۆ ئـــەو نـــاوه
خواوەنـــــــدی ئێمـــــــه فـــــــەرمانی داوه

لەگـــــــەڵمان وەره بـــــــۆ لای (بـــــــازان)ی
تـــــۆ داواكـــــاری خـــــودا كـــــەمانی

ســـەروەریش فـــەرمووی :- هـــەر لـــەم شـــوێنەوه
بـــــۆ شـــــوێنی خۆتـــــان بگەڕێنـــــەوه

پاشـــــای یەمـــــەنیش تێبگـــــەیێنن
ئـــەوەی پێـــو دەڵـــێم ، پێـــی بگـــەیێنن

پێـــی بڵـــێن خـــوای مـــن ئەمـــشەو بـــەو شـــێوه
لـــــەناوی بـــــردووه خوداكـــــەی ئێـــــوه

هـــەروا پێـــی بڵـــێن بـــا بـــۆ خـــۆی چـــاك بـــێ
بـــا دڵـــسۆزی خـــوا و ئـــاینی پـــاك بـــێ

گـــــەر خـــــودا حـــــەزكا دەبینـــــێ كـــــاتێ
كـــــه دەســـــەڵاتی ئیـــــسلام دەیگـــــاتێ

گـــــەر موســـــڵمان بـــــن و بڕوابهێنـــــن
شـــــار و وڵاتـــــی لـــــە بـــــۆ دەمێنـــــن

ئـــیتر چـــــوونەوە هـــــەردوو خوانـــــەناس
بـــە (بـــازان)یـــان وت هـــەموو قـــسە و بـــاس

(بـــازان) ســـەر ســـام بـــوو ، وتـــی :- چـــۆن وایـــە
چـــــۆنی زانیـــــوە (کیـــــسرا) کوژرایـــــە ؟

گومـــــانی نـــــەما وتـــــی :- ئـــــەو پیـــــاوە
نوێنـــــــەری خوایـــــــە ، ڕەوانـــــــەکراوە

هـــەر بۆیـــە بەســـەر (قوڕەیـــشی) زاڵ بـــوو
زمـــــانی درێـــــژی جوولەکـــــە لاڵ بـــــوو

بەویـــــستی خـــــودا نـــــەرم بـــــوو (بـــــازان)
دڵ و دەروونـــــی بـــــۆ ڕاســـــتی ســـــازان

فـــەرموودەی ســـەروەر پـــاش هەشـــت ســـاڵ تـــەواو
هـــــەمووی هاتنـــــەجێ ، بینیـــــان بـــــە چـــــاو

بـــە چـــوار ســـاڵ چـــەند (شـــا) وەکـــو بەرپرســـی
بـــون بـــە پادشـــا و هاتنـــە ســـەر کورســـی

وڵاتـــــی فـــــارس شـــــێوا بـــــە جـــــارێ
وەك گـــــــەڵای زەردی وەریـــــــوی دارێ

وەکـــــو بـــــارانی نـــــەرمی بـــــەهارێ
بـــۆ ســـەر پێغەمبـــەر ڕەحمـــەت ببـــارێ

# نامە بۆ (هەرقەل)

پێغەمبەری خوا بەنیازی خێری
لەمبۆ (هەرقەل)‌یش نامە دەنێری

دەیویست بە نامە تێی بگەیەنێ
هەر بۆ خوای گەورە سەر دابنوێنێ

لەو دەم و کاتی (هەرقەل)‌ی نەفام
لە بۆ مەبەستێ هاتبووە شام

نامەی بۆ نووسی لە ماڵی خودا
نەشیدەزانی بەدەست کێیی بدا !

فەرمووی :- کێ نامەم دەبا بۆ (قەیسەر)؟
دەچێتە بەهەشت لە دونیای ئەو سەر

یەکێکیان هەستا هەر لەو کاتەوە
وتی :- ئەی سەروەر گەر نەشهاتەوە؟

سەروەریش فەرمووی :- چۆن بێ ، تەواوە
خودا بەهەشتی بۆ ئەو داناوە

جا (دوحیە) وتی :- ئەمن دەتوانم
زمانی (ڕۆمی)ش زۆر باش دەزانم

نامەکەی هەڵگرت بە قسەی سەروەر
چوو ، تاکو (هەرقەل) بکا بەختەوەر

کە دای بە (هەرقەل) ئەو نامە ناسا
وەکو داماوان داما و پێی تاسا

لـــە كـــاتی نامـــە جـــا (ئـــەبو ســـوفیان)
لـــە شـــاری وان بـــوو بـــە نیـــازی كـــاروان

كـــاتێ پێـــی زانـــی (هەرقـــەڵ)ی ئـــەفام
وتـــی :- ئەوانـــە بێـــنن لـــەبۆ لام

بـــۆ لای (هەرقـــەڵ)یـــان دەبـــەن بـــەو ڕەنگـــە
تـــا بـــاش تێبگـــا لـــەو بـــاس و دەنگـــە

ڕووی كـــردە ئـــەوان (هەرقـــەڵ) لـــەو دەمـــە
چـــونكە ئـــەو باســـە بـــۆ ئـــەو جێـــی خەمـــە

وتـــی :- لـــە ئێـــوە هەیـــە یـــەكێ وا؟
بۆتـــە نوێنـــەر و پێغەمبـــەری خـــوا

خزمـــی ئـــەو كەســـە لـــەمنێوە كێیـــە ؟
دەربـــارەی ئـــەوی پرســـیارم پێیـــە

(ئـــەبو ســـوفیان)یـــش بـــەبێ سەرئێـــشە
پێـــی وت :- خزمێكـــی منـــی لـــە پێـــشە

لـــەوكات هێنایـــان یـــەكێ زمـــانزان
لـــە بـــۆ (هەرقـــەڵ) و بـــۆ (ئـــەبو ســـوفیان)

جـــا (هەرقـــەڵ) پێـــی وت :- بـــاش گـــوێ بگـــرە لـــێم
وەڵامـــم دەوە ، ئـــەوەی پێـــت دەڵـــێم

بـــە كـــەم مەزانـــە ئـــەو پرســـیارانە
ئایـــا (موحەممـــەد) خـــۆی خانەدانـــە؟

دووەم جــــار پێــــی وت :- ئەگـــــەر بزانـــــی
کــــەس پادشـــــا بــــووه لــــــه بــــاپیرانی؟

یـــــاخو هــــیچ کەســــێك هـــــەبووه لــــه ئێــــوه
داوایـــــــــەکی وا بکــــــا بـــــــەو شـــــــێوه؟

(ئــــەبو ســــوفیان)یــــش پێـــی وت لــــەو بــــاره
لــــــــه خێزانێکــــــــی شــــــڕ و هــــــــەژاره

ئــــــەوەی دەیبیـــــنین یەکـــــــەمین جــــــاره
یەکــــــــەمین کەســــــــه ، دەکـــــات ئــــــەوکاره

جـــا (ئـــەبو ســـوفیان )دەڵــــێ بێــــچار بــــووم
لــــه بــــەردەم (هەرقــــەل) کــــز و هــــەژار بــــووم

هــــــەرکاتێ (هەرقــــەل) لــــــه منـــــی دەپرســــی
راســــــتیم پێـــــی دەوت لەبــــــەر مەترســــــی

بـــــێ دەســــــەڵات بـــــووم یـــــەکجار لــــه ئاســـــتی
بۆیـــــــه وەڵامـــــــم دەدا بـــــــه راســـــــتی

ئـــــەمجارەش (هەرقــــەل) گـــــەلێك نــــەرم و نیــــان
ئــــەم پرســــیارەی کــــرد لــــه (ئــــەبو ســــوفیان)

پێـــــی وت :- ئەوانـــــــەی بــــــڕوای پێـــــدێنن
کێنــــــــه ، هەتاســـــــەر لــــــەلای دەمێــــــنن؟

یـــــــاخود درۆتـــــــان بیســـــــتووه لـــــــەزاری
داوای چ دەکـــــــــــات ، ناکـــــــــــات زۆرداری ؟

(ئەبوســــوفیان)یــــش پێـــی وت لـــەو کاتـــە
خـــــەڵکی هـــــەزار و بـــــێ دەســـــەڵاتە

بـــــڕوای پــــێ دێــــنن لەســـــەری ســــوورن
لـــــــە پەشــــــیمانی تــــــابڵێی دوورن

نـــــە درۆ دەکـــــا و نـــــە زۆرداریـــــشە
لـــــە زیادبوونیـــــشن ئـــــەوان هەمیـــــشە

جـــا (هەرقـــەل) وتـــی :- ئـــەو چـــی دەخـــوازێ
بـــــە داواکـــــەی ئـــــەو بـــــۆ نـــــابن ڕازی؟

هـــــەروا دژی ئـــــەو شـــــەڕتان کـــــردووە
گـــــەر کردووتانـــــە کـــــێ ســـــەرکەوتووە ؟

وەڵامـــــــی داوە جـــــــا (ئەبوســـــــوفیان)
کـــــە چـــاکەکار بـــین بـــۆ خـــەڵکی و خزمـــان

دەڵـــێ تـــا خـــەڵکی لـــە زیـــان و مـــانن
دەبـــێ خـــوای گـــەورە بـــە تـــاك بـــزانن

ئـــــاژاوە و شـــــەڕیش بـــــووە بـــــە جـــــۆرێ
جـــــار ســـــەردەکەوێ جـــــاریش دەدۆڕێ

کاتێـــــك کـــــە زانـــــی پرســـــیار تـــــەواوە
(ئەبوســـــوفیان)یـــــش ئەوســـــا گـــــەڕاوە

(هەرقـــەل)یـــش وتـــی :- گـــەر قـــسەی ئەمـــە
ڕاســـت و دروســـت بـــێ ، بـــێ درۆ و گەمـــە

ئـــەو خـــاك و خۆڵـــەی كـــە لـــە ژێـــر پێمـــە
هــــــەر هـــــــەمووی داگیردەكـــــا لـــــە ئێمـــــە

بـــــــیری كـــــــردەوە ئـــــــەو هەناوڕەشـــــــە
كـــــۆی كـــــردن هـــــەموو (مـــــەتران) و (قەشـــــە)

نامـــــــەی پێغەمبـــــــەر بۆیـــــــان دەخـــــــوێنێ
بـــــــەڵام ڕوو گـــــــرژی و تونـــــــدی نـــــــانوێنێ

لەگـــــــەڵ نوێنـــــــەری پێغەمبـــــــەری خـــــــوا
بـــــــە بـــــــەزەیی و ســـــــۆز دەیـــــــوت و دەدوا

(دوحیـــــــە)ش وای زانـــــــی ، ئـــــــیتر تـــــــەواوە
بـــــــۆ ڕێگـــــــای ڕاســـــــتی دڵـــــــی گـــــــۆڕاوە

(دوحیـــــە)ی بەختـــــەوەر بـــــۆ مـــــاڵ هەڵدەســـــتی
(هەرقـــــەل)یـــــش هەنـــــدێ پـــــارەی دادەســـــتی

ئـــــیتر هاتـــــەوە لـــــەبن هـــــەتا ســـــەر
هـــــەمووی گێـــــڕاوە لـــــە بـــــۆ پێغەمبـــــەر

ســـــەرومریش فـــــەرمووی :- (هەرقـــــەل)ی دڵ ڕەق
موســـــڵمان نـــــابێ ، نایەتـــــە ســـــەر حـــــەق

ئینجـــــا پێغەمبـــــەر بـــــە شـــــێوەیەكی جـــــوان
پـــارەكـــــەی بـــــەشـــكـــرد بـــەســـــەر نـــەداران

## عمرة القضاء

ســـــاڵ ســــورِايەوە ئـــيتر وادەی هـــــات
كـــەوا پێغەمبـــەر بـــۆ (عـــومرە) بـــروات

لــــە حودەيبيــــە چـــونكە لەمەوبـــەر
وا رێككـــــەوتبون لەگـــــەڵ پێغەمبـــەر

ســـاڵی حەوتـــەمی كۆچـــی بـــوو يـــاران
مـــانگی (ذوالقعـــدة) وەك هـــەمو جـــاران

پێغەمبـــەر كـــردی بـــــە بانگـــــەوازی
دڵيـــان لـــە بـــۆ خـــوا (عـــومرە) دەخـــوازی

موســـــــڵمانانيش بەدەميەوەچـــــــوون
چـــونكە لەمێـــژە بـــەو هيوايـــە بـــوون

بـــەلاَم وای فـــەرموو هەركـــەس بەشـــدارە
لـــە (حودەيبيـــە )كەســـاڵی پـــارە

دەبـــێ هـــەر ئـــەو بێـــت بـــۆ قـــەزای (عـــومرە)
ديـــارە فـــەرمانی خواوەنـــدی نـــەمرە

دووهەزاركەســـــی خواويـــــست و بەنـــــدە
پێغەمبـــەری خـــوا بـــردی ئەوەنـــدە

پـــەيمانيش وابـــوو كـــە هەرچـــی چـــەكە
موســـڵمانەكان نەبـــەن بـــۆ (مەككـــە)

بـــەلاَم پێغەمبـــەر فـــەرمووی :- چـــەك بێـــنن
نـــەوەك (قورەيـــشی) دەســـت بوەشـــێنن

هەزاران سڵاو لە سەروەری زیر
هەموی ڕێکخستن بە شمشێر و تیر

(عویف)ی (ابارهم)ی غەففاری
چاودێر بو لەسەر مەدینەو شاری

هەرهەمو چەکیان لەشان و کۆڵە
ئیتر ڕێ کەوتن بەو دەشت و چۆڵە

سڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا
وشتری هەبوو بە ناوی (قسوی)

بۆ مەراسیمی ئەو سوود و کەڵکە
دەچوو لەپێشی ئەو هەموو خەڵکە

لە (ذوالحلیفة) سەروەر دەوەستێ
تاکو (احرامی)ی (عومرە) ببەستێ

ئینجا لە (یأجوج) کەلوپەل جەنگ
کۆیانکردەوە بەبێ دەنگەدەنگ

ئەوسا پێغەمبەر دووسەد سواری
کردە پاسەوان داینا لە دیاری

ئەو خەڵکە زۆرە بە پێی و بەسواری
پێکەو چونە ناو (مەککە) و شاری

ئەوانەی کەوا دڵیان بە ژەنگ بوو
ناخیان بەهاری وێران و تەنگ بوو

لە داخان دەرچوون لە (مەککە) و شاری
هەرکەسێ وا بێ وادەبێ کاری

پێغەمبەری خواش جیا بەسەربەستی
گەیشتە شوێنی هیوا و مەبەستی

ئیتر بە دڵێکی فراوان و ساف
جێبەجێیان کرد زۆر کارو تەواف

عبدالله ی کوڕی رەواحە بەدەنگ
لەلای سەرورەری لێهاتوو و بەسەنگ

شیعری ئەخوێندن بە ورە بەرزی
بۆ چاوی کافران ببونە دەرزی

(عومەر)یش فەرمووی ،- چۆن شەرم ناکەی
لەبەردەمی ئەو سەرورەرە پاکەی

یاخود بزانی تۆ لە چ شوێنی
چۆن شەرم ناکەی شیعران دەخوێنی

سەرورەریش فەرمووی ئەی عومەر گیانە
وازی لێ بێنە و چاکیش بزانە

لە بۆ سەر دڵ و دەروونی کافر
لە خێرای تیر دەچن خێراتر

خەڵکی موشرکیش ئەوە بووکاری
سەیریان دەکرد زۆر بە ناچاری

دڵیان دامابوو لە دیار خواناسان
قۆناغ قۆناغیان دەبڕی بە ئاسان

ئیتر لە (مەروە) بە میهرەبانی
لە بۆ خوای گەورە دەکا قوربانی

سەریشی چاك كرد جا هەر لەوێوە
موسڵمانانیش بە هەمان شێوە

دووسەد خواناسیش لە یأجوج مابوون
هەمووی رێبواری رێبازی خوا بوون

هەر بە فەرمانی سەروەری دلێر
لەسەر كەل و پەل و ببونە چاودێر

سەروەریش لەوكات خەڵكێك دەنێرێ
تا بێبەش نەبن ئەویش لە خێرێ

كاتێ كەهاتن ئەو دەستە شێرە
وەك وان دەستیان كرد بەو (عومرە) خێرە

سەروەر لە كەعبە تاگەڕایەوە
سێ ڕۆژ یا چوار ڕۆژ هێندە مایەوە

خەڵكانی موشریك هاتن لەو دەمە
وتیان ئەی عەلی دڵمان بە خەمە

بە هاوەڵەكەت بڵێ وا چاكە
ماوەی ئەماوە بڕوا لەو خاكە

سەروەریش جوانە هەموو هەموو ئاگاری
چوو لە بۆ (صرف) دەرچوو لە شاری

خــــوا ویـــــستی وا بــــوو لـــەو هــــاتو چــــونە
بــــــوو بــــــە هاوســــــەری خــــاتوو مەیمونـــــــە

جـــــا هـــــەر لــــــە مـــــاوەش دەیگوازێتـــــەوە
ڕۆژگـــــــــاری ژینیــــــــان دەڕازێتـــــــــــەوە

چـــوار نـــاوی هەیـــە ئـــەو نـــەو عـــومرە پاکـــە
هەرچـــــواریان هـــــاتوون بـــــە تاکـــــە تاکـــــە

یەکـــــەم (فدیـــــة)یـــــە ، دووەم (قـــــزا)یـــــە
ســــــێیەم قەزایـــــــە سوڵحیـــــــشی تیایـــــــە

پاشـــــان پێغەمبـــــەر لــــــە ڕێگــــــەی خــــــودا
چـــــوار ســـــریەی نـــــاردن بــــــەولاو بــــــەولادا

هــــــەزار جــــار هێنــــدەی چــــی خــــۆڵ و خاکــــە
ســــــەڵاوات لەســــــەر گــــــۆڕی ئــــــەو پاکــــــە

# جەنگی (مۆتە)

لەدوای زۆر رووداو ، هەندێك وردە جەنگ
لەشکری ئیسلام ، لەشکری بەسەنگ

خۆی کۆکردەوە دژ بە رێی هەڵە
تاکو نەهێڵێ فێڵبازی و تەڵە

لە (جەمادی یەك) ساڵی هەشتەمین
پێغەمبەر هەستا نووری سەرزەمین

سێ هەزار کەسی جەنگداری رێکخست
تاکو راماڵێ کوفری بتپەرست

(زەیدی حاریثە)ی کرد بە سەرقۆڵە
دژ بە تاوان و دڵرەقی و تۆڵە

ئەوساکە فەرمووی:- گەر زەید هەرکات
(جەعفەر) جێی بگرێ ، گەرچی بەسەرهات

ئەگەر (جەعفەر)یش نەما لە ساحە
ئەوسا (عبداللەی کوڕی رەواحە)

سێیانی دانا یەك لە دوای یەکی
ئالا هەڵگرن بە رێك و پێکی

ئینجا پێغەمبەر نزای بۆکردن
تا بۆ دوژمنان کەچ نەکەن گەردن

جا سەروەر کردی زۆر ئامۆژگاری
تا ماڵی خەڵکان نەکەن دەستکاری

ئەوساکە فەرمووی :- نە ژن نە منداڵ
نە بێتاوان و پیر و خاوەن ساڵ

هیچ کەس مەکوژن ، مەکەن بەدبەختی
هەروا نەشێوێن دار و درەختی

دەسا ئەی خەڵکان توخوا بڕوانن
ڕەفتاری سەروەر چەند ڕێك و جوانن

ئیتر چوو سوپای موسڵمانەکان
گەیشتنە شوێنێك بەناوی (ماعان)

بەڵام هەواڵیان زووگەیشتە شام
لە ناوجەرگەیان گەڕا ترس و سام

کوردی بە هاوار لەوکات (شرحبیل)
وتی :- خەڵکینە شەرمە ، مەبنە دیل

هەڵگرن چەکی هەڵمەت و خەبات
سوپای (موحەممەد) وا بۆ سەرمان هات

چووە لای (هەرقل) پێی وت :- گەورەی ڕۆم
خۆت باش دەزانی ، کاربەدەستی تۆم

سوپای (موحەممەد) هاتووە لێماندات
بمانکوژێت وماڵیشمان ببات

ئەویش بیستبووی ، موسڵمان ئازان
هەربۆیە ، بەخۆ و وەزیری سازان

ئەوسـا ڕێکیـان خـست لەشـکرێکی زۆر
دووسـەدهەزارکەس لـەزۆر شـێوە و جـۆر

سـەدهەزار جـەنگدار لـە عـەرەبی شـام
سـەدهەزاری تـر لـەڕۆمی نـەفام

کـە ئـەم هەواڵـە گەییـە خواناسـان
خواناسـان یـەکجار پێـی بـوون هەراسـان

هەربۆیـە هەنـدێك ڕایـان هاتەسـەر
کـە ئـەم هەواڵـە بـدەن بـە سـەروەر

تـا بۆیـان دانـێ یـەك ڕێگـا چـارە
دژ بـە ئـەو هێـزە دووسـەد هـەزارە

(عبداللـە کـوری رەواحـە) ، بـەلام
چـاو نەترسـانە کـە هاتـە وەلام

فـەرمووی :- ئـەی یـاران وا مەکـەن ، شـەرمە
پـشت و پـەنامان بـە خـواوە گەرمـە

نەنگییـە بۆمـان ، پـشت لـەوان هەڵکـەین
دەبـا تـامردن شـەڕیان لەگـەڵ کـەین

لەگـەڵ وتـاری (عبداللـە) ئـەوکات
دڵ و دەروونیـان زۆر گـەرم داهـات

یـەك جـار ورەیـان بـەرزبوو بـۆ جـەنگ
وەکـو پڵـنگ و شـێری شـەوەزەنگ

بەرەو مەیدان چوون هەر سێ هەزارکەس
هێز و پەناشیان هەرخودا بوو ، بەس

چوون لە بۆ (بەلقا) و (موشاریف) ، دوایی
چوون لە بۆ (مۆتە) ، بە دڵنیایی

جا هەر لە (مۆتە) هەردوو سوپاکە
نوێنەری شەڕ و نوێنەری چاکە

بەیەکگەیشتن ، دەستیپێکرد جەنگ
دونیایان پڕکرد لە تەکبیر و دەنگ

(زەید)ی قارەمان ئاڵای بەرزکرد
تاویدا دوژمن هەڵمەتێکی برد

چاونەترسانە (زەید)ی بەجەرگ
زۆری کردنە نێچیری مەرگ

بەڵام بە دەستی دوژمنی نەزان
شەهیدبوو ، شادبوو بە گشت سەربەرزان

لەدوای وی جەعفەر وەك هەڵۆ و بازان
ئاڵاکەی هەڵگرت دژ بە شەڕخوازان

وەکو پاڵەوان هەڵمەتێکی برد
لە ڕاست و لەچەپ ڕیزیانی لەتکرد

چاری نەما لە ولاغ هاتەخوار
ئەوسا بۆی هاتن وەکو سەگی هار

(جەعفەر)ی ئازاش وەکو بەچکە شێر
دەستێك بە ئالاّ و دەستێك بە شمشێر

ئیتر دەجەنگا جەعفەر بەم جۆرە
دژ بە دوژمن و ئەو هێزە زۆرە

بەلاّم هەردوو دەست لە (جەعفەر)ی لاو
کورتکران بەدەست (ڕۆم)ی سەرشێواو

(جەعفەر)ی ئازدار کەوا دەستی چوون
بە دەست دوژمنی بەدکار و زەبوون

ئالاّیەکەشی هەر لە هەوا بوو
بە سینگ گرتبووی تا ژیانی مابوو

(عبداللەی کوری ڕەواحە)ش هەروا
بوو بە هەلگری بەیداغی ڕەوا

داخەکەم لە دوای چەندین چالاکی
گیانی هەلّفڕی بەرەو ڕووناکی

هەرسێ پالّەوان بە دلّی بێباک
گیانیان بەختکرد لەپێناو خوای تاك

ئەوساکە (خالید) خوای لێبێ ڕازی
بوو بە هەلگری ئالاّی حەقخوازی

بە هاوکاری خوای پەروەردگاری
چاونەترسانە بە فیداکاری

خـــۆی کوتایـــە نـــاو دوژمنـــانی (ڕۆم)
خـــوێنی لـــێ ڕشـــتن بـــە جۆگەلـــە و گـــۆم

شـــەرێکی وای کـــرد ئـــەو فیـــداکارە
نـــۆ شـــیری شـــکاند تـــاکو ئێـــوارە

هـــەروا ئـــەو جەنگـــە بـــۆی یەکـــەم جـــەنگ بـــوو
بـــەر لـــە ئـــەو جەنگـــە کـــوفری دڵتـــەنگ بـــوو

پاشـــان ئەوەمـــەردە لێیـــانی کـــرد فێـــل
تـــا شکـــست بخـــۆن دوژمنـــانی وێـــڵ

چـــاك لەمەیـــدانی جەنگەکـــەی نـــۆڕی
پاشـــان شـــێوازی ســـوپاکەی گـــۆڕی

ڕاســـتی بـــردە چـــەپ ، پێـــشی بـــردە پـــاش
ســـەری دوژمنـــی شـــێواند گەلـــێ بـــاش

هێزێکـــــی زۆری نـــارد بـــــە پـــــەنهانی
بـــێ ئـــــەوەی دوژمـــن پێیـــان بزانـــی

ئـــــەو هێـــــزە زۆرە هاتـــــەوە ناویـــــان
ســـەربازی کـــوفریش دیتیـــان بـــە چـــاویان

واتێگەیـــــشتن ڕۆمـــــەکان لـــــەوکات
کـــەوا یارمـــەتی بۆخواناســـان هـــات

ئەوســـا بەســـەریان هـــات تـــرس و پەســـتی
چـــوونە ژێربـــاری تەمبـــەڵی و ســـستی

لـــــــەوكات دەوەســـــــتن لـــــــە هێرشـــــــكردن
چـــــونكە خـــــەڵكێكی زۆریـــــان لێ مـــــردن

فێـــــل و زانـــــایی ٠خالیـــــد)ی چـــــالاك
شكـــــستی هێنـــــا ســـــەر ڕۆمـــــی ناپـــــاك

بـــــە ویـــــستی خـــــودای گـــــەورەی كردگـــــار
شـــــادبوون بـــــە بەهەشـــــت دوازده بـــــرپوادار

(خالیـــــدی وەلیـــــد) بەرپرســـــی هێزبـــــوو
مـــــەرد و لێهـــــاتوو ، زۆریـــــش بـــــەرێز بـــــوو

فـــــەمانی دەركـــــرد بـــــۆ گەڕانـــــەوه
زۆربـــــەدڵ لـــــە خـــــوا دەپاڕانـــــەوه

گەیـــــشتنەوه شـــــاری مەدینـــــە
ئەوســـــا ســـــەركردەی ئـــــەو ڕێگـــــا و دینـــــە

چـــــۆ ســـــەر ڕێگایـــــان كـــــردی پێـــــشوازی
بـــــەڵام وەك یـــــەكێ كـــــە هـــــەیبێ تـــــازی

چـــــونكە لـــــە خـــــواوه بـــــۆی هـــــەبوو هـــــەواڵ
كـــــەوا چـــــەند یارێـــــك نایەنـــــەوه مـــــاڵ

لـــــە گیـــــانی پاكیـــــان ســـــڵاو وەك بـــــاران
بۆســـــەر ســـــەرومر و هەرهـــــەموو یـــــاران

خوایـــــە گیـــــان ئێمـــــەش ببـــــەی بـــــەو نەخـــــشە
وەك (زەیـــــد) و (جەعفـــــەر) ئێمـــــەش ببەخـــــشە

## هۆی فەتح کردنی شاری (مەککە)

تـــــاوەکو شـــــەری (مۆتـــــە) و (سلاســـــل)
(مەککـــــە)ی ڕێـــــزگیراو دەینالاًنـــــد وەك دیـــــل

هۆزێـــــك لـــــە هـــــۆزان (بـــــەرەی بـــــەکر) بـــــوون
پـــــڕ لـــــە ناپـــــاکی و فێـــــڵ و غـــــەدر بـــــوون

لەگـــــەڵ ٠قورەیـــــشی) وەکـــــو هاوپـــــەیمان
دەژیـــــان لەگـــــەڵ یـــــەك دژ بـــــە موســـــڵمان

ئەوســـــاکە (بـــــەرەی بـــــەکر) لـــــەو کـــــاتی
لـــــە (قورەیـــــشی) کـــــرد داوای یارمـــــەتی

تـــــاوەکو بەســـــەر (خوزاعـــــە) دا دەن
پـــــەیمانی زووشـــــیان بایـــــەخ پـــــێ نـــــادەن

بـــــەرەی (خوزاعـــــە)ش بـــــێ فێـــــڵ و ئەگـــــەر
هاوپـــــەیمانێك بـــــوون لەگـــــەڵ پێغەمبـــــەر

بـــــەلاًم ناپـــــاك بـــــوون خـــــەڵکی (قورەیـــــشی)
بـــــە (بـــــەرەی بـــــەکر) زۆر هێزیـــــان بەخـــــشی

لـــــە (حودەیبیـــــە) هەنـــــدێ لەمەوبـــــەر
لـــــە نێـــــوان (قـــــورەیش) هـــــەروەها ســـــەروەر

پـــــەیمانیان دابـــــوو ، کـــــە لـــــەهیچ لاوە
نـــــابێ تـــــا (دە) ســـــاڵ هـــــەبێ ئـــــاژاوە

لـــــەناو مـــــەرجا بـــــوون هاوپـــــەیمانانیش
نـــــابێ شـــــەر بـــــێ لەگـــــەڵ ئـــــەوانیش

ئەگــــەر چـــی (بـــەرەی بــــەکر)ی زۆردار
بـــە پـــشـت و پـــەنای (قورەیـــشی) بـــەدکار

چـــونە ســـەر (بـــەرەی خوزاعـــە) ، دەڵـــێن
بیـــستیان لـــێ کوشـــتن تێکیانـــدا بـــەڵێن

ئەوســـا ســـکاڵای لـــەودەم بـــرد (عـــەمر)
چـــوو بـــۆ مەدینـــە بـــۆ لای پێغەمبـــەر

ئەوســـاکە (عـــەمر) چـــوو بـــۆ مەدینـــە
تـــا چـــارێ بکـــا ئـــا لـــەو برینـــە

بـــۆ پێغەمبـــەری بـــاس کـــرد بـــە چـــاکی
بـــۆی گێرایـــەوە باســـی ناپـــاکی

داواشـــی لێکـــرد بەهەســـت بزوێنـــی
تـــاوەکو تۆڵـــەی لـــەبۆ بـــستێنی

هـــەزاران ســـڵاو لـــە ســـەر پێغەمبـــەر
وەڵامـــی (عـــەمر)ی دایـــەوە یەکـــسەر

(قورەیـــشی) و (بـــەرەی بکـــر)- ســـات بـــە ســـات
شـــەرمەزاریەتی و ترســـیان بـــۆ دەهـــات

بـــە شـــکاندنی پـــەیمان دڵ تـــەنگ بـــوون
ماوەیـــەك دامـــان ، هـــەروا بـــێ دەنـــگ بـــوون

ئەوســـا قورەیـــشی رایـــان هاتـــە ســـەر
یـــەکێ بنێـــرن بـــۆ لای پێغەمبـــەر

تا بە پێغەمبەر رابگەیێنێ
ئەوەك بۆ سەریان هێرش بهێنێ

ئەوسا قورەیشی دڵ پڕ لە كینە
(ئەبو سوفیان)یان نارد بۆ (مەدینە)

كە چوو مەدینە نەیوێرا یەكسەر
راستەخۆ بچێ بۆ لای پێغەمبەر

ماڵی كچیشی لە (مەدینە) بوو
بەلام دڵسۆزی خوا و ئەو دینە بوو

جا كاتێ بابی هات لەبۆ ماڵی
زۆر بەرێزەوە پرسی لە حاڵی

بەلام كچەكەی لەئاستی رەق بوو
چونكە شوێنكەوتووی ئاینی حەق بوو

لە هەڵسوكەوتی كوفریش بەری بوو
چونكە هاوسەری پێغەمبەری بوو

جا (ئەبو سوفیان ) ویستی هاتە سەر
دانیشێ لەسەر جێگای پێغەمبەر

بەلام كچەكەی بەدڵی پڕئیمان
پێی وت :- تۆ پیسی ئەی (ئەبو سوفیان)

نەیهێشت كە باوكی دانیشێ لەسەر
رایەخە كۆنی پاكی پێغەمبەر

ماڵی کیژەکەی جێهێشت بە پەستی
چوولای پێغەمبەر لەبۆ مەبەستی

دەربارەی بەرەی (خوزاعە) دووا
زۆر گوێی پێنەدا پێغەمبەری خوا

(ئەبو سوفیان) چوو وەکو خەمباریٚ
تا (ئەبو بەکر ) بۆی بکا چاریٚ

چووە لای (عەلی)ش لەپاشی (عومەر )
تاکو چارەی کەن لەلای پێغەمبەر

هیچان بۆ نەکرد (ئەبو سوفیان)پێشر،
ئومێدی نەما هەروا بەوانیش

وەکو پەنابەر دەجولاَیەوە
هیچ چاری نەما ، جا گەڕایەوە

هاتەوە (مەککە) جا (ئەبو سوفیان )
بیریان کردەوە ئیتر لەپیلان

پێغەمبەری خواش لەناو (مەدینە)
دژ بە دڵڕەشی و تاوان وکینە

هێزێکی گەورە و زۆر و بەربلاَو
ڕێکیخست دژی کوفری زۆر گلاَو

تا ئازاد بکات (مەککە)ی زۆر پیرۆز
دەریبهێنێت لەناو تەم و تۆز

پاشـــــان داوای کـــــرد لــــــە میهرەبـــــانی
خـــــەڵکی (قورەیـــــشی) بەمـــــە نــــەزانی

ئەگەرچـــــی (حاتـــــب) بـــــەرێی نهێنـــــی
ویـــــستی بـــــەدوژمن رابگـــــەیێنی

نامـــــەکی نوســـــی زۆر بەپـــــەنهانی
دای بەدەســـت ژنێـــك کـــەس پێـــی نــەزانی

نامەکـــــەی هـــــەڵگرت ، ئـــــیتر ژنەکـــــە
هـــــەواڵی دەبـــــرد بـــــۆ شـــــاری (مەککـــــە)

بـــەڵام خـــوای گـــەورە ویـــستی هاتـــە ســـەر
گـــیرا بـــێ نـــزای چـــاکی پێغەمبـــەر

نـــزای ســـەرومەری گیراکـــرد خـــوای زاڵ
چـــاکی تێگەیانـــد لـــە نامـــە و هـــەواڵ

پێغەمبـــــەری خـــــواش بەهێمنانـــــە
دژ بـــەو ئافرەتـــە دای ئـــەو فەرمانـــە

بەدوایـــدا نـــاردن ئـــەو ساســـێ یـــاری
ئـــەو ژنـــەیان گـــرت لـــەدووری شـــاری

(عـــەلی)و(زبـــیر)و (مقـــداد) بـــوون ئـــەوان
گـــەلێ بەســـام بـــوون وەك شـــێری شـــەوان

هەرســـێکیان دەڵـــێن :- لـــەوکات بەهـــەر حـــاڵ
نامـــەمان لێـــی ســـەند ، گەڕاینـــەوە مـــاڵ

هــــەروا ئــــەو ژنــــەش (ســــارا) بــــوو نــــاوی
ئــــەو کــــارەی بــــە بــــاش هاتــــە بەرچــــاوی

نامــــەیان دایــــە پێغەمبــــەر لــــەوکات
پێغەمبــــەری خــــواش نــــاردی (حاتــــب)هــــات

فــــەرمووی :- ئــــەی(حاتــــب) بــــۆ نامــــەت نوســــی؟
تــــۆ موســــڵمانی ناکــــەی جاسوســــی

(حاتــــب)یــــش وتــــی :- دڵســــۆزی خوامــــە
هەرچــــەند بــــەم شــــێوە نوســــیومە نامــــە

بــــەنیازی ئــــەوەم تــــاکو منــــداڵم
ڕێزیــــان بگــــرێ ســــەروەت ومــــاڵم

پێغەمبــــەری خــــواش پێــــی فــــەرموو :- ڕاســــتە
کــــافر نابیــــەوە ، خــــودا نەخواســــتە

چــــونکە (حاتــــب)ی بــــەرێزی دلێــــر
بەشــــداری کردبــــوو لــــە (بــــەدر)ی پــــڕ خێــــر

گەرچــــی کردبــــووی کــــارێکی غــــەدر
بــــەلاّم بەخــــشیبووی خــــوا بــــەهۆی (بــــەدر)

## ئامادەبوونی سوپا بۆ ڕۆیشتن بەرەو(مەککە)

پێغەمبــــەری خــــوا لێـــــی بــــێ زۆر درووود
ســــەرکردەی ڕێگـــــای پــــڕ لــــە خێـــــر و ســــوود

لــــە هەشـــــتەمین ســـــاڵ ، بیـــــستی ڕەمـــــەزان
(دە) هـــــــەزار کەســـــــی دڵ پــــــڕ لـــــــەئیمان

کـــۆی کـــــردن ، تـــــاکو (مەککــــــە) یـــــەکجاری
دەربکـــــــا لەژێردەســــــــــتی بــــــــــەدکاری

بـــــەر لەڕۆیـــــشتن ســـــەرۆمەری نـــــازدار
(کلثـــوم بـــن حـــصین) دانــــا لەســــەر شــــار

جــــا لـــــە (مەدینـــــە) چـــــوون ، بەدەرکـــــەوتن
بەتـــــەکبیر لێـــــدان بـــــەرەو ســـــەرکەوتن

گرتیانـــــــە بــــــەر دەشــــــــت و بیابـــــــان
تـــــاکو گەیـــــشتن بـــــە (مـــــر الظهـــــران)

دابــــــەزی لــــــەوێ ســــــوپاکە تــــــاوێ
بــــــۆ پــــــشودان و خواردنــــــەوەی ئــــــاوێ

هەرچـــــەند ئـــــەو مانگـــــە مـــــانگی ڕۆژوو بـــــوو
لـــــە تینـــــوان هێـــــز و توانایــــــان چـــــووبوو

بــــــەڵام خواناســــــان چــــــاکە دەنـــــوێنن
بەقـــــسەی پێغەمبـــــەر ڕۆژوو دەشـــــکێنن

ســـــوپاس بـــــۆ خـــــودا ، ویـــــستی هاتـــــە ســـــەر
کـــــەوا (عـــــەباس)ـــــی مـــــامی پێغەمبـــــەر

لـــــەوێ پێـــى گەيـــــشت ، زوو موســــڵمان بـــــوو
هەرچـــــەند پێــــشتريش هەڵوێـــستى جـــوان بـــوو

چـــــەند كەســـێكى تـــــر بـــــەو پێيــــە ، هـــــەروا
هاتنـــــــە نــــــاو ڕيـــــزى پێغەمبـــــەرى خــــوا

(عــــــەباس)ى مـــــامى ســــــەركردەى ديـــــنى
ئــــــەو هێـــــزە زۆرەى كــــاتێ كــــە بـــينى

وتــــى :- ئــــەى هــــاوار ئــــەو خواناســــانە
هـــــــەر كــــــارێ بكــــــەن ، لايـــــان ئاســـــانە

هـــــەربيرى دەكـــــرد ، دەيـــوت :- ئـــــەو خەڵكـــــە
چ دێـــــنن بەســـــــەر دانيـــــشتووى (مەككـــــە)

ئەوســــاكە (عـــەباس) بـــــە قـــسەى ســـەروەر چـــوو
تــــاكو بـــــۆ (مەككــــــە) هـــــــەواڵ ببـــــا ، زوو

كـــــــەوا پێغەمبـــــەر هـــــاتووە بـــــەو جـــــۆرە
خـــــــــاوەن هێزێكــــــــى بێوێنــــــــــە زۆرە

(عــــــەباس)ى بـــــەڕێز هەســــــتا بــــــەكارى
خــــەمى خــــەڵكى بـــــوو ڕووى كـــــردە شــــارى

چـــــــووە ڕۆخ (مەككــــــــە) نزيــــــك بــــــەيانى
گـــــوێى بـــــوو لـــــە دەنگــــى (ئــــەبو ســــوفيان)ى

(ئــــەبو ســـــوفيان)يـــش خـــــۆى و يــــەك دوو يــــار
شـــــەوان دەردەچــــوون ، جێيـــــان دەهێـــشت شــــار

هـــــەر لەبـــــەر تــــرس و هێــــزی خواناســــان
شـــــاریان جێدەهێـــــشت ، ببـــــوون هەراســــان

بـــا گوێمـــان بگـــرین لـــە قـــسەی (عـــەباس)ی
کـــە چـــوو ئـــەوی دیـــت کـــاتێ کـــە ناســـی

بـــــانگی کـــــرد وتـــــی :- بــــاوکی (حنظلـــــة)
زانــــاو هوشـــــیار بـــــە ، نەکەویــــە تەڵـــــە

ئەوســـاکە پـــێ وت :- ئـــەی (ئـــەبو ســـوفیان)
هـــــەرگیز دەرناچـــــی تـــــۆ لەبـــــەر دەســــتیان

تووشـــــی پەســـــتی هـــــات ئـــــەویش بـــــەجارێ
وتـــی :- ئـــەی (عـــەباس) لـــێم بکـــە چـــارێ

(عـــەباس)یـــش پـــێ یـــوت :- ئـــەی(ئـــەبو ســـوفیان)
چـــــارت ئەوەیـــــە ببیـــــە موســـــڵمان

ئـــــەوەی لـــــەوناوە دەبێـــــت هـــــەروا بـــــێ
چـــــونکە لەدەســـــتیان رزگـــــاری نـــــابێ

ناچـــاربوو هەســـتا چـــوو لەگـــەڵ (عـــەباس)
چـــوو بـــۆ لای ســـەروەر ، بـــوو بـــە خـــودا نـــاس

لـــــە دوای بەخـــــشینی (ئـــــەبو ســـــوفیان)ی
(عـــەباس)یـــش فـــەرمووی :- ســـەروەر دەزانـــی؟

کـــە (ئـــەبو ســـوفیان) حـــەزی لـــەناوە
چـــــونکە بــــاوەڕی هێـــــشتا هـــــەرخاوە

ســـەروەریش فـــەرمووی :- دەســـا بـــەر لەجـــەنگ
بـــا بـــچێت بـــۆ نـــاو (مەککـــە) بـــەبێ دەنـــگ

فـــەرمووی :- بـــەر لـــە جـــەنگ بـــا هـــەواڵ ببـــات
هەرکـــەس بیـــەوێت ، خـــۆی ڕزگـــار بکـــات

بـــچێتە ژووری و دەرگـــای دابخـــات
یـــان لـــە نـــاو (کەعبـــە) خـــۆی بـــەدەر نـــەخات

یـــان بڕواتـــە لای (ئـــەبو ســـوفیان)ی
دڵنیـــا دەبێـــت لـــە خـــۆی و گیـــانی

تـــەنها چـــەند کەســـێ بـــەد و ســـتەمکار
کوشـــتبوویان زۆر خـــەڵکی بـــڕوادار

بڕیـــارێکی وای لـــە دوا دەرکـــردن
کـــە بخرێنـــە ژێـــر شمـــشێری مـــردن

بـــە تۆبـــە و تکـــا هەنـــدێکیان لـــەوان
لـــە دوای گرتنـــی شـــار ئـــازادکران

# بەڕێکەوتنی سوپا بەرەو (مەککە)

پێغەمبـــەری خـــوا گـــوڵی تـــازە و گـــەش
دەردێـــنێ (مەککـــە) لـــەژێر دەســـتی ڕەش

پێـــشەکی فـــەرمووی :- مامـــە ، ئـــەی (عـــەباس)
دەبـــێ تـــۆ بکـــەی کـــارێکی ئەســـاس

لەگـــەڵ خـــۆت ببـــە تـــۆ (ابوســـوفیان)
نیـــشانی بـــدە هێـــزی موســـڵمان

تـــاکو بزانـــێ ، هێزێکـــی وایـــە
هـــەرگیز بـــە هـــیچ کـــەس لـــە ڕیـــشە نایـــە

ئینجـــا ڕۆیـــشتن ئـــەو دوو بـــەڕێزە
تـــاکو ببیـــنن زۆری ئـــەو هێـــزە

لەســـەر فـــەرمانی ســـەروەری ئـــازیز
بـــەرە و (مەککـــە) چـــوون ، تیـــپ تیـــپ بوونـــە ڕیـــز

لـــە شـــوێنێ بـــەرز هـــەردوو بـــەو جـــۆرە
ســـەریان ســـوڕما بـــوو لـــەو ســـوپا زۆرە

ڕەت دەبـــوون تیـــپ تیـــپ ، بـــە بـــێ مەترســـی
(ئـــەبو ســـوفیان)یـــش یـــەك یـــەك دەیپرســـی

دەیـــوت :- ئـــەو هێـــزە هـــی کامـــە هـــۆزە ؟
(عـــەباس)یـــش دەی وت :- فـــلان دڵـــسۆزە

ئەوســـا کـــە (عـــەباس) بـــەڕەنگێکی جـــوان
تیـــپ تیـــپ ناســـاندنی بـــە (ئـــەبو ســـوفیان)

هـــــەرتیپپێك مـــــابوو ، ئـــــەویش لــــــە دواوە
گــــەر ئـــــەویش ڕەت بـــــوو ، ئـــیتر تــــەواوە

لەویـــــشی پرســـــی :- ئـــــەی ئەوانـــــە کـــێن؟
(عـــەباس)یـــش فـــەرمووی :- ئەوانـــەی کـــە دێـــن

ئەوەیـــــــە هێـــــــزی ســـــــەروەری نـــــــازدار
جـــا (ئەبوســـــوفیان) وتـــــی :- ئـــــەی هـــــاوار

وتـــــی :- ئەوانـــــە مـــــرۆڤ نـــــین ، شـــێرن
هـــــەرگیز (قوڕەیـــــشی) پێیـــــان نـــــاوێرن

جـــا (ئەبوســـــوفیان) هەســـــتا بــــە هـــەرحاڵ
خێـــرا خـــۆی گەیانـــد بــــە (مەککـــە) و بــــە مـــاڵ

بانگـــــەوازی کـــــرد ، وتـــــی :- ئـــــەی خەڵکـــــە
هەرشـــــتێك بکـــــەن ، بێـــــسوود و کەڵکـــــە

(موحەممـــــەد) بــــە خـــۆ و هێزێکـــی لـــە جـــۆش
هاتۆتـــــە ســـــەرمان پێـــــی نـــــەبن پـــــەرۆش

(قوڕەیـــــشی) یـــــەکجار پێـــــی خەفـــــەتبار بـــــوون
ئەگـــــەر چـــــی کـــــەمێك پێـــــی ئاگـــــادار بـــــوون

هەرچـــــەند دامـــــاو و پەســـــت و بێـــــدەنگ بـــــوون
ســـــەرەڕای ئـــــەوەش بەتـــــەمای جـــــەنگ بـــــوون

بـــــانگی کـــــرد (ئـــــەبو ســـــوفیان)ی بـــــەڕێز
خـــــەڵکی (مەککـــــە)ی کـــــرد بـــــێ ورە و بێهێـــــز

هــــەروەها لــــەو كـــات (هینـــد)ی خێزانــــی
تـــورە بـــوو ، بـــۆی هـــات تـــا شـــان بەشـــانی

لا سمێڵێكــــــــی لێكـــــــرت ، ڕایتــــــــەكان
پێــــی وت:- شــــەرمكە ئــــەی (ئــــەبو ســــوفیان)

پــــێم بڵــــێ تــــۆ چــــۆن نــــامری لــــە شــــەرمان
بــــــە شمــــــشێرەوە وا بێنــــــە ســــــەرمان

ئەگــــەر چــــی ئــــەویش بــــە قــــسەی خێزانــــی
هەراســـــان نـــــەبوو ، بـــــە كـــــەمی زانـــــی

دیـــــــسان دەســـــــتیكرد بـــــــە بانگـــــــەوازی
وتــــی :- مەجــــەنگن ، مەیكــــەن بــــە تــــازی

خەڵكەكــــــەش وتیـــــان :- ئازادمـــــان ناكــــەن
گەرچــــی هەنـــــدێكیان خــــەڵكی ئــــەم خاكــــەن

وتـــــــی :- گـــــــوێبگرن لـــــــە قـــــــسەكانم
چـــــــونكە لـــــــە ئێـــــــوە باشـــــــتر دەزانم

بــــڕۆن بــــۆ (كەعبــــە) ، چــــونكە جێــــی ڕێــــزە
پــــارێزراو دەبــــن لــــە دەســــت ئــــەو هێــــزە

یــــا لــــە مــــاڵی مــــن خۆتــــان دەرمەخــــەن
یــــا لــــە مــــاڵ خۆتــــان دەرگــــا دابخــــەن

ئــــیتر خەڵكەكــــــە تێكــــــڕا گــــــرد و ورد
ڕوویــــان لــــە شــــوێنی دیــــاریكراو كــــرد

وەك هـــــەوری پەڵـــــە ســـــوپای ســــەروەریش
دەجۆشـــا تـــاکو بـــت دەرکـــا لـــە ڕیـــش

ســــڵاوی لـــێ بـــێ وەك لێزمـــە بـــاران
هـــەر ســـورەی (فـــەتح)ی دەخوێنـــد بـــۆ یـــاران

نـــاو گـــۆڕی پـــڕ لـــە بـــەزمیی خـــوابێ
مامۆســـتای نـــاوا فـــەت نـــەبووە و نـــابێ

ڕۆیـــشتن تـــاکو لێـــواری (مەککـــە)
دابـــەزی ســـەروەر فـــەرمووی :- ئـــەی خەڵکـــە

ئـــەم ڕۆژە ڕۆژی چـــاکەیە یـــاران
مەهێننـــە بەرچـــاو کـــاری زۆرداران

جـــا لـــەدوای ئـــەوەش زوو بەدەســـت و بـــرد
ئـــەو هێـــزە زۆرەی هـــەموو تیـــپ تیـــپ کـــرد

ئەوســـا پێغەمبـــەر ڕونـــاکی زەمـــین
دای بەدەســـت (زوبێـــر) ئـــاڵای یەکـــەمین

دای بەدەســـت (خالیـــد) دووەم ئاڵاشـــی
ئـــەویش هـــەڵیگرت بـــە ڕێـــك و باشـــی

دژ بـــە دوژمنـــی ســـاویلکە و ســـادە
(ئـــەبو عوبەیـــدە) و (ســـەعدی عوبـــادە)

ئاڵایـــان هـــەڵگرت ئـــەو هەردووکانـــە
ڕێبـــواری ڕێگـــای بەرنامـــەی خوانـــە

بــــەڵام لــــەوکاتی (ســــەعد)ی ســــەرقۆڵە
گردبــــووی داوای ســــەندنی تۆڵــــە

هەرچــــندە (ســـەعد) یــــارێ بەســـەنگ بــــوو
بـــەڵام پێغەمبـــەر بـــە قـــسەی دڵتـــەنگ بـــوو

ئەوســـا ئاڵاکـــەی وەرگـــرت لـــە دەســـتی
بـــەڵام بـــێ ئـــەوەی زامـــدارکا هەســـتی

دای بەدەســـت (قـــەیس) ئـــەویان نـــەرم بـــوو
ســـەندنی تۆڵـــە لـــەلای شـــەرم بـــوو

ئاشـــتی و تـــەبایی لـــە ڕێ و لـــە پێـــشە
ســـەندنی تۆڵـــە ئـــازار و ئێـــشە

هـــەمووی کردنـــە چـــوار تیپـــی چـــەکدار
تـــا لـــە چـــوار لاوە بخـــشێن بـــۆ نـــاو شـــار

ئەوســـا پێغەمبـــەر فـــەرمانی دەکـــرد
لـــە هەرچـــوار لای شـــار زوو بەدەســـت و بـــرد

چـــاو نەترســـانە ڕژانـــە نـــاو شـــار
بـــەڵام بەویـــستی خـــودای کردگـــار

ماوەیـــەکی کـــەم شـــار لـــە ناپاکـــان
پاککرایـــەوە ، بـــوو بـــە جێـــی چـــاکان

تـــەنها کەرتەکـــەی (خالیـــد)ی بـــەرێز
ڕووبـــەڕووی خـــەڵکی کـــافربوو بـــە هێـــز

ئـــەویش كـــەمێك بـــوون ، دڵـــرەش بـــوون ، داخیـــان
هێنـــــدە زۆر ببـــــوو ، چـــــووبوو بـــــە ناخیـــــان

بـــــە سەرپەرشـــــتی (عیكرمـــــه) ئـــــەوان
نـــــەهاتن بـــــۆ ژێـــــر فـــــەرمانی قورئـــــان

ئـــــەو چـــــەند كەســـــانە هـــــەروەكو هـــــاران
كـــــەرتی (خالیـــــد)یـــــان كـــــردن تـــــیر بـــــاران

(خالیـــــد)یـــــش بەشـــــەڕ پێـــــی كـــــردن پەرتـــــە
هەنـــــدێ یـــــاخی بـــــووی كوشـــــتن لـــــەو كەرتـــــە

پێغەمبـــــەری خـــــواش لـــــەو دەم و لـــــەو كـــــات
بـــــەخۆ و چـــــەند یارێـــــك بـــــەرەو (كەعبـــــە) هـــــات

بـــــە خـــــۆ و بـــــەیاران لـــــە رێـــــی خـــــوداوە
حـــــەوت جـــــار بـــــە دەوری (كەعبـــــە) ســـــوڕاوە

جـــــا لـــــەدوای ئـــــەوە هـــــەروەها بـــــەدار
دەیـــــدا لـــــە لـــــوتی بتـــــەكان جـــــار جـــــار

خـــــەڵكی ســـــتەمكار ئـــــەما لـــــە شـــــوێنێ
فـــــەرمووی :- حـــــەق هـــــات و باطـــــل نـــــامێنێ

(ســـێ ســـەد و شەســـت) بـــت هـــەمووی بـــەجارێ
هەریـــــەك بـــــە جـــــۆرێ كـــــەوتبووە خـــــوارێ

بـــــەرزی و گـــــەورەیی هـــــەر بـــــۆ خـــــوا باشـــــە
لـــــە بـــــت جیایـــــان كـــــرد ســـــەر لەگـــــەڵ لاشـــــە

هەرهـــــەموو خـــــەڵك ئـــــيتر بـــــە جارێـــــك
لـــــە دەوری كـــــۆ بـــــوون ، بـــــۆی دان وتارێـــــك

فـــــەرمووی :- ئێـــــستاكە چ دەڵـــــێ دڵتـــــان؟
لـــــەو شـــــتەی كـــــەمن دەيكـــــەم لەگـــــەڵتان

وەكـــــو ديلـــــيش بـــــوون ، بـــــە بـــــێ دەســـــەڵات
دەبـــــێ پێغەمبـــــەر چـــــيان لـــــێ بكـــــات

ئەوســـــاكە وتيـــــان :-ڕەفتـــــارت پاكـــــە
ڕەچـــــاويش دەكـــــەين لـــــە تـــــۆوە چـــــاكە

ئەوســـــا پێغەمبـــــەر هەســـــتايە پێـــــوە
فـــــەرمووی :- (قوڕەيـــــشی) ئـــــازادن ئێـــــوە

(مەككـــــە)ی پـــــڕ لـــــە ژەنـــــگ پاككرايـــــەوە
ئاشـــــتی و ئـــــازادی هاتـــــە كايـــــەوە

دەدرەوشـــــايەوە ڕووی وەك خـــــۆر و مـــــانگ
فـــــەرمووی :- ئـــــەی (بـــــيلال) هەســـــتە بـــــدە بـــــانگ

دەســـــت و بـــــرد هەســـــتا (بيلالـــــی حەبـــــەش)
بـــــانگی دا ، ئـــــــەما دەســـــــەڵاتی ڕەش

كـــــاتێ بـــــانگی دا بـــــە دەنگێكـــــی خـــــۆش
ســـــەرقاڵ و نوســـــتووی هێنانـــــەوە هـــــۆش

دۆڵ و بيابـــــان پڕبـــــوون لـــــەو دەنگـــــە
لەســـــەر دڵانـــــيش لاچـــــوو چـــــی ژەنگـــــە

خوایەکانیشیان بێهەست و بێ گیان
بەدەم کەوتبوون بێ سوود و بێ زیان

(زوبەیری عەوام) لەوکات و دەمە
رووی کردە (ئەبو سوفیان) بە گەمە

پێی وت :- بۆ ئەمڕۆ ئا ئەم (هوبەل)ە
ناتوانێ چارێك بکا لەو گەلە

(ئەبو سوفیان)یش خوای لێبێ ڕازی
پێشتر بە (هوبەل) دەیکرد شانازی

ئەگەر چی ئێستا باوەڕێکی پاك
لەناخی هەیە بە خواوەندی تاك

فەرمانی خوا لە دڵی ئەو خەڵکە
کاتێ جێگیر بوو لە شاری (مەککە)

گشت خەڵك و سەرومر پەیمانیان بەستی
پیاو یەك یەك دەستیان دەخستە دەستی

لە گەڵ ژنانیش جیا پەیمانی بەست
بەڵام بێ ئەوەی دەست بخاتە دەست

سێ پیاو عاسی بوون لە خوانەناسان
(سوهەیل) لەگەڵ (عیکریمە) و (سەفوان)

سوێندیان خوارد لەسەر باوەڕێکی بەد
نابێ دانیشن لەگەڵ (موحەممەد)

لــــــە شــــاری (مەککــــــە)ش نــــابێ بمێــــنن
مـــــادام بــــۆ ڕاســــتی ســــەردانەنوێنن

(عیکرەمـــــە) ســـەری هـــەڵگرت بـــۆ (یەمـــەن)
زۆر بــــــە ناچـــاری دەڕیــــا وەك ڕەبـــەن

(صـــەفوان)یـــش هـــەڵات بـــۆ شـــوێنکی دوور
(مەککـــە)ی بەجێهێـــشت بـــەرەو دەریـــای ســـوور

(ســـوهەیل)یـــش هـــەروا هـــەڵات زوو بـــەزوو
بــــەڵام نــــازانین بـــۆ کامــــە لا ، چـــوو

ئەوانـــــە هـــــەموو بــــەناز بــــوون دوێنــــێ
ئــــەمڕۆش غەریبــــەن هەریــــەك لەشــــوێنێ

بــــەڵام (عیکرەمــــــە) بــــەهۆی خێزانــــی
هاتـــــەخوار لەســـــەر بـــــڕوای نـــــەزانی

ئــــەوانی تــــریش بـــــە مــــاوەیێ کـــــەم
دەرچــــوون لـــــە دەردی کـــــوێرەوەری و خــــەم

ســــوپاس بـــۆ خـــودای گــــەورە و میهرەبــــان
سەربەخــــــــــستن و هیدایــــــــــەتی دان

خۆشــــــی و هێمنــــــی لــــــەلای خــــوداوە
ڕۆژبــــــەڕۆژ زۆرتــــــر دەهاتــــــە کــــاوە

چــــونکە پێغەمبــــەر وەك هـــــەوری بەڵـــــە
(مەککــــە)ی پــــاراو کـــرد ، ڕابەمـــاڵی هەڵـــە

گـــشت دوژمنـــان بـــوون بـــه بـــرا و خوانـــاس
بـــــت پەرســـــتنیش نـــــەیما دەنـــــگ و بـــــاس

خـــواش لەســـەر ویـــستی ســـەروەری دڵـــسۆز
نەیویـــست خـــوێن بـــڕژێ لـــە(مەککـــە)ی پـــیرۆز

بۆیـــه پێغەمبـــەر بـــه زۆر شـــێوه و ڕەنـــگ
مـــەمنوون بـــوو لـــە خـــوای گـــەوره و کـــار بەســـەنگ

چـــونکه ئـــەم شـــاره چـــەند ســـاڵ بـــەم شـــێوه
بـــه یاســـای کـــوفر دەڕۆیـــشته ڕێـــوه

زۆرداری و تـــاوان تێیـــدا ســـەرقاڵ بـــوو
شـــاری کـــچانی زینـــده بەچـــاڵ بـــوو

# شەڕی (حونەین)

لـــە شـــاری (مەککـــــە) هـــيچ نـــەما کينـــە
تێکـــڕا چـــوونە ژێـــر بـــاری ئـــەو دينـــە

دەی وەرن ئێـــستا ، بـــا ســـەرنج بـــدەين
بـــزانين چـــۆنە ڕوداوی (حونـــەين)

کـــە ئـــازاد کـــرا (مەککـــە)ی پـــڕ لـــە ڕێـــز
موســـڵمانەکان بوونـــە خـــاوەن هێـــز

بتپەرســـــتانی ئـــەو دەوروبـــەرە
بـــە جـــاریٚ تـــۆقين لـــەو پێغەمبـــەرە

زانيـــان بەدەســـتی ســـوپای پێغەمبـــەر
دەکـــوژرێن ، يـــاخود دەکـــرێن دەربـــەدەر

بتپەرســـتانی نـــەقام و نـــەزان
دەستپێـــشخەريان کـــرد ، بـــەم کـــارە هەســـتان

بـــوون بەيـــەك بـــەرە دژ بـــە پێغەمبـــەر
تـــا لەڕەگـــەوە ئيـــسلام بێننـــە دەر

(ســـەقيف) و (جوشـــم) (نـــەزر) و ( هـــوازن)
ئـــەو چـــوار تيرەيـــە بوونـــە يـــەك بـــازن

بـــە نيـــازی هێـــرش ئـــەو چـــوار هۆزانـــە
هێزيـــان تێکـــەڵکرد بـــە دڵـــسۆزانە

(مـــاليکی عـــەوف) هەســـتا بـــەم کـــارە
منـــداڵ و ئـــافرەت مـــاڵات و پـــارە

فـــــەرمانی دەرکـــــــرد ، وتــــــی :- وا چـــــاکە
ئەوانــــــــە ببــــــەین لەگـــــــەڵ ســــــوپاکە

چـــونکە لـــە ناویـــان (مالیـــك) جێـــی ڕێـــز بـــوو
ســـــەرۆکی هـــــۆز و ســـــەرکردەی هێـــــز بـــــوو

بـــە (مالیـــك)یـــان وت هـــەموو ئـــەو خەڵکـــە :-
بردنـــــی مـــــاڵ و منــــــداڵ بـــــێ کەڵکــــــە

(مـــالیکی عـــەوف)یـــش زۆر دژی حـــەق بـــــوو
گـــوێی نـــەدا پێیـــان ، گـــەلێ دڵـــڕەق بـــــوو

ئینجـــــا لەشـــــکریان دەوری بیـــــست هـــــەزار
دژ بــــــە خوانـــــــاس و خــــــەڵکی بـــــڕوادار

داخ لەدڵانـــــــــە ، خێراتـــــــــر گـــــــــەین
بـــەو شـــوێن و دۆڵـــەی پێـــی دەڵـــێن (حونـــەین)

پێغەمبـــــەر ئـــــووری ســـــەر ئـــــەم زەمینــــــە
ئـــــەو (دە هـــــەزار)ەی کــــە لــــە مەدینــــــە

کـــــەوا هێنـــــابووی بـــــۆ فـــــەتح کـــــردن
لـــــەبۆ (حونـــــەین)یـــش هەرهـــــەمووی بـــــردن

دووهـــەزار کەســـیش لـــە (مەککـــە) و لـــە شـــار
بـــــردی بـــــۆ (حونـــــەین) هـــــەر دوازدە هـــــەزار

ئینجـــــا (عبــــــدالله)ی (حـــــەدرەدی) لـــــەوکات
بــــە قــــسەی پێغەمبــــەر بــــۆ ناویــــان دەڕوات

کـــاتێ هاتـــەوە ، پێـــی بـــوون زۆر هـــەواڵ
وتـــی :- کافرەکـــان بـــە ســـەر و بـــەماڵ

لـــە دۆڵـــی (حونـــەین) چـــەکیان بـــە دەســـتە
چـــونکە دەزانـــن چـــیمان مەبەســـتە

پێغەمبـــەری خـــواش لـــەو کاتـــە فـــەرمووی :-
ئـــەوەی پێیانـــە ، بۆمەیـــە هـــەمووی

ســـوپای پێغەمبـــەر هـــەمووی بەجـــەرگ
گیـــان لەسەردەســـت و ئامـــادەی مـــەرگ

(دوازدەهـــەزار) کـــەس هـــەمووی چـــەك لەدەســـت
چـــوون بـــۆ ڕوخـــانی قـــەڵای هەڵـــە و مەســـت

هەرچـــەندە مـــەردی دونیـــا و دوایـــی بـــوون
بـــەو هێـــزە زۆرەی خۆیـــان بـــایی بـــوون

دوازدە هـــەزار کـــەس بێگومـــان زۆرە
تـــا ئـــەوکات هێزیـــان نـــەبوو بـــەمجۆرە

ئـــیتر ســـوپاکان گەیـــشتنە (حونـــەین)
لـــەدەم (گـــەلی)ـــەکە بەیـــەکتر گـــەین

بـــەڵام ئەوانـــەی دڵـــسۆزی خـــوا بـــوون
لـــە تەڵـــەی دوژمـــن زۆر بێئاگـــا بـــوون

هـــەلیان بـــۆ ڕەخـــسا دەســـتەی زۆرداران
موســـڵمانایان کـــردن تیربـــاران

ئـــيتر خواناســـان وايـــان بەســـەر هـــات
كـــڵاوی خۆيـــان دەگـــرت (بـــا) نـــەيبات

پێغەمبـــەری خـــواش زۆر بـــوو هەراســـان
چـــونكە نـــەما بـــوو ورەی خواناســـان

بـــەڵام خـــودی خـــۆی نەبـــەزی , گەرچـــی
ســـوپاكەی نـــەيبوو توانـــای بەرپەرچـــی

ئەوســـا پێغەمبـــەر فـــەرمووی بـــەياران :-
بـــۆ پـــشت هەڵنەكـــەن لـــە ڕووی زۆرداران

(وَ انـــــا ابـــــن عبـــــدالمطلب)
ســـەرومر دەهاتـــە بەرچـــاو زۆر غـــەريب

شكـــستی ئـــاوا نـــاخۆش و تـــاڵ بـــوو
شـــەوی تـــار بەســـەر خـــۆری گـــەش زاڵ بـــوو

(موحەممـــەد) بێـــشك نوێنـــەری خـــوا بـــوو
گەرچـــی خـــەڵكێكی كـــەمی لـــەلا بـــوو

(شـــەيبە)ی (قورەيـــشی) بـــە ســـەرگەردانی
ئەوكاتـــە ناســـكەی زۆر بـــە چـــاك زانـــی

تـــاوەكو بكـــوژێ ســـەرومری نـــازدار
لـــە تۆڵـــەی بـــاوكی و خـــزم و كەســـوكار

چـــونكە بـــاوكی ئـــەو كـــەمێ لەمەوبـــەر
كوژابـــوو بەدەســـت ســـوپای پێغەمبـــەر

لـــــە لای چــــەپ لەبــــەر (ئەبوســـــوفیان)ی
لەڕاســــتەش لەبـــــەر (عـــــەباس) نـــــەیتوانی

بــــەڵام هـــــەر بــــۆی چــــوو زۆر بــــە پـــــەنهانی
خــــواش ئــــاگری بــــۆ نـــارد لـــــەلای ئاسمـــانی

دەڵـــــێ لـــــەو کــــاتی بێــــسنوور ترســــام
سەرســـوڕهێنەر بـــوو ، زۆر پێـــی بـــووم سەرســام

ترســـــــام ، هـــــــەڵاتم ، گەڕامــــــــە دواوە
حــــاڵی بــــووم ، کــــەوا خــــەیاڵم خــــاوە

ســـەروەریش فــــەرمووی :- وەرە ئــــەی (شــــەیبە)
خــــوا تێیگەیانــــدم ئــــەو کــــارە غەیبــــە

ئەوســـا (شـــەیبە) چــــوو بــــۆ لای بەشـــەرمی
پێغەمبــــەری خــــواش دەســــتی بـــــە نــــەرمی

داینـــــــا سەرســــــینگی و دەیپاڕێتــــــەوە
تـــــا لـــــە شــــەیتانان پــــاك ببێتــــەوە

بــــۆ ئــــەوەی هــــەرگیز جارێـــك لــــە جـــاران
بــــە دڵیــــا نەیــــەت بــــیری زۆرداران

جــــا (شــــەیبە) لــــەو کــــات نــــەیما کینـــە و داخ
هــــەر خۆشەویــــستی زۆر دەبـــوو لـــە نــــاخ

لـــــەوکاتیش یـــــاران هـــــەر هەڵـــــدەهاتن
زیرەکـــــی ســــــەروەر خــــوا دەردەخــــاتن

لـــــــه ڕووی دوژمنـــــــــی بێهـــــــۆش و زۆردار
وەك كێـــوی بەســـەنگ ڕەگــی چــوو بـــووه خـــوار

ئەوســـاكه فــــەرمووی :- مامــــه ، ئـــەی (عـــەباس)
دەنگــــــت گەورەيـــــــه , بەنــــــدەی خودانــــــاس

پڕبـــــەدەنگ بانگكـــــه ئـــــەتۆ لـــــه خـــــەڵكی
ئـــــەوان بێنـــــەوه بـــــۆ لامـــــان ، بـــــەڵكی

وا بانگيـــــان بكـــــه ، قـــــسەی ســـــەروەره
بـــــۆ لـــــەبيريان كـــــرد داری ســـــەمەره؟

لـــــەبن ئـــــەو داره پێيانـــــدام بـــــەڵێن
پـــەيمان چـــی لـــێ هـــات ، بـــۆ كـــوێ چـــوو بـــەڵێن !؟

ئـــــيتر بانگەكـــــــه كـــــــاری تێكـــــــردن
شـــــەرم و شـــــورەيی يەخـــــەی لێگـــــرتن

ئەوســـــا (لبيـــــك) فــــــەرمووويان يـــــاران
هـــــەموو هاتنـــــەوه بـــــۆ شـــــوێنی جـــــاران

شـــــەڕ لـــــەنێوانيان يـــــەكجار گـــــەرم بـــــوو
ورەی بتپەرســـــــت كـــــــەمێ نـــــــەرم بـــــــوو

هـــــەر لـــــه بـــــەر شـــــرقەی شمـــــشێر و تـــــەكبير
دوژمـــــن ئـــــاوی خـــــۆی كردبـــــوو لـــــەبير

هـــــەر هـــــانی دەدان ســـــەروەريش لـــــه دۆڵ
ئەوســـــا هـــــەڵيگرت مـــــشتێ خيـــــز و خـــــۆڵ

زۆر زۆر نــــزای کــــرد لــــه خــــوای میهرەبـــــان
ئـــەو مـــشته خۆڵـــەی دا بـــه نـــاو چـــاویان

ئەوســـاکه فـــەرمووی :- بـــەرەی (هـــەوازن)
خەریکـــــه کۆڵـــــدەن بـــــەزین دەخـــــوازن

هـــــەلأتن ، ئـــــیتر شـــــایانی باســــــه
بـــــەدوایان کـــــەوتن هەرچــــی خواناســــه

لەبـــــەر شکـــــستیان پەشـــێو بـــوو حاڵیـــــان
نەدەپرژانـــــــــه ســـــــەر ژن و ماڵیــــــان

ئـــیتر لـــــه ترســـــی خـــــەڵکی خودانـــــاس
کۆمـــەڵێك لێیـــان چـــوون لـــه بـــۆ (ئوطـــاس)

(ابوعـــــــامر)ی (ئەشـــــــعەری)ش لـــــــەوکات
بەشمــــــشێرەوه بــــــۆ ســــــەریان دەڕوات

بـــــــەلأم زۆرداران بـــــــێ ویژدانانـــــــــه
زامــــــداری دەکــــــەن ئــــــەو پاڵەوانــــــه

جـــا (ابوموســـــی)ش یـــــەکێ چـــالاك بـــــوو
بـــــرازای (ابـــــو عـــــامر)ی پـــــاك بـــــوو

بـــه قـــسەی ئـــەو مامـــەی وەکـــو بـــاز و شـــێر
بـــــوو بەســـــەرکردە ، دەســـــتی دا شمـــــشێر

هەرهـــــەمووی کـــــردن پـــــەرت و بـــــەربلأو
لـــــه بـــــۆ (طـــــائف) چـــــوون هەنـــــدێکی گـــــلأو

پەرتەوازە بوون ئیتر بەو جۆرە
هەروا جێیان هێشت ئەو شتە زۆرە

چل هەزار سەر مەڕ بێدینی بەزیو
لەگەڵ چوار هەزار هۆقەی زێڕ و زیو

شەش هەزار ژن و بیست و چوار هەزار
وشتر بەجێمان لە سوپای زۆردار

پێغەمبەری خوا کاتێ بە سەرکەوت
بە کەسی نەدا سامان و دەسکەوت

لەبەر خاوەنیان نەیکرد دابەشی
بەڵکو بێنەخوار لەسەر دڵڕەشی

لە دوای (حونەین)ش دوژمن هەر مابوو
لە شاری (طائف) خۆی حەشار دابوو

فەرمانی دەرکرد تاکو بچنە وێش
لەشکر بەرێکەوت خۆشی کەوتە پێش

## ئابلۆقەدانی (طائف)

سـەروەر و یـاران ئـەوها دەخـوازن
ئـەو هەڵاتوانـەی بـەرەی (هـەوازن)

دەبـێ بـە یاسـای خـوا بـبن ڕازی
یـان دەبـێ بیکـەن شـەڕ و گیانبـازی

ئەوسـا پێغەمبـەر بـە خـۆ و سـوپاکە
گەیـشت بـە (طـائف) بـە نیـازی چـاکە

کـاتێ خواناسـان کـە ڕیزیـان بەسـتی
کافرەکـان چـوونە ژێـر بـاری پەسـتی

گەرچـی گرتنـی ئـەو شـارە دووره
چـونکە دەوری شـار کرابـۆ شـووره

لـەو کـاتی دوژمـن کـردی تـیر بـاران
دوانـزە شـەهید بـوون لـە ڕیـزی یـاران

پێغەمبـەری خـواش فـەرمانێکی بـاش
دەردەکـا تـاکو کـەمێك بـچنە پـاش

کـاتێ سـەروەر و گـشت گیانبازەکـان
دەرچـوون لـە مـەودای تـیر ئەنـدازەکان

ئینجـا دامـەزران لـەو شـوێن و جێیـە
ئێـستاش مزگـەوتی (طـائف)ی لێیـە

خێوەتیـان هەڵـدا ئەوسـا یارەکـان
بـۆ دوو لـە دایکـی بـڕوا دارەکـان

ئـــــەو هێـــــزە زۆرە دوانـــــزە هـــــەزارە
چـــەند ڕۆژێـــك گرتـــی دەوری ئـــەو شـــارە

ســـەروەریش نەیویـــست دڵۆپـــە خـــوێنێ
بڕژێـــت بـــە بـــێ شـــەڕ دەیویـــست بیـــسێنێ

ئەوســـا بـــۆ ناویـــان دەنێـــرێ هـــەواڵ
تـــا بـــڕوا بێـــنن بـــە خـــوای گـــەورە و زاڵ

فـــەرمووی :- هەرکەســـێك گـــەر لـــە هـــەر لاوە
موســـڵمان ببێـــت ئـــەو پـــارێزراوە

نزیکـــەی بیـــست کـــەس بـــەم بانگـــەوازە
ڕوویـــان کـــردە نـــاو ئـــەو دینـــە تـــازە

کـــە هـــاتن ســـەروەر لـــەوانی پرســـی
دەربـــارەی دەردی بێـــزاری و برســـی

ئـــەوانیش وتیـــان :- بەشـــی یـــەك ســـاڵێك
خـــۆراك و ئـــاوی هەیـــە ، هـــەرماڵێك

هـــەر چـــەند هـــەوڵی دا ، بـــێ ســـوود بـــوو لـــەو کـــات
کەســـی تـــر بـــەدەم ئـــەو بانگـــە نـــەهات

جـــا دژ بـــەو شـــارەی پـــڕ کـــوفر و زۆردار
چـــەند مەنجـــەنیقی لێ خـــستنەکار

زۆر دەبابەشـــیان کردبـــوون لـــە دار
تـــاکو لـــەناو یـــان خۆبـــدەن حەشـــار

بـــەڵام ســـەرکەوتن نـــەبوو لـــە خـــواوە
بۆیـــە کـــافران ئاســـنی تـــواوە

بـــە ســــەر ســـەرياندا كـــە دەبــــارێنن
دەبابـــــــەكانيان لێ دەســـــــوتێنن

ئەوســـا پێغەمبـــەر فـــەرمووی لـــەو وەختـــی :-
بـــا لێيـــان بـــبڕن دار و درەختـــی

كـــە موســـڵمانان هەســـتان بـــەو كـــارە
كافرەكـــان گـــەلێك پێـــی بـــوون بێـــچارە

ئـــيتر دەســـتيان كـــرد بـــە هـــاوار هـــاوار
تـــاوەكو لێيـــان نـــەبڕن باخـــچە و دار

پێغەمبـــەری خـــواش فـــەرمووی :- بوەســـتن
چـــونكە بـــێ ســـنوور بـــەم كـــارە پەســـتن

هـــەوڵی زۆريانـــدا بـــە زۆر شـــێوە و جـــۆر
بۆيـــان نـــەگيرا نەكـــەم و نـــە زۆر

هـــەر چـــەندە يـــاران دڵيـــان لـــە جـــۆش بـــوو
گەڕانـــەوەيان بـــە لاوە خـــۆش بـــوو

بـــە باشـــی زانـــی گـــەورە و ســـەروەرمان
بـــۆ گەڕانـــەوە دەربكـــا فـــەرمان

ئـــيتر بـــە هـــەرحاڵ بـــە جێـــی هێـــشت (طـــائف)
نزاشـــی كـــردن بـــۆ بـــەرەی (ثقيـــف)

پـــڕ بـــە دڵيـــەوە نـــزای بـــۆ كـــردن
تـــا خـــوا بناســـن لـــە پێـــشی مـــردن

كـــە ســـوپای ئيـــسلام لـــە (حونـــەين) ســـەركەوت
مـــاڵ و ســـامانی زۆری بـــە دەســـت كـــەوت

هەمووی لە (جەعران) کۆ کرایەوە
دابەشی دەکات ، کە گەڕایەوە

جا سوپاس بۆ خوای گەورە و میهرەبان
پاش ماوەکی کەم بوونە موسڵمان

کاتێ کە ڕاستی دایخستن باڵی
خەڵکان بە باشی لە خوا بوون حاڵی

ئینجا خواناسان بە سەر فرازی
بێ ئەوەی کەسێك ببێ نارازی

بۆ خوا (عەمرە)یان کرد بە تەواوی
چونکە بێ دینی نەمابوو باوی

تا ڕۆژی دوای خۆی لە گەڵ یاران
سڵاویان لێ بێ وەك لێزمە باران

تا چەسپاندیان لەوێ ئەم دینە
ئیتر هاتنەوە بەرە و مەدینە

جا گەلێك سڵاو لە سەر (معاذ)ی
لە سەر فەرموودەی سەروەر بوو ڕازی

تا دەرکات خەڵکان لە دڵ لاوازی
لە (مەککە) جێما لەبۆ خێرخوازی

بێگەردی و پاکی بۆ خوای باڵا دەست
لە کوفری بڕی گشت هەناسە و هەست

## نوێنەرانی بەرەی (هەوازن) و دابەشکردنی دەسکەوت

هاتنـــــە لای ســـــەروەر هـــــۆزی (هــــەوازن)
مـــــاڵ و ســـــامانی خۆیـــــان دەخـــــوازن

بـــــۆ ئیـــــسلام بوونیـــــان دادەخـــــەن باڵیـــــان
بـــــشیـــــانداتــەوە ژن و منداڵیـــــان

پێغەمبـــــەری خـــــواش زۆر ڕێـــــزی گـــــرتن
بـــــەخێرهاتنێکی گـــــەرمی لێکـــــردن

ئەوســـــا (زوهـــــەیری کوڕەکـــــەی ســـــەردی)
ڕەق تـــر بـــوو دڵـــی پێـــشتر لـــە بـــەردی

کـــــەمێك بـــــە نـــــەرمی ســـــەروەری دوانـــــد
گـــەلێ لێـــزان بـــوو ، هەســـتی لـــێ جوڵانـــد

وتـــی :- (شـــەیما)خـــان خوشـــکتە لـــە شـــیر
لـــە لای ئێوەیـــە وەك دیـــل ئـــەوی پـــیر

کـــاتێ منـــداڵ بـــوون ئێـــوە ئـــەو دووە
شـــیری (حەلیمـــە) خانتـــان خـــواردووە

لـــەجیاتی ئـــەوەی هـــەڵبگرن نـــازی
ڕاپێـــچکراوە بـــە بـــێ جیـــاوازی

ســـەروەریش فـــەرمووی ئـــا بـــەم (زوهـــەیر)ە
هـــیچ ئاگـــادار نـــیم بـــەو شتەســـەیرە

ئەوســـا هـــەر لـــەوکات زۆر بەدەســـت و بـــرد
ئـــەو بـــەرێزەیان زوو لـــە بـــۆ بـــانگکرد

كـــــە چــــاوی پێكــــەوت هاتــــەوە يــــادی
فـــەرمووی :- ئــــەی (شــــەيما) ئــــەتۆ ئــــازادی

شــــەيمای ئــــازادكرد لـــــەودەم و كــــاتی
وشــــــتری زۆری كـــــــرده خــــــەڵاتی

جـــا دەســـــكەوتەكەی بـــــەرێك و جــــوانی
دابەشـــــكرد بەســــــەر هــــــەموو يــــارانی

بــــەڵام بــــە خـــەڵكی (مەككـــە)ی زۆر بەخـــشی
تــــاكو بــــۆ ئيـــــسلام دڵيــــان ڕاكێــــشی

چـــونكە هەركەســـــێك ئەگـــــەر كەمزانــــــە
چـــاوی لــــــە پـــــارە و مــــاڵ و ســــامانە

بەشـــــيان بەبەركــــەوت هـــــەروا بــــەزيادە
چـــــەكداری ســـــوار و چـــــەكداری پيـــــادە

يـــــەكێكيان دەڵــــێ بــــە پێغەمبـــــەری :-
لــــــە دابەشـــــــكردن نــــــەتكرد دادوەری

لــــەو كـــاتی ويـــستی (عومــــەر)ی دلێـــر
ملـــی ئــــەو كەســــە بـــبڕێ بــــە شمـــشێر

چـــونكە پێغەمبـــەر ڕاســـترين مـــەرد بـــوو
چـــاكترين كەســـی ســـەر پـــشتی عـــەرد بـــوو

ئـــــەو عەرەبانـــــــەی لـــــــەبيابانيش
داوای بەشـــــيان كـــــرد هــــــەروا ئـــــەوانيش

بـــۆ لای ســـەرومر چـــوون هـــەموو بـــەجارێ
زۆریـــــــان ناچـــــــارکرد پـــــــاڵی دا دارێ

کـــــاری وایـــــانکرد بـــــە پێغەمبـــــەری
تـــــاکو لێیـــــان ســـــەند عەباکـــــەی بـــــەری

بـــــە لەســـــەرخۆیی ســـــەرومریش فـــــەرمووی :-
لـــــەو دەســـــکەوتە بـــــۆم نـــــەبووە بەقـــــەد مـــــووی

گـــــەرماڵم هـــــەبا بەقـــــەد ئـــــەو کێـــــوە
هـــــەمووم دەبەخـــــشی ، یـــــاران بـــــەئێوە

ئەوکاتـــــە بـــــەختی دوژمـــــن ڕەشـــــکرا
ســـــامان و مـــــاڵیش هـــــەمووی بەشـــــکرا

نوێنـــــەران هـــــەر هـــــیچ نەنوزانـــــەوە
جـــی لای ســـەرومر بـــوو هـــەمووی دانـــەوە

پێـــــشیانی فـــــەرموو لـــــەکاتی نوێـــــژ :-
لەگـــــەڵ ئـــــەو خەڵکـــــە بکـــــەن وتـــــو وێـــــژ

منـــــیش لەگـــــەڵتان وەکـــــو ناچـــــاران
داوا بـــــۆ ئێـــــوە دەکـــــەم لـــــەیاران

ســـەرومر کـــە چـــووە نـــاو خـــەڵکی خوانـــاس
ئـــیتر لەگـــەڵیان کەوتـــە قـــسە و بـــاس

فـــەرمووی :- گـــوێ بگـــرن ئـــەی دۆســـتەکانم
ئێـــوە بـــە خـــەڵکی خێرخـــواز دەزانم

موســـــڵمان بوونـــــه تـــــیرەی (هــــەوازن)
ئیـــــستاش ســــامان و دیلیـــــان دەخـــــوازن

جــــا داوام وایــــــه بیاندەنــــــــەوە
تــــا لەگـــــەڵ خۆیـــــان بیانبەنــــەوە

هەنــــــدێکیان هەســـــــتان زۆر بەشـــــانازی
جێبـــــەجێیان کـــــرد هــــــەموو داخـــــوازی

هەنــــــدێکێش وتیـــــان :- هــــــەر نــــــابین ڕازی
نایـــــدەین بەرهـــــەمی هــــەوڵ و گیانبـــــازی

بـــــەڵام دەرناچـــــن لـــــه قـــــسەی ســـــەروەری
خـــــاوەن دڵـــــێکن پــــــڕ بەختــــــەوەری

بـــــەبێ ناخۆشـــــی ، بــــــه نـــــەرم و نیـــــانی
ژنیـــــان دانــــــەوە دەســــــت خاوەنـــــانی

جــــا ســــوپاس بــــۆ خــــوای گـــەورە و میهرەبـــان
بــــاش مـــــاوەکی کـــــەم بوونــــه موســـــڵمان

# باسی جەنگی (تەبووک)

بە هاوکاری خوای گەورە و کار تەواو
ڕووداوی (تەبووک) دەخەینە بەرچاو

لە مانگی ڕەجەب ، ساڵی نۆیەمین
ڕۆمی سەرقاڵی بێ بەها و بێ دین

بەهێزی زۆری ڕەق و پڕکینە
خۆی کۆکردەوە بۆ سەر (مەدینە)

بۆ ئەوسەردەمیش زلترین هێز بوو
بەرامبەر دینی خودا بێ ڕێز بوو

ئەوسا ئایەتی بیست و نۆ لەوکات
لەسورەی (تەوبە) بۆ پێغەمبەر هات

سەروەریش دەستی کرد بە بانگەواز
دژ بە هێزی ڕۆم ، کافری شەڕخواز

کاتیش گەرما بوو سێبەر زۆر خۆش بوو
یارانیش دڵیان یەکجار لە جۆش بوو

لەبەر نەبونیش زۆر ببوون بێ حاڵ
زۆر پێویستیش بوون بۆ ئازووقە و ماڵ

جا هەر لەوکاتە (عثمان بن عفان)
کردی هاوکاری سوپای موسڵمان

سەد وشتر لەگەڵ هەزار دیناری
بەخشی لە پێناو خوای کردگاری

ئــــيتر كەوتـــــە ڕێ هێـــــزی نەبـــــەزيو
بـــــەرەو مەبەســــت و ڕۆمــــی دڵڕزيــــو

بـــــەهۆی هـــــەبوونی هێـــــزی بـــــڕوا و بـــــیر
دنيــــا پــــڕ ببــــوو لـــــە تـــــۆز و تـــــەكبير

لـــە شـــكريش هـــەمووی كـــۆی ســـی هـــەزار بـــوو
بيـــستی پيـــادە و دەشـــــی ســـــوار بـــــوو

لـــە ســـايەی ئيـــسلام بەســـەنگ بـــوون وەك شـــاخ
ئەوســـا بەشـــی كـــــرد بەســـــەريان بەيـــداخ

لـــە هـــەر تـــيرە و يـــەك زۆر بـــە دڵـــسۆزی
بـــــوو بەهـــــەڵگری بەيـــــداخی هـــــۆزی

ئـــەو دووڕوانـــــەی لـــــە نـــــاو (مەدينـــــە)
كـــە دڵيـــــان پڕبـــــوو لـــــەڕق و كينـــــە

وتيـــان :- بـــا لەدەســـت نـــەدەين ئـــەو هەلـــە
ســـــواری وڵاخ بـــــوون زۆر زۆر بەپەلـــــە

گەيـــشتەنە لەشـــكر لـــــە دووری شـــــاری
تـــــاكو لـــــەو جەنگـــــە بكـــــەن بەشـــــداری

بـــــەڵام پێغەمبـــــەر بـــــەم دووڕوانـــــە
فـــــەرمووی :- نيمانـــــە پێتـــــان متمانـــــە

نـــابێ بەشـــدار بـــن ئێـــوە لـــەو جەنگـــە
چـــونكە ناپـــاكن ، دڵتـــان بەژەنگـــە

ئـــــــیتر ســــــوپاکە وەکـــــــو لەمەوبـــــــەر
بەدڵگوشـــــــــادی ڕێگـــــــای گرتەبـــــــــەر

پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :- ئـــــەوەی ئـــــەهاتوون
هـــــــەمووی مرۆڤـــــــی ناپـــــــاك و دووڕوون

وتیـــــــان :- (ابـــــــوذر) لـــــــە نەهاتوانـــــــە
پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :- ئـــــەو موســـــڵمانە

جـــا پیاوێکیـــــان دیـــت کـــــە دووربـــــەدووری
ڕێگـــــای گرتبـــــوو زۆر بـــــە مـــــەجبووری

وتیـــان :- ئـــەی ســـەرومر پیـــادەك لـــە ڕێیـــە
بـــــەڵام نـــــازانین ئـــــەو پیـــــادە کێیـــــە

پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :- دە (ابـــــوذر) بـــــە
دە مـــــوژدەهێن بـــــە و ناخۆشـــــیبەر بـــــە

کـــە پیادەکـــــە هـــات ئـــەو (ابـــوذر) بـــوو
بـــە گـــوێرەی حـــەز و ویـــستی ســـەرومر بـــوو

دیـــار بـــوو (ابـــوذر) بۆیـــە جێمـــا بـــوو
چـــــونکە وشـــــتری هێـــــزی نـــــەما بـــــوو

گـــشت کـــــەل و پـــــەلی دابـــــوو بـــــەکۆڵی
بـــــەدوای ســـــوپاکە لـــــە دەشـــــت و چـــــۆڵی

پێغەمبـــــــەری خـــــــواش کـــــــاتێ پێیزانـــــــی
زۆر نـــــــزای بـــــــۆکرد لـــــــە میهرەبـــــــانی

فەرمووی بە یاران :- نازانن وایە
کەوا (ابوذر) دڵسۆزی خوایە

هەروەها فەرمووی :- (ابوذر) بە تاک
دەمرێ و بەتاکیش دێتەدەر لەخاک

ئیتر هەر دەڕۆیشت ئەو سێ هەزارە
هێزێکی خودای پەروەردگارە

ڕۆیشتن ، تاکو چوونە سەر ئاوێک
بۆ حەسانەوە دابەزین تاوێک

هەمووی کەلاوەی پیس و بەبۆن بوو
شوێنی گەلانی سەردەمی کۆن بوو

جا سەروەر فەرمووی:- ئەم شوێن و ئاوە
بەزەیی خودای لێ هەڵگیراوە

ئاوێکی پیسە ، کەس نەیخواتەوە
کەس دەستنوێژیشی پێ نەشواتەوە

خەڵکەکەش پێشتر چوو بوون بۆ سەر بیر
بەو ئاوە پیسە کرابوو هەویر

ئیتر دوور کەوتن لە سەر بیرەکان
دایان بە وشتر گشت هەویرەکان

خەڵکەکە پرسی :- بۆچی ئەم ئاوە
پیس و بۆگەنە ، چی تێکراوە ؟

سەروەریش فەرمووی :- بۆیە بێ سوودە
ئەو شوێنە ژینگەی قەومی (ثمود)ە

زۆر تاوان لێرە ئەنجامدراوە
بۆیە ، تووڕەیی خوای لێگیراوە

نە کۆمەڵ کۆمەڵ ، نە تاکە تاکە
بە شەو دەرمەچن ، زۆر ترسناکە

ئەگەرچی یارێك لە یارەکانی
ئەو فەرموودەیەی بەزۆر نەزانی

شەو دەرچوو بایەك هاتوو ئەوی برد
بۆ سەر کێوی (طي) ، هەر دەست بەجێ مرد

بەیانی هەستان لەوکاتە زووە
جوانە وشتری سەروەر ون بووە

زۆر بێ ئاگاش بوون خەڵکان لەو ڕووە
نەیاندەزانی ، بۆ کام لا چووە

بۆ لایان هات دووڕووێك لەولاوە
کاتێ کەزانی ، وشتر نەماوە

وتی :- گەر ڕاستە نێراوی خوایە
خودای ئەو ئاگای لە گشت دونیایە

بۆچی نازانێ وشتر لەکوێیە؟
لە کامە پەنا لەکامە جێیە؟

هـــەر بـــەهاوکاری خـــودای بـــێ وێنـــە
ســـەروەریش فـــەرمووی :- لـــە فـــلآن شـــوێنە

ئەوســـا لـــەبۆی چـــوون یـــەك یـــاخود دوو یـــار
دیتیـــان ، جلـــەوی گـــیر بـــووە لـــە دار

ئـــیتر فـــەرمانی دەرکـــرد پێغەمبـــەر
کـــەوا بـــەرەو (رۆم) رێ بگرنەبـــەر

رۆیـــشتن تـــاکو چـــوونە ســـەر ســـنوور
نزیـــك دوژمنـــی بـــەد و رق ئەســـتوور

کـــاتێ ســـوپای (رۆم) بـــەم شـــتەی زانـــی
گـــەڕاوە دواوە بـــۆ قـــەلآکانی

ئەوســـا بـــۆ پـــەیمان هەنـــدێ تـــیرە و هـــۆز
هـــاتن لـــە بـــۆلای ســـەروەری دڵـــسۆز

پـــەیمانی بەســـتی بـــە جـــۆرێکی جـــوان
(جزیـــە)شـــی دەســـتاند تـــەواو لـــە هـــەموان

ســـەرکردەی هۆزێـــك مـــابوو (ئوکەیـــدەر)
هـــیچ بـــڕوای نـــەبوو بـــە خـــوا و پێغەمبـــەر

جـــا (خالیـــد) بـــە خـــۆ و پێـــنج ســـەد جـــەنگاوەر
بۆیـــان چـــوو بـــەپێی فـــەرمانی ســـەروەر

خـــوای گـــەورە هێـــزی پێـــدان دەمـــاودەم
هـــەمووی دیلکـــردن ، زۆر بـــوون ، یـــاخود کـــەم

(تۆگەیـــــدەر)یـــــشی وەکـــــو دەســـــت بەســـــەر
هێنایـــــەوە بـــــۆ خزمـــــەت پێغەمبـــــەر

کـــــە پـــــەیمانی بەســـــت ســـــەروەر لەگـــــەڵی
ئـــــەویش (جزیـــــە)ی دا ، بـــــەبێ دوودڵـــــی

ئـــــیتر لـــــە (تـــــەبووك) بیـــــست ڕۆژ مانـــــەوە
تـــــا ڕاپـــــان هاتـــــە ســـــەر گەڕانـــــەوە

ئـــــەو هێـــــزە زۆرە ، بـــــڕوا بەتینـــــە
هاتنـــــەوە بـــــەرەو شـــــاری (مەدینـــــە)

ئەوســـــاکە هەســـــتان هـــــەموو خـــــەڵکی شـــــار
چـــــوونە پێـــــشوازی ســـــوپای بـــــڕوادار

کـــــاتێ ســـــوپاکە دەگەڕێتـــــەوە
(ئەنـــــەس) لـــــە بۆمـــــان دەگێڕێتـــــەوە

دەڵـــــێ :- چـــــەند کەســـــێك لـــــە شـــــار جێمـــــابوون
بـــــەڵام تامـــــەزرۆی بەرنامـــــەی خوابـــــوون

لەبەرنـــــەبوونی و لەبـــــەر هـــــەژاری
لـــــە جـــــەنگی (تـــــەبووك) نـــــەبوون بەشـــــداری

جـــــا (ئەنـــــەس) دەڵـــــێ:- پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :-
بـــــە ویـــــستی خـــــودا ئەوانـــــە هـــــەمووی

دژ بـــــە ناحـــــەقی لـــــە وێنـــــەی شـــــێرن
هـــــەروا لەگـــــەڵمان هاوبەشـــــی خێـــــرن

بـــــۆ مزگـــــەوت چـــــوو پێغەمبـــــەری خـــــوای
جێمـــــاوی دوورووو هـــــەموو چـــــونە لای

بـــــە نووزانـــــەوە ، بـــــێ شـــــەرم کـــــردن
لـــــە ســـــەرومریان کـــــرد داوای لـــــێ بـــــووردن

دەســـــتیان بـــــە درۆ کـــــرد وتیـــــان کـــــە ئـــــەوان
تـــــەواو هاتوونـــــە نـــــاو بازنـــــەی ئیمـــــان

کەچـــــی ئـــــەوان هـــــەر بـــــە زار و زمـــــان
باوەڕیـــــان هـــــەبوو بـــــەخودای جیهـــــان

هەنـــــدێکیش زمانڕاســـــت بـــــوون لـــــە ئاســـــتی
قـــــسەیان دەکـــــرد زۆر زۆر بەڕاســـــتی

پەشـــــیمانیش بـــــوون لـــــەو نەچـــــوونەیان
خـــــوداش بەخـــــشینی بـــــە دەقـــــی قورئـــــان

بـــــۆ ئـــــەم مەبەســـــتە ئایـــــەت هاتـــــە خـــــوار
کـــــە دەیـــــان بەخـــــشێ خـــــودای کردگـــــار

بـــــەڵام خـــــوای گـــــەورە مـــــەرجی بۆدانـــــان
ئـــــەوانـــــیش وتـــــیـــــان :- ڕازیـــــن ، بـــــەچـــــاوان

# تێکدانی مزگەوتی (ضرار)

لـــە کـــاتی (تـــەبوك) دووڕووی (مەدینـــە)
زیـــاتر ناپـــاك بـــوون دژ بـــە ئـــەم دینـــە

دەجولانـــــەوە زۆر بـــــە بێـــــشەرمی
هەرچـــەند پێغەمبـــەر بـــە قـــسەی نـــەرمی

گفتوگـــــۆی دەکـــــرد لەگـــــەڵ دووڕووان
تـــــا بەتـــــەواوی ببنـــــە موســـــڵمان

(ئـــەبوعامر)یـــش دوژمنـــی خوابـــوو
لـــە لای (هرقـــل) بـــوو ئـــەو پـــەنای دابـــوو

لەبـــەر ناپـــاکی کـــەمێك لەمـــەو پـــێش
بـــالیگرتبوو وەکـــو ڕەشـــەمێش

ئـــەو ناپـــاکێکی سەرســـەختی زوو بـــوو
لـــە ترســـی ڕاســـتی بـــۆ نـــاو (ڕۆم) چـــووبوو

(ئـــەبوعامر)ی دڵ پـــڕ لـــە کینـــە
هـــەواڵی دایـــە دووڕووی مەدینـــە

بـــەخۆ و بـــە هێزێـــك دێمـــەوە لـــە (ڕۆم)
خـــانووم بـــۆ بکـــەن هـــاوبیرانی خـــۆم

هەرچـــەند پیـــسێکی زۆر خـــەیاڵ خـــاو بـــوو
بـــەڵام لـــەناویان گـــەورەو بەرچـــاو بـــوو

ئـــەوجا دووڕووان زوو بەدەســـت و بـــرد
لـــەنزیك (قبـــا) مزگـــەوتێکیان کـــرد

لــــەوکات پێغەمبـــــەر دەچـــــوو بـــــۆ (تـــــەبووك)
كـــــە هـــــاتن بـــــۆلای دووڕووی بـــــەها ســـــووك

جـــــا داوایـــــان كـــــرد لـــــە پێغەمبـــــەرمان
لـــــە بیلبیلـــــەی چـــــاو لـــــە تـــــاجی ســـــەرمان

پێیـــــان وت :- ئێمـــــە لەبـــــەر (بـــــا) و بـــــاران
ڕێگاكـــــەش دووره بـــــۆ خۆشـــــی یـــــاران

وا دروســـــتمان كـــــرد مزگـــــەوتێك بـــــۆ خـــــوا
وەره نوێـــــژی لـــــێ بكـــــە پێـــــشەوا

تـــــا لـــــەناو خـــــەڵكی زۆرتـــــر بێـــــت ڕێـــــزی
گەرچـــــی بنكـــــە بـــــوو بـــــۆ شـــــەڕانگێزی

لـــــەو دەم و كـــــاتیش بـــــۆ تـــــەبووك دەچـــــوون
هـــــاتن بـــــۆلای دووڕووانـــــی زەبـــــوون

ســـــەروەریش فـــــەرمووی :- لـــــە دوای ئـــــەو جەنگـــــە
نوێـــــژی لـــــێ دەكـــــەم ، ئێـــــستا درەنگـــــە

ئەگەرچـــــی جێگـــــای پـــــیلان گێـــــڕان بـــــوو
جێگـــــای مرۆڤـــــی دوارۆژ وێـــــران بـــــوو

كـــــاتێ لـــــە (تـــــەبووك) ســـــەروەر گـــــەڕاوە
ســـــروش هاتـــــەخوار لـــــەلای خـــــوداوە

(جوبرائیـــــل) هـــــات و وتـــــی :- (موحەممـــــەد)
هـــــاتووم لـــــە لایـــــەن خواوەنـــــدی(صـــــمد)

تـــــاوەکو تێکـــــدەی مزگـــــەوتی (ضـــــرار)
بەســـــەر خـــــەڵکانی بـــــەد و ســـــتەمکار

لەســـورەی (تەوبـــە) ئایـــەی ســـەد و شـــەش
دەکـــاتن باســـی ئـــەوانی دڵـــرەش

هـــــەزاران درووود لـــــە پێغەمبـــــەری
یـــەك دوو یـــارێکی نـــاردن بـــۆ ســـەری

مۆڵگـــــە و پـــــەنایان کـــــردە کـــــەلاوە
چـــــونکە کرابـــــوو لـــــەبۆ ئـــــاژاوە

لێیـــان تێکـــدرا ئـــەو جێیـــە تـــازە
جـــا بـــە ناچـــاری بـــوون پەرتـــەوازە

گـــەرمو دووڕووان لـــەوکات نـــەخۆش بـــوو
ڕۆژ بـــە ڕۆژ زیـــاتر حـــاڵی پـــەرۆش بـــوو

ســـەرۆکی خـــەڵکی دووڕوو بـــوو هـــەروا
بـــاوەڕی نـــەبوو بـــە تـــەنیایی خـــوا

ئەوســـا دووڕووان پـــەنایان بـــۆ بـــرد
بـــەڵام نـــەخۆش بـــوو ، ئـــیتر ئـــەویش مـــرد

(عبـــدالله)ی دووڕوو تـــا لـــە ژیـــان مـــابوو
دوژمنـــی ســـەختی بەرنامـــەی خـــوا بـــوو

بـــەر لـــەوەی بمـــرێ (عبـــدالله)ی نـــەزان
بکەوێتـــە بـــەر شـــاڵاوی خـــەزان

وتـــی :- ئـــەی خەڵکـــە پـــێم باشـــە ئـــەوها
نوێـــــژم لەســــــەر کـــــا پێغەمبــــەری خـــــوا

پێغەمبەریــــــشمان بۆســــــەر تــــــەرمی چـــــوو
تـــــــاوەکو نوێــــــــژی لەســــــــەر بکـــــــا زوو

بـــــەڵام حـــــەزرەتی (عومــــەر) پێـــــی فــــەرمووو :-
نوێـــــــژ مەکـــــــە لەســــــــەر مرۆڤـــــــی دووڕوو

چـــــونکە ئەوانــــــە زۆر هـــــــەناو پیـــــســــن
دژ بــــــە خودانــــــە ، دۆســـــتی (ئیبلـــــیس)ــــن

خـــوای گـــەورەش بـــۆی نـــارد ئایـــەی هەشـــتا و ســـێ
لەســــــورەی (تەوبــــــــە) تـــــا لەسەرکەســــــێ

هـــــەرگیز نوێـــــژ نـــــەکا ئەگـــــەر دووڕووبـــــێ
ئەگـــــەر کـــــوفر بـــــۆی ڕەفتـــــار و خـــــوو بـــــێ

لـــــە دوای تێکـــــدانی مزگـــــەوتی (ضـــــرار)
ئیـــــسلام پـــــەرەی ســــــەند لـــــە دێهـــــات و شـــــار

هـــــەزار و مـــــاڵقوڵ بــــێ پـــــەنا و پـــــەردە
ئیمانیـــــــــان دێنـــــــــا جـــــــــا وردە وردە

پـــاش یـــەك ســـاڵ چـــەندین نوێنـــەری (ســـەقیف)
دانیـــــــــشوانی شارۆچـــــــــکەی (طــــــــائف)

وتیـــان :- ئـــەی ســـەرومر هـــەر لـــەدوای چـــاکەین
موســـــڵمان دەبـــــین بــــەڵام نوێـــــژ ناکـــــەین

گــــەر موســــڵمان بـــووين ئێمـــــه لـــــه هــــەركات
دبـــــــێ بمـــــــێنێ وەك خـــــــۆى ، بتـــــــى (لات )

پێغەمبـــــــەرى خـــــــواش فـــــــەرمووى :- وانـــــــابێ
هەركەســـــــــێ ئەگـــــــەر دڵـــــــسۆزى خـــــــوابێ

تـــــــا دوا هەناســـــــــه و دڵۆپـــــــه خـــــــوێنى
نـــــــابێ بـــــــۆ بتـــــــان ســـــــەر دانـــــــەوێنى

ئەوســـــــاكه ڕاســـــــتى بـــــــاڵى داخـــــــستن
بەســـــــەر(بـــــــت)ـــــــان هـــــــات دەردى شكـــــــستن

## مردنی (إبراهیم)ی كوڕی پێغەمبەر(ﷺ)

تـــــاوەكو ئێـــــرە هــــەر كــــات لــــەدوای كــــات
خۆشــــــحاڵی لــــــەبۆ خواناســــــان دەهــــــات

بــــــەڵام خــــــوای گــــــەورە لــــەو دەم و كاتــــــە
بــــــە ســــــەری هێنــــــان ئــــــەو مەرگەســــــاتە

ئــــــەویش خواوەنــــــدی زۆر بــــــە توانــــــا و هێــــــز
ویــــــستی لــــــە ســــــەروەر زۆر تــــــر بــــــێ ڕێــــــز

ڕێــــــزی هــــــەر هــــــەبوو بــــــۆ ئــــــەو بێنــــــازە
بــــــەڵام پێــــــی بەخــــــشی ئــــــەو غەمــــــە تــــــازە

جــــــا (ئیــــــبراهیم)ی كــــــوڕی منــــــداڵ بــــــوو
ڕونــــــاكی دڵ و دەروون و مــــــاڵ بــــــوو

لــــــە ســــــاڵی دەیــــــەم دەوری پــــــانزە مــــــانگ
(ئیــــــبراهیم) ژیــــــا لــــــە دوای پەخــــــشی بــــــانگ

كــــــاتێ نەخۆشــــــی بــــــاڵی كێــــــشا ســــــەر
زۆر بەغــــــەمباری هەســــــتا پێغەمبــــــەر

چــــــوو بــــــۆ لای لەگــــــەڵ (عبــــــدالرحمن)ی
وەكــــــو بــــــەهاربوو بــــــۆ دڵ و گیــــــانی

بــــــەڵام كــــــە بینــــــی وا جگەرگۆشــــــی
لای دایكیــــــەتی ، خــــــستویە كۆشــــــی

دڵــــــی قرچــــــەی كــــــرد ئــــــا لــــــەو كاتــــــەوە
گیــــــانی خــــــەریك بــــــوو كــــــە بڕواتــــــەوە

بـــــەڵام پێغەمبـــــەر هـــــیچ نـــــەیکرد هـــــاوار
نەیڕەنجانـــــد لـــــە خـــــۆی خـــــودای کردگـــــار

گـــــەلێ شـــــوکرانەبژێری خـــــوا بـــــوو
گەرچـــــی (ئیـــــبراهیم) کـــــەمێکی مـــــابوو

جـــــا بـــــە دیاریـــــەوە یـــــەکجار دامـــــاو بـــــوو
چاویـــــشی پـــــڕ لـــــە فرمێـــــسك و ئـــــاو بـــــوو

پاشـــــانیش فـــــەرمووی :- جگـــــەر گۆشـــــی خـــــۆم
فـــــەرمانی خوایـــــە شـــــتێ نـــــاکرێ بـــــۆم

دەســـــەڵاتی خـــــوا بـــــەهێز و زاڵـــــە
هـــــەموو خـــــەڵکیش ئـــــەم تامـــــە تاڵـــــە

دەبـــــێ بینۆشـــــی تـــــەنها یـــــەکجارێ
هـــــیچ کـــــەس نـــــاتوانێ وەبـــــینێ جـــــارێ

بـــــەڵام داخەکـــــەم (ئیـــــبراهیم)ی پـــــاك
گیـــــانی شـــــیرینی بەخـــــشی بـــــە خـــــوای تـــــاك

پێغەمبـــــەری خـــــوا نوێنـــــەری دینـــــی
کـــــاتێ کـــــە مـــــەرگی کوڕەکـــــەی بینـــــی

فرمێـــــسکی ســـــۆزی هاتـــــە خـــــوار لـــــە چـــــاو
لـــــەدیار تەرمەکـــــەی وەســـــتا بـــــوو ، تاســـــاو

پێغەمبـــــەر هـــــەیبوو کـــــام ڕەوشـــــت جوانـــــە
خـــــەڵکیش دەیـــــانوت :- گریـــــان تاوانـــــە

ئەوسـاکە فـەرمووی :- یـاران بـەهیچ ڕەنـگ
یاسـاغ نـەکراوە گریـانی بـێ دەنـگ

خـەڵکی بـڕوادار دەبـێ هـەروابێ
بـەزەیت نـەبێ ، خـەڵکیش بـۆت نـابێ

ئەوسـا شـۆردیان زوو بـە دەسـت و بـرد
سـەروەر و یـاران نوێـژیان لەسـەر کـرد

بـە خاکیـان ئەسـپارد تەرمەکـەی پـاکی
لـە گۆڕسـتانی (بـەقیع) بـە چـاکی

وەك ئـەو گۆڕانـەی ئێـستا و لەمـەو بـەر
کێلیـان لـێ چـەقاند لـە خـوار و لەسـەر

کـاتێ ناشـتیان تـەرمی ئـەوی پـاك
بـەری خـۆر گـیرا بەویـستی خـوای تـاك

لـەو کـات خـەڵکێکی نـەزان و فـام کـاڵ
دەیـانکرد قـسەی نابـەجێ و بـەتاڵ

دەیـانوت :- خـودا بـە مردنـی ئـەو
بـەری خـۆری گـرت ڕۆژی کـرد بـە شـەو

پێغەمبـەری خـواش پێـی ئاگـادار بـوو
بـە ئـەم قـسانە زۆر خەفـەتبار بـوو

بۆیـە ئـەو خەڵکـەی هـەموو کـۆکردن
باسـی مـوعجیزەی خـودای بـۆکردن

فـــەرمووی :- ئـــەی یـــاران کـــەی ئەمـــە وایـــە ؟
ئـــــەوەی کـــــە دەیڵـــــێن ، زۆر ناڕەوایـــــە

بـــــە هەڵەداچــــوون ، زۆر بـــــاش بـــــزانن
خـــۆرو مـــانگ بەڵگـــەی خـــوای میهرەبـــانن

هـــــەر کەســــێ بکـــا کۆچـــی یـــەکجاری
تێکناچــــێ بەڵگــــەی پــــەروەردگاری

جـــا پەشـــیمان بـــن بـــێ مـــەرج و بـــەڵێن
تـــا مـــاون هـــەرگیز شـــتی وا مـــەڵێن

ئەوســـا پێغەمبـــەر وەك گیـــان لەسەردەســـت
ڕایمـــاڵین هـــەموو گرفـــت و بەربەســـت

دەســـا ئـــەی خـــەڵکان گـــەر شـــەیدای خێـــرن
ســـــڵاو و درووود لـــــە بـــــۆی بنێـــــرن

بـــۆ ئـــەوەی هـــەرگیز لـــە ڕۆژی دوایـــی
نەچـــنە ژێـــر بـــاری پەســـتی و ڕیـــسوایی

بـــۆ خـــاتری خـــۆت خـــودای کردگـــار
بـــاوکی (ئیـــبراهیم) بکـــەی داواکـــار

بـــــە ســـــەرفرازی بمانبەیتـــــەوە
لـــە ژێـــر ئـــاڵاکـــەی کـــۆمـــان کـــەیتـــەوە

## حەجکردنی (ابوبکر) و موسڵمان بوونی هۆزەکانی عەرەب

لەلایەن خودای هەموو بونەوەر
لە نۆیەمیین ساڵ کۆچی پێغەمبەر

حەج فەرزکرا لەسەر موسڵمان
بەو ئەرکە یەکجار خۆشتر بوو ژیان

بتپەرستانیش حەجیان هەردەکرد
بۆ بتانیش هەر کڕنوشیان دەبرد

ڕووت و بێ بەرگ دەجوڵانەوە
لە دەوری کەعبە دەسوڕانەوە

بەڵام حەجی وان هەر جێگای خەم بوو
بۆ ڕێز گرتنی بت و صەنەم بوو

موسڵمانانیش لێیان بێزار بوون
دەنگیان نەدەکرد چونکە ناچار بوون

پێغەمبەری خواش نەیبوو هیچ ماوە
خۆی بۆ حەج بچێ لەهەموو لاوە

ڕویان دەکردە ئەو دینە پاکە
موسڵمان دەبوون بەکۆ و بەتاکە

جا سەروەر فەرمووی ئا بەو دڵێرە
ئەی (ابوبکر) هەستە بەو خێرە

لەگەڵ حاجیان حەج بکە ئەمساڵ
سەرقافڵەیان بە گیانە بە هەرحاڵ

(ابـــــوبکر)یـــــش هەســـــــتا بـــــــەکاری
خـــــۆی و سێـــــسەد کـــــەس لەگـــــەڵ دیـــــاری

کەوتنـــــە ڕێگـــــا ، جـــــا لـــــەدوای ئـــــەوان
لـــــەبۆ پێغەمبـــــەر خـــــودای میهرەبـــــان

ســـــورەتی (توبـــــە)ی هـــــەنارده خـــــوارێ
چـــــونکە یـــــاری بـــــوو لەهـــــەموو کـــــارێ

جـــــا ئـــــەم ســـــورەتە ڕا دەگـــــەیێنێ
پەیوەنـــــدی لەگـــــەڵ کـــــوفر نـــــەمێنێ

لـــــەڕێگا دابـــــوو (ابـــــوبکر) ی ژیـــــر
ئینجـــــا پێغەمبـــــەر کـــــەمێ کەوتـــــە بـــــیر

بـــــانگی کـــــرد فـــــەرمووی :- ئـــــەی عـــــەلی وەرە
ئـــــا ئـــــەم قورئـــــان پاکـــــە زوو بـــــەرە

بـــــۆ حاجییـــــانی گیانـــــە بخوێنـــــە
بـــــە هەرهـــــەموویان ڕابگەیێنـــــە

وە پێیـــــان بڵـــــێ لەمـــــساڵ بـــــەدواوە
بتپەرســـــت حـــــەج کـــــەن ئـــــیتر تـــــەواوە

بـــــەڕووتی کـــــەران لـــــە کەعبـــــە نـــــابێ
فـــــەرمانی خوایـــــە دەبـــــێ هـــــەروابێ

ئـــــەوەی کـــــافرە و نـــــەبێ موســـــڵمان
ناچـــــێتە بەهەشـــــت بـــــەبێ هـــــیچ گومـــــان

هەرکەسیش ئەگەر پەیمانی هەبێ
لەگەڵ پێغەمبەر تا تەواو دەبێ

با لەسەر بڕوات تا ماوە ماوە
گەر ماوە ئەما ئیتر تەواوە

ئەوانەی کەوا بەبێ پەیمانن
با ئاگادار بن چاکیش بزانن

چوار مانگ مۆڵەتیان هەیە ، سەربەستن
پاش ئەوە ناکرێ بت بپەرستن

جا (عەلی)ش هەستا بەم دەم و دەستە
وشتری هێنا بۆ ئەم مەبەستە

بە وشترەکەی سەرداری سەروەر
بەرەو بیابان ڕێگای گرتەبەر

ماوەیەك ڕۆیشت لە نزیك یا دوور
گەیشت بەوانی خواویست و ڕوو سوور

(ابو بکر)یش پێوت لەوکاتی
بۆ فەرماندەیی ئایا تۆ هاتی؟

(عەلی)ش بەوی وت بە گوفتی نەرم
نەخێر گیانەکەم من فەرمانبەرم

لەگەڵ ئێوە دێم بۆ کارێکی وا
پێی ڕاسپاردووم پێغەمبەری خوا

لـــەو کاتـــەی گەیـــشتن زوو بـــە دەســـت وبـــرد
جـــا (ابـــوبکر) خـــەڵکی فێردەکـــرد

فێـــری دەکـــردن حـــەجکردن چـــۆنە
ببـــووە ســـەرداری حاجیـــان بـــەو بۆنـــە

(عـــەلی)ش لـــە (مینـــا) وەك کێـــوی بەســـەنگ
ســـورەتی (تەوبـــە)ی دەخوێنـــد پـــڕ بـــەدەنگ

چـــوار خاڵەکەشـــی یـــەك یـــەك باســـکردن
لـــە بـــۆ کـــافران چـــاکتر بـــوو مـــردن

(ابـــوبکر)ی لێـــزان و فێرکـــار
جـــاڕدەری زۆری ناردنـــە نـــاو شـــار

لـــە گـــشت کـــۆڵان و کوچـــەی ئـــەو شـــارە
وتـــەی (عـــەلی)یـــان دەکـــرد دووبـــارە

خـــەڵکی بتپەرســـت بەوبانگـــەوازە
چـــونە ژێـــر بـــاری خـــەمێکی تـــازە

زانیـــان کـــەوا خـــۆ دەڕوخێـــنن
ئەگـــەر بـــۆ ئیـــسلام ســـەرداننەوێنن

ئینجـــا ناچـــار بـــوون وەبیـــنن چـــارێ
چـــاریش ناســـانە گـــەر بێنـــە خـــوارێ

لـــە بتپەرســـتی و ڕێبـــازی خۆیـــان
خـــوا لـــە هـــەموو کـــەس چـــاکترە بۆیـــان

بۆیـــــان ڕوون بـــــوّوە ڕێبازیــــــان دۆڕا
بۆیـــــە بـــــۆ خـــــودا دەروونیـــــان گـــــۆڕا

تـــــاك تـــــاك و كۆمـــــەڵ هـــــەموو بەناچـــــار
هاتنـــــە ســـــەر ڕێگـــــای خـــــودای كردگـــــار

هـــــەر لەوســـــاڵدا زیـــــاتر لـــــە شەســـــت هـــــۆز
هـــــاتن لـــــە بـــــۆ لای ســـــەروەری دڵـــــسۆز

ناچـــــار بـــــوون بۆیـــــە بـــــەو ڕەنگـــــە هـــــاتن
تـــــاكو ســـــولحیان لەگـــــەڵ بكـــــاتن

هـــــەر هـــــەموو ژیـــــانی پـــــڕ بـــــوو لـــــە تـــــاڵی
بتپەرســـــــــتنی لـــــــــە ڕەگ ڕامـــــــــاڵی

ئێـــــــستاش وەك ئـــــــەوكات بەبـــــــەردەوامی
وەســـــــتاوە دژی بـــــــڕوای نـــــــەفامی

هـــــەزاران ســـــڵاو لـــــە گیـــــانی پـــــاكی
لـــــە تـــــاریكی شـــــەو بووبـــــە ڕونـــــاكی

هـــــەر لـــــەو ساڵەشـــــدا (ام كلپـــــوم)ی پـــــاك
كۆچـــــی كـــــرد بـــــەرەو خـــــودای بـــــەرز و تـــــاك

كـــــچی ســـــەروەری ژیـــــر و لێـــــزان بـــــوو
ژنـــــی (عوسمـــــانی كـــــوڕی عـــــەففان) بـــــوو

ئـــــەی خودایـــــە گیـــــان هەركـــــەس بتناســـــێ
لـــــە ترســـــی تـــــۆدا بتاســـــێ

ڕەش و لێـــــڵ نەكـــــەی ڕوخـــــسار و ڕەنگـــــی
هـــــەرگیز كـــــەم نەكـــــەی لـــــە ڕێـــــز و ســـــەنگی

# حەجی ماڵ ئاوایی

بـــه هاوکـــاری خـــوا دەکـــەین ئـــەو باســـه
باســـــــێکه دڵان دێنێتـــــــه تاســـــــه

ســـاڵی (دە)ی کۆچـــی ســـەروەر ڕایگەیانـــد
چـــی موســـڵمانه هـــەمووی تێگەیانـــد

فـــەرمووی :- گـــەر مۆڵـــەت بـــداتن مـــردن
ئـــەم ســـاڵه دەچـــین لـــه بـــۆ حـــەج کـــردن

هـــەواڵی هـــەبوو لـــه لای خـــوداوه
ژیـــنی بـــەس بەشـــی ئـــەو (حـــەج)ـــه مـــاوه

ئـــەو ســـاڵه زۆربـــەی زۆری خواناســـان
لـــەبۆ ئـــەو حەجـــه بـــاش خۆیـــان ســـازان

مـــانگی (ذوالقعـــده) لـــه ڕۆژی شـــەممه
هەرچـــی حـــەج ویـــست بـــوو کۆبـــوون لـــەو دەمـــه

چـــونکه پێغەمبـــەر ویـــستی ، چـــی بـــاره
چـــاوی پێکـــەون ، چـــونکه دواجـــاره

جـــا بـــه ویـــستی خـــوای گـــەوره و میهرەبـــان
ئـــەو خەڵکـــه زۆره چـــوونه بیابـــان

تـــا چـــاو بـــڕ بکـــات ســـوار و پیـــاده
ڕیزیـــان بەســـتبوو بـــەرەو ئـــەو یـــاده

بـــۆ ڕەزامەنـــدی کردگاریـــان بـــوو
وشـــەی (لبیـــك) لەســـەر زاریـــان بـــوو

زیاد لە سەد هەزار بڕواداری مەرد
لە ژێر فەرماندەی سەرداری نەبەرد

ئەوسا پێغەمبەر لە بۆ حەج کردن
خێزانەکانی لەگەڵ خۆی بردن

جا وەك شەپۆلی دەریا دیاربوون
هەموو خاوەن یەك تاکە بڕیار بوون

گشتی ڕەفتاری قورئان بوو باویان
یەك بت پەرستیش نەبوو لە ناویان

لە (ذوالحلیفە) ئەوسا دەوەستن
جلیان دادەنین ئیحرام دەبەستن

ئەوسا هەر هەمووی بە یەك شێوە و ڕەنگ
دروشمیان دەوت بە هاوار و دەنگ

لە ڕۆژی چوارەم مانگی (ذوالحجة)
چوونە ناو (مەککە) هەر بە ئەو مەرجە

لە کاتێك سەروەر گەیشتە (مەککە)
تکای کرد خوایە ڕێزی زۆر بکە

بەلأم پێشەکی (کەعبە)ی (طەواف) کرد
بە دەوری گەڕا حەوت جار دەست و برد

بەویستی خودای بالأدەست و تاك
ئینجا ماچی کرد بەردەڕەشی پاك

هەروەها کردی دوو ڕکاتی نوێژ
لە گەڵ خوای گەورە کردی وتووێژ

پێش (صەفا و مەروە) هەر لەو کاتەوە
لە ئاوی زەم زەم تێر دەخواتەوە

پاشان لە کێوی (عەرەفە)ی بەڕێز
وتارێکی دا پڕ بەها و بەهێز

بە ویستی خودای پەروەردگاری
ئەم وتارە ، بوو بە دوا وتاری

چونکە لە لای خوای بە توانا و (جەبار)
ئایەت و بەڵگەی لە بۆ هاتە خوار

ئایەتی بۆ هات لە لایەن خواوە
گەیاندی ئیتر ئیسلام تەواوە

سورەی (مائدة) لە ئایەتی سێ
ئاگاداری یە بۆ هەموو کەسێ

جا گوێتان بگرن بە گوێی دڵ و سەر
لە تام و چێژی وتاری سەروەر

بە قوربانت بین پێغەمبەری پاك
ئێمەی ئوممەتت بە کۆمەڵ و تاك

ئەوسا زۆر بە دڵ فەرمووی بە خەڵکی
یەکتر نابینین ساڵێ تر ، بەڵکی

جـــا ئـــەم وتـــارە زۆر هەســـت بزوێنـــە
فـــەرمووی :- بـــەو جـــۆرە هـــەرگیز لـــەم شـــوێنە

یـــەکتر نـــابینین یـــاران بـــەو ڕەنگـــە
جـــا گوێتـــان بگـــرن تـــەواو لـــەو دەنگـــە

جـــا (ئەبوبـــەکر) زانـــی تـــەواوە
تەمـــەنی ســـەروەر زۆری نـــەماوە

دڵ و دەروونـــی پـــڕ بـــوو لـــە بریـــا
دەڵـــێن لـــەم کاتـــە زۆر بـــەکوڵ گریـــا

ئەوســـا پێغەمبـــەر فـــەرمووی بـــە جـــوانی
فـــەرمان و کـــاری کـــاتی نـــەزانی

ئیـــسلام مـــاڵێنی گـــشتی لابـــردن
خـــستنیە ژێـــر پێـــی ، هـــەمووی ون کـــردن

هەرکەســـێ هـــەیبێ مەبەســـتی تۆڵـــە
ئێـــستا واچـــاکە دانێـــت ئـــەو کۆڵـــە

دڵ و دەروونتـــان چـــاك بـــشۆرن
لـــە ڕابردووتـــان هـــەرگیز مـــەنۆڕن

بـــە قوربـــانی بـــین ، فـــەرمووی :- ئـــەی یـــاران
نەکـــەن بـــچنەوە ســـەر بـــاوی جـــاران

هـــەروا (ســـوو) خـــواردن بـــەدترین بـــاوە
نەچـــنەوە ســـەری ، بـــاوی نـــەماوە

ئــــــەمرۆ شـــــــەیتانان دامـــــــاو و پەســـــــتن
چـــــــــونکە دڵنیـــــــــان ، نایانپەرســــــــــتن

دەربـــــــارەی مـــــــانگ و ســـــــاڵانی فـــــــەرموو
دەســـــتکاری مەکـــــەن یـــــاران بـــــە قـــــەد مـــــوو

ڕێزگیراوەکــــــــان بـــــــــزانن چـــــــــوارن
دانـــــــــــانی خـــــــــودای پـــــــــەروەردگارن

یـــــەکیان (ڕەجـــــەب)ـــــە زۆر ڕێـــــك و پــــێکن
ســــێیانی تـــــریش یــــــەك لــــــە دوای یــــــەکن

تێیانــــــدا مەکـــــەن کوشــــتار ، بـــــەرێزن
هەرچـــــــــــی مافییانـــــــــە بیانپــــــــارێزن

پاشـــــانیش فـــــەرمووی :- لــــــە خـــــوا بترســـــن
لـــــە خراپـــــە و هەڵـــــەی خۆتـــــان بپرســـــن

بەرامبــــــــەر ژنــــــــان بەرپرســـــــــیارن
ئەمانــــــــەتی خـــــــوای پـــــــەروەردگارن

مەکـــــــەن ڕەفتـــــــاری خـــــــەڵکانی پێــــــشان
کـــــچی زینــــــدویان بـــــۆ چــــــاڵ دەکێـــــشان

مـــــــارەیی و مــــــــیرات بـــــــەوان ببەخـــــــشن
لـــــــە بـــــــارەی مافـــــدا چـــــونکە هاوبەشــــــن

بـــــە فـــــەرمانی خـــــوا حـــــەلاڵی ئێـــــوەن
چـــــرا و ڕوونـــــاکی نـــــاو مـــــاڵی ئێـــــوەن

* * *

(خوشـــکان ســـەیر کـــەن ئـــەو مافـــە چـــۆنە
کـــــە هەنــــدێ دەڵـــێن دەســــتووری کۆنـــــە

بــــــەزمان لووســــــی خــــــەڵکی ڕۆژئـــــاوا
دەڵــــــێن :- مــــــافی ژن پێـــــشێل کـــــراوە

بــــەڵام خوشــــکانی بـــــە ســـــەنگ و بــــە ڕێـــــز
خـــــودای دادوەر و بــــــە توانـــــــا و بــــــەهێز

مافتـــــــانی داوە بـــــــە هـــــــەموو شـــــێوە
بـــــۆ ڕەخنــــە دەگـــــرن لــــە ئیـــسلام ئێـــوە؟

باگوێمــــــان بگـــــرین لـــــــە پێغەمبــــــەرمان
لــــە بیلبیلـــــەی چـــاو لـــــە تـــاجی ســـەرمان

* * *

فـــــەرمووی :- گـــــوێ بگـــــرن یـــــاران هـــــەروەها
ئەگـــــەر هەرکەســــێك بـــــوو بـــــە پێـــــشەوا

لـــــە قـــــسەی لامـــــەدەن تـــــاوەکو ئـــــەوکات
لــــــە ڕێگــــــەی ڕاســــــتی قورئــــــان لادەدات

هـــــەتاکو مـــــاون لەســـــەر ئــــــەم خاکـــــە
لەگــــــەڵ (عەبـــــد)ەکـــــان هــــــەر بکـــــەن چـــــاکە

گــــــەر هەڵەشـــــیان کـــــرد بۆیـــــان ببۆشــــن
ئازادیـــــــان کــــــەن گــــــەر نایانفرۆشــــــن

فــــــەرمووی :- ئەمانــــــە لــــــەمن وەرگــــــرن
ئەکــــەن پـــشت گـــوێی خــــەن لــــە دڵ هــــەڵگرن

دوو شـــتی زۆر بـــاش دێڵـــم لـــه ناوتـــان
هـــەرگیز لای مـــەدەن لـــه پێـــشی چـــاوتان

جـــا ئەگـــەر ئێـــوه دەســـتی پـــێ بگـــرن
پاداشـــت بـــه چـــاکه لـــه خـــوا وەردەگـــرن

ئـــەویش قورئانـــــه ، چارەســـــەرتانه
دووەم ؛ فـــــەرموودەی پێغەمبەرتانـــــه

لـــه دوای مـــن مەکـــەن کـــاری بکـــوژی
وەك زەمـــانی زوو مەکـــەن خوێنمـــژی

چـــونکه موســـڵمان هـــەموو برانـــه
هـــەموویان وەك یـــەك بەنـــدەی خودانـــه

فـــەرمووی :- هەرکەســـێ گـــەر لێـــره نیـــه
ئەگـــەر گـــوێ بیـــستی ئـــەو خێـــره نیـــه

ئێـــــوه بـــــەوانیش ڕابگـــــەیێنن
نەکـــەن ، لـــه خۆتـــان ســـەر بـــشێوێنن

ئەوســـاکه فـــەرمووی :- حـــاڵی بـــوون یـــاران
ئـــەوانیش وتیـــان :- بـــەڵێ ، وەك جـــاران

فـــەرمووی :جـــا ئەگـــەر لـــه ڕۆژی دوایـــی
لـــه کۆکردنـــەوەی حەشـــری خـــودایی

خـــودای کاربـــەجێ بپرســـێ لێتـــان
کـــەوا مـــن ڕاســـتیم وتـــووه پێتـــان

جـا ئـەی ئـەو خەڵکـەی پـڕ ڕاسـتی و بـەڵێن
لـەو ڕۆژ دەربـارەم ئێـوە چ دەڵـێن

خـەڵکیش پێیـان وت :- ئـەی نـووری چـاومان
وەك خـۆر و مـانگی ئـەتۆ لـە ناومـان

لـە دوایـش دەڵـێین بـە میهرەبـانی
بـە ئێمـەی گەیانـد ڕاسـتی بـە جـوانی

ئەوسـا کـە دەسـتی بـەرز کـرد فـەرمووی :-
خوایـە شـاهید بـە ، کـەوا هـەر هـەمووی

تـەواو ڕامگەیانـد بـەم سـەرزەمینە
بـۆ بەنـدەکانت ڕاسـتی ئـەم دینـە

بـە هاوکـاری خـوای پـەروەردگاری
لێـرە کۆتـایی هـات بـە وتـاری

تـاکو ڕۆژئـاوا سـەروەر مایـەوە
لـە خواوەنـدی تـاك دەپاڕایـەوە

پاشـان پـەنای گـرت بـەخوای کردگـار
(عەرەفـە)ی جـێ هێـشت ئەوسـا هاتـەخوار

جـا هـەموو خـەڵك لەگـەڵ پێغەمبـەر
بـۆ(مزدلفـە ) ڕێیـان گرتـە بـەر

هـەروا شـەوێکیش لـە وێ مانـەوە
بـە کڕنـۆش بـردن بـە پاڕانـەوە

ئەوێشیان جێ هێشت ، فەرمووی بە (عەباس) :-
حەوت بەردی ووردم بدێ ، ئەی خواناس

جا حاجیەکانیش هەمووی لە دەورە
ئەوسا ڕەجمی کرد شەیتانی گەورە

هاتەوە (مینا)خۆی و گشت یاران
لەبۆی دانەوە وتار وەك جاران

لە دوای وتاریش دیاری و قوربانی
بۆ خوا سەر بڕان بە میهرەبانی

پێغەمبەر بە خۆی ، (شەست و سێ) وشتر
سەریانی بڕین نە زیاد نە کەمتر

ئەرك و سوونەتیان کردن بە باشی
لە دوای قوربانی سەریشیان تاشی

پێغەمبەری خوا نزای کرد پاشان
تا خوا ڕازی بێ لە گشت سەرتاشان

جا(مینا) هەندێ دوورە لە (مەککە)
جارێ تر سەروەر لەگەڵ ئەو خەڵکە

چوو لەبۆ (کەعبە) هێندە مایەوە
تاکو حەوت جاران لێی سووڕایەوە

پاش ئەنجامدانی گشت ئەرکی خوایی
ئینجا لە (کەعبە)ی کرد ماڵئاوای

فەرمانی دەرکرد ئەو خوێن شیرینە
جێ بێڵن (مەککە) بەرەو (مەدینە)

ئەی پێغەمبەرمان خوێنی دڵمانی
تۆی ڕوناکی نێوگۆڕ و گڵمانی

فەرموودەکانت گوڵن لە ناومان
بۆیە ، ڕەفتارت بوونەتە باومان

ئەوسا هەندێکیان زۆر بە دڵ خۆشی
هەروا هەندێکیش بە دڵپەرۆشی

(مەککە)یان جێهێشت بەرەو (مەدینە)
هەموو دڵسۆزی خودا و ئایینە

زۆر کەس زانیان کە ئاخیر جارە
کە کۆ تا(حەج)ە بۆ ئەو سەردارە

چونکە لە کاتێ کێوی عەرەفات
لە لایەن خودا کۆتا ئایەت هات

دەسا برایان ئیسلام هەر هەندە
ئیتر واز بێنن لە پروپاگەندە

بۆپەند وەرناگرن لە خەڵکی گەندە
بۆ بەندان چیتر مەبن بە بەندە

# ڕێکخستنی سوپای (أسامه)

لــە دوای حـــەج کـــردن ســـەروەری بــــە ســـەنگ
کـــۆی کـــردەوە هێـــز بــــە جـــوانترین ڕەنـــگ

چـــونکە ڕۆمـــەکان زۆر دەســـت بزێـــو بـــوون
دژ بــــە دینـــی خـــوا دەم پـــڕ جنێـــو بـــوون

موســـــلمانانیان هـــــەروا دەکوشـــــتن
لـــە هـــیچ و خـــۆڕا خوێنیـــان دەڕشـــتن

گـشت کەسـیش لەناسـت ئیـسلام بـێ دەنـگ بـوون
تـــەنها ڕۆمـــەکان بـــەهیوای جـــەنگ بـــوون

لـــە گـــشت لا هـــاتن خواناســـان بـــە جـــۆش
لـــە خۆشـــیان بۆخـــوا دەچـــوونە کڕنـــووش

ئـــەو هێـــزە یـــەکجار پـــاك و نەبـــەرد بـــوو
ســـەرکردەی ســـوپاش (ئوســـامە)ی مـــەرد بـــوو

گەرچـــی (ئوســـامە) هێـــشتا منـــداڵ بـــوو
تەمـــەنی پـــاکی دەوری بیـــست ســـاڵ بـــوو

هەنـــدێك لـــە یـــاران بـــە دەمـــە قاڵـــە
وتیـــان :- (ئوســـامە)هێـــشتا منداڵـــە

ئەگـــەر چـــی کـــوڕی (زەیـــدی)بـــەڕێزە
ناشـــێ ببێتـــە گـــەورەی ئـــەم هێـــزە

پێغەمبـــەری خـــواش کـــە بیـــستی ئەمـــە
فـــەرمووی :- ئـــەی یـــاران شـــتێکی کەمـــە

چـــــونکە زۆر مـــــەردە ئـــــەو شـــــێرە لاوە
بـــــاوکی لـــــە (مـــــۆتـــــە)شـــــەهید کـــــراوە

شـــــەرمە بـــــۆ ئێـــــوە پێـــــی نـــــابن ڕازی
مـــــەردێکی وایـــــە ، چـــــۆن دڵ بخـــــوازی

ئەوســـــا پێغەمبـــــەر فـــــەرمووی :- (ئوســـــامە)
بـــــڕۆ بـــــۆ (بـــــەلقا)کـــــە لـــــەلای (شـــــام)ـــــە

کـــــاتێ کـــــە دەچـــــیت ، کـــــەس پێـــــی نـــــەزانی
بـــــە ســـــەر دوژمنـــــان دادە بـــــەیانی

ئەوســـا لەشـــکر چـــوو هـــەموو چـــەك لـــە دەســـت
(مەدینـــــە)ی جێهێـــــشت بـــــۆ شـــــوێنی مەبەســـــت

وەســـــتا لـــــە شـــــوێنێ ، (جـــــروف)پێـــــی دەڵـــــێن
تـــــا بەیـــــەك بگـــــەن هێـــــزی پـــــڕ بـــــەڵێن

ئەوســـــا ســـــوپاکە کـــــە ویـــــستی بـــــڕوات
بـــــەڵام هـــــەواڵی پـــــڕ ئێـــــشیان بۆهـــــات

پێیـــــان ڕاگەیـــــشت ، نەخۆشـــــە ســـــەروەر
کەســـــیش نـــــازانێ ، بـــــە کـــــاری قـــــەدەر

هەرچـــــەندە لـــــە دوای شـــــەهیدی وێڵـــــن
نەشـــــکرا بۆیـــــان ســـــەروەر جێبـــــێڵن

نەشـــــــــیاندەزانی ، ماڵئاواییـــــــــە
کـــــەوا دەردێکـــــە ، ئـــــیتر دواییـــــە

لەوێ مانەوە بەڵێنیش وا بوو
ئەو کاتە بڕۆن کە سەروەر چا بوو

ئەستەمە ، دەرفەت ناوڕی داتەوە
تاکو دەروونیان ئاو بخواتەوە

باڵ دەگرێ گیانی هەر لەوساتەوە
بەرەو خواوەندی خۆی دەڕواتەوە

# نەخۆشكەوتنى پێغەمبەر(ﷺ)

پێغەمبـــەرى خـــوا كـــە پەخـــشى كـــرد ديـــن
خۆشـــى كـــرد لـــە بـــۆ خـــەڵكى ڕێگـــاى ژيـــن

لـــە ســـاڵى يـــانزەم لـــە مـــانگى (ســـەفەر)
نـــەخۆش بـــوو ئەوســـا گـــەورەى گـــشت بەشـــەر

هـــەر وەكـــو ئـــاو بـــوو بـــۆ گـــڕى كێـــشە
بـــەڵام نەخۆشـــى پـــڕ (تـــا) و سەرئێـــشە

بەســـەر ســـەرى هـــات ، كـــارى خودايـــە
زۆر بـــە ئـــازار بـــوو ئـــەو دەرد و (تـــا)يـــە

بـــە بـــەردەوامى هـــەر كـــات لـــە دواى كـــات
جەســـتەى پـــيرۆزى گـــەرم دادەهـــات

لـــەرز و (تـــا)يـــەك بـــوو پـــڕ لـــە مەترســـى
پێغەمبـــەرى خـــواى پۆشـــى بـــە فورســـى

خـــۆى پيـــشان نـــەدا بـــە بێهێـــز و ســـست
تـــاكو لـــەرز و (تـــا) يـــەك جـــار پـــەكى خـــست

دەچـــێتە ماڵێـــك لـــە ماڵـــەكانى
مـــاڵى (مەيموونـــە)ى پـــاك و خێزانـــى

بـــە دواى دا نـــاردن ، گـــەر بـــبن ڕازى
ئـــەوەى پێغەمبـــەر لێيـــان دەخـــوازى

چـــونكە لەوكاتـــەى كـــە وا نـــەخۆش بـــوو
مـــاڵى (عائيـــشە)ى بـــەلاوە خـــۆش بـــوو

چـــونکە ڕەفتـــار و خـــووی بـــاش هەمیـــشە
پێغەمبـــەر بـــۆ خـــۆی کردبـــووە پیـــشە

هـــەمووی دانـــابوون لـــە یـــەك پلـــە و ئاسـت
بۆیـــە ، لـــە هـــەمووان مۆڵـــەتی دەخواســـت

خێزانـــــەکانی جێـــــی شـــــانازی بـــــوون
بـــە داوای ســـەروەر بـــە دڵ ڕازی بـــوون

(عـــەلی) ئـــامۆزا و (عـــەباس)ی مـــامی
لەبـــەر دەســـتی بـــوون بـــە بـــەردەوامی

دەســـتی ســـەروەریان گـــرت زۆر جـــوانی
چـــوون لـــەبۆ مـــاڵی (عائیـــشە) خـــانی

هـــەر کاتێـــك کـــەمێ (تـــا)کـــەی لا دەکـــەوت
زوو بـــە دەســـت و بـــرد دەچـــوو بـــۆ مزگـــەوت

بـــۆ موســـڵمانان دەیکـــرد پـــێش نوێـــژ
دەگەڕایـــەوە بـــەبێ وتـــو وێـــژ

هـــەروەها ڕۆژێـــك زۆر داهـــات گـــەرم
فـــەمووی :- ئەمڕۆکـــە زۆر دێـــشێت ســـەرم

حەزیـــشی لـــێ بـــوو ، وەك جـــاری جـــاران
دانیـــشی لـــە نـــاو کۆمـــەڵی یـــاران

خێزانـــەکانی لـــەوێ بـــوون هـــەمووی
بـــە نـــەرمی و نیـــانی ئینجـــا کـــە فـــەرمووی :-

هەســـتن ، لـــە حـــەوت جـــێ نـــاوم بـــۆ بێـــنن
لـــــە ســــــەر تـــــاکو پـــــێ باشـــــم بڕشـــــێنن

ئەوســــا دەفــــەرموێ دایکــــی خواناســــان :-
حــــەوت کوپــــە ئاومــــان هێنــــا بــــە ئاســــان

بــــە ســــەرماندا کــــرد جــــا لــــەو کاتــــەوە
کــــەمێك باشــــتر بــــوو بــــە هــــۆش هاتــــەوە

زوو بــــە دەســــت و بــــرد جــــا خــــۆی پۆشــــتە کــــرد
بــــۆ مــــاڵی خوایــــان بــــە هێواشــــی بــــرد

موســــــــڵمانەکان پێــــــــی گەشــــــــانەوە
لــــــە نــــــاخ لــــــە خــــــودا دەپاڕانــــــەوە

ئەوســــا بــــۆی کــــردن گــــەلێك فــــەرمایش
پاشــــان زۆری کــــرد بــــۆ خــــوا ســــتایش

نــــــزای زۆری کــــــرد لــــــە کردگــــــاری
ئــــەوەی لــــە (نوحــــود) بــــووبێ بەشــــداری

فــــەرمووی :- ئــــەی خوایــــە لــــەوان ببــــورە
زوو گیراویــــــشە نــــــزای ئــــــەو نــــــوورە

هــــــەروەها فــــــەرمووی :- تێــــو دەگــــەیێنم
کــــێ تــــا ســــەر مــــاوە تــــا مــــن بمێــــنم

هــــیچ خــــەمێك مــــەخۆن ، گەرچــــی دوا جــــارە
مــــردن فــــەرمانی خــــوای کردگــــارە

کـــە ئەمـــــەی فـــەرموو ئـــیتر بـــە جـــارێ
لـــــە چـــاوی یـــاران ئـــاو هاتـــە خـــوارێ

ڕەنـــــگ و ڕوخـــــساری جـــوانی ئـــازیزان
زەرد بـــــوو هـــــەروەکو گـــــەڵای پـــایزان

لـــە ســـەر مینبـــەر بـــوو لـــەو کاتـــە گەرمـــە
فـــەرمووی :- کـــێ لێتـــان مـــافی لەســـەرمە

ئەگـــــەر لێمـــــداوە ، بـــا لـــێم داتـــەوە
مـــاف بـــە مـــاف ، تۆڵـــەی لـــێم بکاتـــەوە

یـــــەکێکیان هەســـــتا لـــــەو ســـات و کاتـــــە
وتـــی :- ســـێ درهـــەم هـــی مـــن لەلاتـــە

پێغەمبـــــــەری خـــــــواش زۆر میهرەبانـــــــە
فـــەرمووی :- ئـــەی (فـــضل) بیـــدەوە گیانـــە

پاشـــانیش فـــەرمووی :- هـــەر چـــاکە چـــاکە
چـــــونکە تۆڵـــــەی خـــــوا زۆر ترســـــناکە

لەگـــــەڵ خەڵکانـــــدا بـــاش بـــن ، وەرنـــــەوە
تـــاوەکو بەهەشـــت لـــەو ســـەر بەرنـــەوە

لـــە ســـەر مینبـــەر بـــوو لـــە کـــاتی وتـــار
بیلبیلـــــەی چـــاو و ســـــەروەری نـــازدار

لەبـــــەر نـــــازاری دەوەســـــتا جارجـــــار
گـــەلێك ناچـــار بـــوو ، ئینجـــا هاتـــە خـــوار

کـــــاتێ دابـــــەزی وای پێیــــــان فـــــەرموو:-
قـــەت ســـتەم مەکـــەن بـــە قـــەد تەڵـــەموو

لـــــە دڵتـــــان دەرکــــەن گـــشت ڕق و کینـــــە
باشـــیش بـــن لـــە گـــەڵ خـــەڵکی (مەدینـــە)

لـــــە بـــــەر لـــــەرز و (تـــــا) گەڕایـــــەوە مـــــاڵ
(تـــا)یـــەکی ســـەخت لـــە ســـەری بـــوو زاڵ

دەســــتێکیان خـــستە ســـەر دەســـتی نـــەرمی
نـــــەیانبینی بـــــوو (تـــــا)ی وا بـــــە گـــــەرمی

فـــەرمووی :- ئـــەی یـــاران گـــەر بشـــچم لـــەهۆش
ئـــــازارم زۆرە بـــــە قـــــەد دوو نـــــەخۆش

دڵـــی لـــە هـــۆش چـــوو ، جـــا بووڕایـــەوە
کـــاتێ بـــە هـــۆش هـــات زۆر پاڕایـــەوە

فـــەرمووی :- (نـــصرانی) و (یـــەهوود) ڕوو ڕەش بـــن
لـــە میهرەبـــانی خـــودا بـــێ بـــەش بـــن

لـــــە نـــــاو نـــــەزانی و بێهۆشـــــی مەســـــتن
گـــــۆڕی ســـــەروەران وا دەپەرســـــتن

بۆیـــــە وای فـــــەرموو ، تـــــا موســـــڵمانان
هەڵـــــەی وا نەکـــــەن ڕۆژێ لـــــە ڕۆژان

هـــــەر وا بـــــەو ڕەنگـــــە ڕۆژێ مایـــــەوە
پاشـــــان شـــــڵەژا و جـــــا بورایـــــەوە

(فاتیمـــــه)خــــانیش لـــــه بــــەر خــــۆی گریـــا
بــــــەڵام چـــــەپۆکی نــــــەدا بـــــه ســــــەریا

پێغەمبــــــەری خــــواش هــــــەر لــــــەو کاتـــــەوه
چـــــاوی هــــــەڵهێنا و بـــــه هـــــۆش هاتـــــەوه

لــــــەرز و (تــــــا) ، بـــــــەڵام زۆر بـــــه گرانـــــی
چـــوو بـــوو بـــه نـــاخی ، بۆیــــه نـــــەیتوانی

پـــــێش نوێـــــژی بکـــــا فــــــەرمووی :- ئـــــەمجاره
بـــــا (ئەبوبــــــەکر) بکــــــات ئــــــەو کــــــاره

(عائیـــــــشه)خــــــانیش گرتـــــــی بیـــــــانوو
تـــــاکو پێغەمبــــــەر دەرچـــــێ لــــــه خــــــانوو

وتـــــــی :- نـــــــاتوانێ زۆر دڵـــــــی نەرمــــــــه
خۆشەویـــــــستی تـــــۆی لــــــه ناخــــــا گەرمــــــه

(عائیـــــشه)ش تـــــــەنها هــــــەیبوو مەبەســــــتێ
دەیویـــــــست پێغەمبـــــــەر کـــــــەمێ هەڵبـــــــستێ

ئـــــازار و ئێـــــــشی لـــــــه ســــــەر نـــــــەمێنێ
باشـــــتر بـــــێ ، کـــــــەمێ چـــــاوی هـــــــەڵێنێ

بـــــــەڵام پێغەمبــــــــەر فــــــــەرمووی دووبــــــاره
بــــا ( ئەبوبــــــەکر) هەســــــتێ بــــــەم کــــــاره

(عائیــــــشه)ش وتـــــی :- ئـــــا ئـــــــەم بـــــــەڕێزه
بـــــه هـــــۆی تـــــۆ یـــــەکجار پەســـــت و بـــــێ هێـــــزه

خــۆی بــۆ ئــاگیرێ ، لــە بــەر ئــەو هۆیــە
دامــاوی ئــێش و ئــازاری تۆیــە

دڵــی ناســکە ، ئــەتۆی خۆشــدەوێ
هــەرگیز بــە بــێ تــۆ دڵــی ناســرەوێ

ئینجــا ســەروەری ئــەرم و ئاکــار جــوان
کــەمێ دڵگــیر بــوو لــە (عائیــشە) خــان

جــا (ئەبوبــەکر) چــوو بــە دەســت و بــرد
پــێش نوێــژی جــوانی بــۆ خواناســان کــرد

جــا هــەر لــەو کــاتیش (فاتیمــە)ی کــچی
زۆر بــە پەرۆشــی لــە بــۆ لای دەچــی

کــە دەبینــێ ، ئــەو باوکــە دڵــسۆزە
تەندروســتیەکەی یــەکجار ئــاڵۆزە

لــە بــەر ئــازاری زۆر شــڵەژا بــوو
هــەروەها تــین و وزەی نــەما بــوو

بــەلام لــە بــن گــوێی (فاتیمــە) خــانی
چــەند قــسەکی کــرد بــۆی بــە پــەنهانی

لــەو کــات (فاتیمــە)ی ژیــر و جگــەر گــۆش
بــەم قــسەیە بــوو دڵگــیر و پــەرۆش

ئەوســا دووبــارە پێغەمبــەری خــوا
وەك جــاری پێــشتر بــۆ (فاتیمــە) دوا

بەڵام ئەو جارە پێی گەشایەوە
بە دەم پێکەنین ئەوها مایەوە

* * *

چەند ڕۆژێك لە دوای کۆچی پێغەمبەر
وتیان :- (فاتیمە) ئەتۆی بەختەوەر

لەو کاتەی بابت کەوا نەخۆش بوو
چی بەتۆ فەرموو دڵت پەرۆش بوو

بەقسەی دووەمیش بۆ گەشایەوە ؟
چ مژدە بوو بۆت هاتە کایەوە ؟

جا کچی گەورەی سەرکردەی دینم
دەڵێ :- لەو کاتەی باوکی شیرینم

فەرمووی :- من دەمردم بەم دەردە سەختە
بۆیە غەمبار بووم لەو کات و وەختە

کەوا پێشکەنیم دووەمین جارم
ئەوها پێی فەرمووم باوکی نازدارم

(یەکەمین کەسم کە بگەم بە لای
لە کەس و کاری بە فەرمانی خوای)

شەش مانگان لە دوای کۆچی پێغەمبەر
(فاتیمە)ش هەمان ڕێگای گرتە بەر

هەزاران هەزار دروود و سڵاو
هەر هەمووی بۆندار وەك میسك و گوڵاو

لــــە گیـــان و گــــۆڕت نـــەی نــــوری چـــاومان
چـــــونکە ڕەحمــــــەتی ئێـــــستاش لــــــە ناومــــــان

بــــــۆ چــــــەندەمین جـــــــار بـــــــە وردە وردە
(تـــــــا)ی بۆهاتـــــــەوە گــــــەورەی ســــــەرکردە

تایــــــــەکی ســــــــەخت و گـــــــران دایپۆشـــــــی
بــــــــەجۆرێکی وا ، بــــــــردی لـــــــــە هۆشـــــــی

خـــــەڵك پـــــەرۆش بــــوون لـــــە جێگـــــای خۆشـــــی
چـــــونکە کــــــەم مــــــاوە مـــــردن بنۆشــــــی

جـــــا هــــــەموو خــــــەڵك دامــــــاو و پــــــەرۆش
بــــە دیاریـــــەوە بــــوون ، تـــــا دێتـــــەوە هـــــۆش

کـــاتێ بـــــە هـــــۆش هـــــات پێغەمبـــــەر لـــــەو کـــــات
فــــــــەرمووی :- (إن للمـــــــــوت ســــــــــکرات)

جـــا ئەگــــەر مــــردن بـــــۆ ئـــــەو ئـــــەوابێت
ســــــەرەڕای ئەمـــــــەش خۆشــــــەوی خـــــوا بێـــــت

چـــــۆن دەبێـــــــت لـــــــە بۆئێمـــــــەی تاوانبـــــــار
جـــا بـــا هـــەر ئێـــستا لـــە خـــۆ بکـــەین چـــار

# کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبـــــەری خـــوا لــــە ژێـــر نەخۆشـــی
زیــــاتر لــــە دە ڕۆژ ئـــازاری نۆشـــی

تـــاکو لــــە هێـــز کـــەوت ئــەو ڕاســـتیخوازە
ئێـــشی زۆر دەبـــوو بــــە بـــێ ئەنـــدازە

جـــا فـــەرمووی :- هـــەرگیز پـــێم نـــاکرێ ئاســـان
پـــێش نوێـــژی بکـــەم لــــە بـــۆ خواناســـان

بۆیـــە وای فـــەرموو کـــە کـــاتێ نوێـــژ بـــوو
بـــەڵام نـــەیتوانی بـــە پـــاڵ درێـــژ بـــوو

فـــەرمووی :- بـــا (ئەبوبـــەکر)ی یـــار بـــڕوات
بۆموســـــڵمانان پـــێش نوێـــژی بکـــات

(ئەبوبـــەکر)یـــش لــــەلای ســـەری بـــوو
یـــەکجار دامــــاوی پێغەمبـــەری بـــوو

بـــەڵام بـــە ناچـــار بـــە جێیهێـــشت لـــە مـــاڵ
بـــۆ پـــێش نوێـــژی چـــوو ئەوســـا بـــە هـــەر حـــاڵ

پێغەمبـــەری خـــواش جـــا کـــەمێ بـــاش بـــوو
هـــەروەها بـــاری لەشـــی هێـــواش بـــوو

ئینجـــا بـــە ویـــستی خـــوای میهرەبـــانی
ڕۆیـــشت بـــۆ مزگـــەوت نوێـــژی بـــەیانی

بـــەڵام خـــۆی خـــستە ســـەر شـــانە کـــانی
دوو لـــــە یـــــارانی ئامۆزاکـــــانی

لــــە نــــاو نوێـــژدا بـــوون کــــە دیتیــــان ســــەروەر
بــــــەرەو مــــــاڵی خــــوا ڕێـــــی گرتۆتەبــــــەر

لــــەو دەمـــــی یـــــەکجار دڵـــشاد بـــوون خــــەڵکی
وتیـــــان :- پێغەمبـــــەر چــــا بــــووە بــــەڵکی

پێغەمبـــــەری خــــواش بـــۆ مزگـــــەوت دەهـــات
هــــاوەڵان ویـــستیان نوێـــــژ بـــبڕن لــــەو کـــات

بـــــەڵام پێغەمبــــــەر زوو تێــــــی گەیانـــــــدن
دەســـــــتی پــــــیرۆزی کـــــــەمێك هەژانـــــــدن

تــــــاوەکو نوێــــــژ نـــــــەبڕن یــــــارانی
کـــــەوا پـــــێش نوێـــــژی ناکـــــا و نـــــاتوانی

کــــــاتێ بەمزگـــــــەوت گەیـــــــشت پێـــــــشەوا
بــــــە دانیــــــشتووی نوێـــــژی ئەنجامــــــدا

ســـــەلامی لـــێ بـــێ ڕەحمــــەت بـــوو ، ڕەحمــــەت
لــــــە پێنـــــاو ئیـــــسلام زۆری دی زەحمــــــەت

کــــــاتێ لــــــە نوێـــــژیان بوونــــــەوە یــــــاران
بــــــە کـــــۆ دانیــــــشتن بـــــە وێنــــــەی جــــاران

گـــــشت یــــاران چـــــونە ژێــــر بــــاری خۆشــــی
لـــــە ســـــەریان لاچــــوو خـــــەم و پەرۆشــــی

زۆریــــــان دەربــــــڕی شــــــوکرانە و ســــــوپاس
کــــــە چــــــابۆتەوە ســــــەرکردەی خوانـــــاس

هەرچـــی پـــاوەر بـــوو لای نـــەما پەســـتی
هەرکـــەس چـــۆوە ســـەرکار و مەبەســـتی

بۆیـــە ، کردیـــان پـــەرت و بـــڵاوە
وتیـــان :- پێغەمبـــەر چـــابوو ، تـــەواوە

ئەگـــەر چـــی قـــەدەر پەنجـــەی کێـــشا بـــوو
کـــەوا تەمـــەنی چـــەند ســـاتێ مـــابوو

بـــەلام لـــەوکاتی ئـــێش و ئـــازاری
لەســـەر نـــەما بـــوو ، شـــاد ببـــوون یـــاری

بۆیـــە (اســـامە) وا هاتـــە ســـەری
مۆڵـــەت بخـــوازێ لـــە پێغەمبـــەری

تـــاکو بـــەرەو (شـــام) بـــچێ بـــەخۆ و هێـــز
مـــادام چـــابووە ســـەرکردەی بـــەرێز

بلاویـــان کـــرد زۆر زۆر بـــە خۆشـــی
بـــەبێ دڵتـــەنگی و پەســـتی و پەرۆشـــی

بـــەلام داخەکـــەم وەك جـــاری پێـــشتر
لـــەرز و (تـــا)ی هـــاتێ ، بـــەلام بەئێـــشتر

ئەوســـا مزگـــەوتی جێهێـــشت بـــەرەو مـــاڵ
ئـــازار بەســـەختی کـــردی پەشـــێوحاڵ

(عائیـــشە)ش بینـــی ، دایگـــرت پەرۆشـــی
ســـەری ســـەرومری دانـــا نێـــو کۆشـــی

ئەوسـاکە فـەرمووی کـاتێ بـۆی دەرکـەوت
(اعنـي علـى سـكرات المـوت)

واتـە ؛یارمـەتیم بـدە میهرەبـان
لـە بێئاگـایی کـاتی گیـان کێـشان

ئـیتر چـاوانی لێـك نـان یـەکجاری
بـۆ خـۆی هەڵبـژارد خـوای کردگـاری

ماڵئـاوایی کـرد لـە ڕۆژی دووشـەم
لـە دوانـزەی مـانگی (ڕەبیعـی یەکـەم)

تەمـەنی پـاکی شەسـت و سـێ ساڵ بـوو
کـە موسـڵمانان ژیانیـان تـاڵ بـوو

لـە شـاری مەککـە سـێزدە سـاڵ تـەواو
خـەڵکی دوور دەکـرد لـە بـڕوای گـلاو

پاشـانیش دە سـاڵ لـە نـاو مەدینـە
خـەڵکی بـانگ دەکـرد بـۆ نـاو ئـەم دینـە

* * *

هـەزاران هـەزار سـلاوی بۆنـدار
لەلایـەن خـودای گـەورە و کردگـار

بـە نـاوی خـۆم و گـشت خـەڵکی دڵـسۆز
ببـارن بۆسـەر گیـانی تـۆی پـیرۆز

گیـانم قوربـانی خـوای گـەورە و تۆیـە
بـۆ سـەرفرازیم ڕێبازتـان هۆیـە

گەر بەموو لادەم لە ڕێبازەکەت
حەشرم هەرهەمووی داخ و ڕۆڕۆیە

جا هەر کەسێکیش ڕێبازێک دانێت
دڵنیام هەمووی هەڵە و درۆیە

ڕێگای تۆ نەبێ هەموو هەڵدێرن
شەرمە هەندێک کەس کەوا دەوێرن

ڕێچکە و ڕێبازی پڕ لە ئەفسانە
بەسەر ڕێبازی تۆ هەڵبژێرن

گەورە و سەرکردەی ڕێی ڕاستەقینە
سڵاوت لێ بن پڕ بەم زەمینە

بە هاوکاری خوای گەورە و باڵادەست
چەسپاندت کەوا هەر ئیسلام دینە

هەتاکو ماوین لە چاکەی چاکی
یادی ڕادەگرین لە دڵ بەپاکی

بەهۆی ڕێبازی ڕاست و بێگەردت
دڵی تاریکمان بوو بە ڕوناکی

## بێ تاقەت بوونی موسڵمانەکان

هــــەزاران ســـــڵاو لــــە گیـــانی ســـەروەر
بـــوو بـــە میـــوانی خـــوای بەدیهێنـــەر

کـــە بـــڵاو بـــۆوە ئـــەم دەنـــگ و باســـە
خـــەمبار بـــوون هەرچـــی خـــەڵکی خواناســـە

جـــا کـــە هـــەواڵی گەیـــشتە یـــاران
خـــەم و ناســـۆرە بـــاری وەك بـــاران

خـــەڵکی وا هـــەبوو لەســـەرکار و ئـــیش
نزیـــك بـــوو دڵـــی دەربـــچێ لـــە ڕیـــش

زۆری نـــەمابوو بەنـــەم هەواڵـــە
ڕیـــشیان ســـپی بـــێ و بـــبن بـــە خاڵـــە

کـــاتێ کـــە هـــەواڵ بـــەیاران گەیـــشت
هەریـــەکێك لـــەوان لـــە جێـــی خـــۆی دانیـــشت

هەنـــدێکیان لـــەوکات بێهەســـت و هـــۆش بـــوون
یـــەك دوانێکیـــشیان یەکـــسەر نـــەخۆش بـــوون

(عومـــەر)ی (خطـــاب) زەرد بـــوو بـــە جـــارێ
وەك گـــەڵای زەردی وەریـــــو لـــەدارێ

خـــەریك بـــوو گیـــانی شـــیرینی دەرچـــێ
هەربۆیـــەش یەکـــسەر بـــۆماڵیـــان دەچـــێ

کـــە چـــوو بـــۆ ماڵیـــان ، بـــینی لـــەولاوە
تـــەرمی پـــیرۆزی درێـــژ کـــراوە

پارچــــــــه قوماشــــــــێ تـــــــازەی (یـــــــــەمانی)
کێـــــــشرابووه ســـــــەر ڕوخــــــــساری جـــــــوانی

ئەوســـــــــا قوماشـــــــــــی لادا لەســــــــــەری
خــــــەریك بـــــوو پـــــەڕەی دڵـــــی هــــــەڵوەری

بــــــــڕوای نــــــــەدەکرد ، کـــــــەوا مردبـــــــێ
خـــوا گیـــــانی پــــاکی بۆخـــــۆی بردبـــــێ

دەیـــــوت :- وەك (موســـــای کوڕەکـــــەی عیمــــــران)
چـــــۆتە مەوعیـــــدی خــــوای زەوی و ئاسمــــــان

بــــــه مـــــــردن نەچـــــوه هــــــەتا هــــــەتایی
گیـــــانی دێتـــــەوە ، ئێـــــستاش نـــــا دوایـــــی

(موغــــەیرە)ش پێـــی وت :- ئـــــەی (عومـــــەر) ڕاوه
گومانـــــــــت نـــــــەبێ گیـــــــانی نـــــــەماوه

هــــــەوڵی زۆریانــــــــدا ، تـــــــاوەکو (عومــــــەر)
بــــــــڕوا بهـــــــێنێ بەمــــــــەرگی ســــــــەروەر

بــــــەڵام (عومــــــەر) دای ، جـــــــۆرە وتـــــــارێ
دڵـــــــی خـــــــەڵکانی هەژانـــــــد بــــــــەجارێ

لەمزگــــــــەوتا بــــــوو کەدەیـــــــدا وتـــــــار
دەربــــــارەی کۆچـــــــی ســــــەروەری نـــــــازدار

خەڵکەکـــــــەش وتیــــــان :- بزانـــــــه (عومــــــەر)
کۆچـــــــی یـــــــەکجاری کـــــــردووە ســــــــەروەر

(عومەر)یش لەوکات یەکجار گەرم بوو
بەرد لە ئاستیدا شل و نەرم بوو

فەرمووی :- بەوخوایەی کەمنی داوە
هەرکەسێك بڵێ (سەروەر نەماوە)

لە ملی دەدەم ئابەم شمشێرە
خەڵکەکەش ترسان زۆر لەو دلێرە

(ئەبوبەکر)یش زوو پێی نەزانی
چووبوو بۆ (سونغ) ماڵی خێزانی

هەروەها بەویش گەیشت هەواڵی
ئەویش بەپەلە هاتەوە ماڵی

تاکو بزانێ ڕاستە ئەو باسە
چوو بۆ دیار سەری ئەو خودا ناسە

لەسەری لادا قوماشی (یەمان)
ڕووی بەدەرکەوت وەك مانگی تابان

فەرمووی :- سپاردت گیانت ئەی دڵپاك
بە فیدای تۆ بم بە باب و بەداك

ئەوسا کەسەری نا لەگەردنی
گومانی نەما جا لەمردنی

خەریك بوو ، لەداخ بچێ لە هۆشی
پاشان پێی فەرموو :- تۆ هەر بۆن خۆشی

کـــە تێـــری مــــاچ کــــرد ڕووی پێغەمبـــەری
ئەوســـــا قوماشــــــی کێـــــشاوە ســــەری

بـــۆ مزگـــەوت چـــوو ، پاشـــان ئـــەو مـــەردە
تــــاوەکو خـــــەڵکان دەرکـــــات لــــەو دەردە

کـــاتێ چــــوو ببینــــی خـــــەڵك شـــێواوە
(عومــــەر)یـــش تونـــــدە و شــــیری کێـــشاوە

بینـــــی وا عومــــــەر تونــــــدی دەنـــــوێنێ
چــــاوی ســــوور بـــووە وەك گــــۆمی خـــوێنێ

دەیویـــــــــست خەڵکەکـــــــە تێبگـــــــەیێنێ
پێغەمەبــــەر هــــەرگیز نـــــامرێ و دەمـــێنێ

(ئەبوبــــەکر)یـــش لــــەو کاتــــە تەنگــــە
(عومـــــەر)ی بـــینی ئـــاوا ، بـــەو ڕەنگــــە

فــەرمووی :- ئــەی (عومــەر) کــەمێك هێــواش بــە
کـــەمێك ســـارد بـــەوە هـــێمن و بـــاش بـــە

بـــۆ هێنـــدە تونـــدی خـــوا لێـــت بـــێ ڕازی
هــــەمووان دەمــــرین ، بــــەبێ جیــــاوازی

یـــاران ڕاســـت دەڵـــێن ، ســـەروەر نــــەماوە
بــــەرەو میهرەبــــان چــــاوی لێکنـــــاوە

ئێــــستاش هەرکەســــێك ئــــەوی دەپەرســــت
ئــــەو مــــرد و مــــاوە خـــودای بالادەســـت

ئەوسا لەبۆی خوێند ئایەتی قورئان
سەد و چل و چوار لە (ئال عیمران)

(عومەر)ی ژیریش هەر لەوکاتەوە
کەمێك هێمن بوو و هۆشی هاتەوە

گومانی نەما بڕوای کرد وایە
ڕاستە مردنە و فەرمانی خوایە

ئەی (ئەبوبەکر) سڵاو بێ لەتۆش
کەوا خەڵکانت هێنایەوە هۆش

سەروەر کەکردی کۆچی یەکجاری
(ئەبوبەکری صدیق )ی یاری

بۆ جێنشینی گەورەی دڵسۆزی
پێی نایە شوێن پێی پاك و پیرۆزی

یاسا و ڕەفتاری بەپێی قورئان بوو
لەگەڵ گشت خەڵکیش ڕەفتاری جوان بوو

سڵاو لە گیانی شێرە سواری مەرد
لەوکاتە ناسکە بۆ دەرمانی دەرد

ئەوسا هەندێکیان لاشەی دەشۆرن
هەندێکیش کفنی بۆ هەڵدەدوورن

لە ژیاننامانەدا هاتووە باسی
سێ بەرگیان بڕی بۆ ئەو خواناسی

ئەوســـــاکە تـــــاك تـــــاك هەرهـــــەموو یـــــاری
نوێـــــژیان کـــــرد لەســـــەر لاشـــــەی ڕێـــــزداری

بیریـــــان کـــــردەوە ، کـــــە ئـــــەو بێگـــــەردە
لـــــە چ خاکێکـــــدا بکـــــەن ئەســـــپاردە

وتیـــــان لـــــە (مەککـــــە) جێـــــی باپیرانـــــە
یـــــان (قـــــودس) ، ڕووگـــــەی پێغەمبەرانـــــە

یـــــان لـــــە (مەدینـــــە) زۆر لێـــــی ڕازی بـــــوو
چـــــونکە بارەگـــــای بانگـــــەوازی بـــــوو

زۆر ڕای جۆراوجـــــۆر هـــــەبوون لـــــەناویان
لـــــە بـــــۆ ناشـــــتنی گلێنـــــەی چـــــاویان

(ئەبوبـــــەکر)یـــــش ئالـــــەو کاتـــــەوە
فەرموودەیـــــەکی بـــــە بیرهاتـــــەوە

فـــــەرمووی :- پێغەمبـــــەر ئـــــاوای فـــــەرمووە
(هـــــەر پێغەمبـــــەرێك لـــــەکوێ مـــــردووە

هـــــەر لـــــەو شـــــوێنەدا گۆڕیـــــان لێـــــداوە
لـــــەوێش ئەســـــپاردە بـــــەخاك کـــــراوە)

بۆیـــــەش ئەوشـــــوێنەی کۆچـــــی یـــــەکجاری
کـــــە لێـــــی کـــــرد ئـــــەوێ دەکـــــرێ دیـــــاری

شـــــوێنەکە ژووری (عائیـــــشە)خـــــان بـــــوو
بەویـــــستی خـــــودای گـــــەورە و لێـــــزان بـــــوو

لە چواردەی مانگی (ڕەبیعی یەکەم)
لە شەوی چوارشەم بەبێ زیاد و کەم

لەبەرچاو ون بوو گیانی پیرۆزی
بوو بە میوانی خودای بەسۆزی

پێغەمبەری خوا کەسێکی پاك بوو
بژاردەی خودای بەهێز و تاك بوو

لە هەوڵ دابوو لە هەموو شوێنێ
لە تاریکیدا مۆم داگیرسێنێ

خەباتی دەکرد لە نیزیك و دوور
تا ئیسلام ببێت بە یاسا و دەستوور

لەسەر گیانی بێت هەزاران سڵاو
سڵاوی بۆندار وەك میسك و گوڵاو

لە لای ئێمەوە زۆر بەدڵسۆزی
ڕێز بگرن بەرەو گیانی پیرۆزی

هەزاران هەزار هێندەی بونەوەر
سڵاو بن لەسەر گیانی پێغەمبەر

* * *

هەر خودا ناسێك حەزکات لە شادی
با قەت پێغەمبەر نەچێ لە یادی

بەبێ (موحەممەد) دوایین پێغەمبەر
لە دنیا و دوایی نیە ئازادی

* * *

ئەوانـــــەی کـــەوا بـــــە هـــۆش و هەســـــتن
وا چـــــاکە لێـــــرە کـــــەمێك بوەســــــتن

تـــــاکو بـــــزانن ، چ ســــەرکردەك بـــــوو
خــــەڵکی ڕزگـــار کـــرد لــــە بــــەرد پەرســـتن

★ ★ ★

چــــونکە هــــەر کەســـێك دڵــی بەگـــەرد بـــێ
کڕنوشـــــی لــــەبۆ بەنــــدە یـــا بـــەرد بـــێ

کەســــێك کـــــەوا خـــوا بــــەو بناســـێنێ
دەبـــێ چـــەند ژیـــر و لێـــزان و مـــەرد بـــێ

★ ★ ★

ســــەلاوات هێنــــدەی ئــــەرز و ئاسمـــــانێ
بـــۆنی خۆشـــتر بـــێ زۆر لــــە ڕیحـــانێ

ئــــەی شــــەماڵ بیبــــە لــــە بــــۆ (مەدینـــــە)
لەســـــەر مـــــەزاری پێغەمبـــــەر دانــــێ

زۆر بەشــــــەرمەوە لـــــــەلای بوەســـــــتە
پێــی بڵــێ:- ((فــەرهاد) لــە دووریــت پەســتە

ئـــەم ســـەلاواتەی بــۆ خــۆی بــۆ دێنــای
بـــەلام پێـــی نـــاکرێ بــێ قـــاچ و دەســـتە)

★ ★ ★

لـــــە کۆتایـــــدا مـــــن هیـــــوادارم
لـــــە هەرباســـێکدا گـــەر چـــەوت و خـــوارم

بـــــێ ڕەخنـــــە و لۆمـــــە ڕاســـــتیکەنەوە
بەنــــدەی بــــە هەڵـــەم ، زۆر گرفتـــــارم

لێرەدا ژیاننامەکە تەواو بوو

# مامۆستای من

مامۆستای من مامۆستای مامۆستایانە ، پێغەمبەرە
وانەکانی ناگۆڕەوە بە هەرچی زێڕ و گەوهەرە
ئەگەر هەرکەسێکیش حەزی لە خۆشیی ئێرە و ئەوسەرە
با بگرێتە بەر ڕێبازی ئەو مامۆستایە ڕابەرە

★ ★ ★

ئەیارانی مامۆستاکەم ، بەناچاری ، لە زۆر لاوە
لەدوای زۆر لێکۆڵینەوە دانیان بەم ڕاستیە ناوە
ئەگەر ئێستا لە ژیاندا با بەماوەی یەك فرێك قاوە
لە دونیا دەیکوژاندەوە گڕی تاوان و ئاژاوە

★ ★ ★

هەرگیز وێنەی نەبووە و نابێ ، بژاردەی پەروەردگارە
دین و ژیانی فێرکردم ، ئەو زانا نەخوێندەوارە
لە ڕێبازی لاناکەوم ، ترسم نیە لە سێدارە
ڕەزامەندی ئەو باشترە لە کورسی و دنیایەك پارە

★ ★ ★

گەر ئەو نەبا دەمگرتە بەر ڕێگایەکی بەمەترسی
یان دەبوومە داری دەستی یاسایەکی هار و برسی
بەلام ، کاتێك ئەوم ناسی ، ڕاوەستام و لەخۆم پرسی
ئەمهێشت ببم بە بزمارێك ، زۆرداران بمدەن لە کورسی

# ئەی گولاڵە

خۆشم دەوێی بە گیان و دڵ ئەی پێغەمبەر هەتا ماوم
بە گیان و دڵ بەدواتەوەم ونت ناکەم هەرتۆی چاوم
ئەی پێغەمبەر ونت ناکەم ناوم دانێ لە دەفتەرت
هەتا ماوم هەرتۆی چاوم لەدەفتەرت دانێ ناوم

★ ★ ★

بە یادی تۆ دڵم شادە باوەڕ بکە چرای دەستم
دڵم شادە کە تۆم ناسی سەرومەرەکەم هێز و هەستم
باوەڕ بکە سەرومەرەکەم بێ قەرارم لە دووری تۆ
چرای دەستم بێ قەرارم لە دووری تۆ گز و پەستم

★ ★ ★

ئەی شاگوڵی هەموو گولان بە تەنها تۆی گوڵی باخم
هەموو گولان تۆ چڵیانی خەمخۆری من هیوای ناخم
بە تەنها تۆی خەمخۆری من باڵ سوتاوم لە دووری تۆ
گوڵی باخم هیوای ناخم لە دووری تۆ دڵ بە داخم

★ ★ ★

ناوی پاکت چەند شیرینە سەرومەرەکەم ئەی گولاڵە
چەند شیرینە شانەی هەنگی گوڵە باخی پەرچەت ئاڵە
سەرومەرەکەم گوڵە باخی لەلام سەیرە ژاڵەش گوڵە
ئەی گولاڵە پەرچەت ئاڵە ژاڵەش گوڵە بەلام تاڵە

## سەلاوات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)

گـــەر حەزکـــەن بگـــەن بەســـوود و ئـــاوات
لەســـــەر پێغەمبـــــەر بـــــدەن ســـــەلاوات

تـــاوەکو بـــزین لەوســـەر زۆر بـــە چـــاك
ســـــەلاوات بـــــدەن لەســـــەروەری پـــاك

تـــــاوەکو دووربـــــن لەوســـــەر لـــــە ژاری
زۆر ســـــــەلاواتان بکەنـــــــــە دیـــــــاری

تـــا ســـەربەرز بـــن لـــە ژیـــانی ئەوســـەر
ســـــەلاوات بـــــدەن لەســـــەر پێغەمبـــــەر

ســـــەلاو بنێـــــرن پـــــر بـــــەو زەمینـــــە
لـــە بـــۆ پێغەمبـــەر ، گـــەورەی ئـــەم مەدینـــە

هـــــەردەم بنێـــــرن ســـــەلاوات ، بـــــەجۆش
لـــە بـــۆ ســـەروەری بێگـــەرد و بـــۆن خـــۆش

لـــــە چـــــاوی دڵتـــــان بتـــــۆرێنن خـــــەو
ســـــەلاوات بـــــدەن لـــــە دیـــــداری ئـــــەو

ســـــەلاوات بـــــدەن خـــــەڵکان بـــــێ زەحمـــــەت
لـــــە ســـــەر ســـــەروەری پێـــــشەواو ڕەحمـــــەت

وا باشـــــە بـــــۆ خـــــوا لـــــەم یـــــادە بـــــەتاو
ســـــەلاوات بـــــدەن لەســـــەر نـــــووری چـــــاو

لەســـــەر فـــــەرمانی خواوەنـــــدی (صـــــمد)
ســـــەلاوات بـــــدەن لـــــەســـــەر (مـــــوحـــــەمـــــەد)

## دەردی من

هیوادارم خودایە گیان لێرە و لەوسەر خۆش کەی حاڵم
لە جێی ژان و دەردی سەختم بەهەشت بکەی بە جێ و ماڵم
ئەگەر دەردم دەرمان ناکەی سەرگەردانێکی عەوداڵم
جگە لە تۆ کەس پێی ناکرێ شیرین بکا زاری تاڵم

* * *

ئەی خەڵکینە بەر لە ئێستا منیش یەکێك بووم وەك ئێوە
بەڵام خەڵات لە خواوە هات وتی :- بەسە ، مەجوڵێوە
لەو رۆژەوە هەموو توانام بخەمە گەڕ بە گشت شێوە
هێزی منداڵێکم نابێ ، وەکو ئەو بڕۆم بەرێوە

* * *

دەست و قاچ و هەموو لاشەم لە کار وەستاوە بەجارێ
وەکو گەڵای زەردی پایز دەستم وا شل بوون لە دارێ
نان و ناوم دەکرێتە زار خەڵکێکیش پێم دەڵێن زارێ
دکتۆرێکی وا شك نابەم بە دەرمان بۆم بکا چارێ

* * *

خەڵکی دەچنە گەشت و گوزار ، من هاودەمی ژان و ئێشم
لە ژێر چڕنوکی دەردەکان هەناسەی سارد هەڵدەکێشم

ئەو دەردە زۆر بە ئێشانە وەك مێشولە عومرم دەمژن
دەمیان ناوەتە هەناوم بە هیوانە زوو بمکوژن

بەڵام خوایە ناڕازی نیم ئەگەر هەتا مردن وابم
بە هیوامە لە دوارۆژدا سەربەرزی بارەگای خوا بم

زەمانی زووم هەر لە پێشە لەبەر چاوم لاناکەوێ
چاوەکانی لە دەروازەی ئومێد دانە ڕۆژ و شەوێ

مــــردن بەنەخۆشـــی نیـــە ، بزانـــە ئـــەی چـــاوی چـــاوم
چەندین کەسی بێ دەرد مـردن ، مـنی نەخۆشیش هـەرماوم

ئینجـا بـانگی دۆسـتانم کـەن بـا بـێن بـۆ لام هـەتا زووه
دەنـگ و ڕەنگـم لەگـەڵ دوێـنێ بـەراورد کـەن ئـاخۆ کـووه

خۆشـــی و هاتووچـــوونی جـــاران بەیـــەکجاریم لەبیرچـــووه
گـــەڵای تەمـــەنم دەوەرن دیـــاره مـــــردن نزیـــك بـــووه

جـا ئـەی دایکـە ئەگـەر مـردم هیـوادارم باسـم نەکـەی
ئەگـــەر هـــاتی بـــۆ ســـەرگۆرم کـەنامبینی گاســم نەکــەی

کـە دڵنیـای ئـەوەی بـوو مـرد زۆر خـەم نـەخۆی بـەمردنم
بـــەڵام بەهەشـــت لـــەبن پێتـــە توخـوا ئازادکـــە گـــەردنم

چـــەندین ســـاڵە هـــەر دەنـــاڵم و ژیـــن و مـــانم ناســـۆرمیە
ئەگـــــەر تـــــۆزێ نـــــاڕازی بم دوارۆژیـــــشم بەمجۆرمیـــــە

جـا بـە هیـوام خودایـە گیـان ئـەم هـەموو ئـازار و ئێـشە
لـــە ڕۆژی پاداشـــت و ســـزا بـــە قـــازانجم بـــۆ بکێـــشە

..........................................................

به پشتیوانی خوا تەواو بوو

## شاعیر لە چەند دێڕێکدا

- لە دایك بووی ١٩٦٩یە، لە دۆڵی (خواکورك)ی ناوچەی برادۆست.
- تا ٥ ی سەرەتایی لە (دێگەڵە) خوێندویەتی.
- لە ١٩٨٧ ژیانی هاوسەری پێکهێناوە.
- ئێستا خاوەنی پێنج منداڵە.
- لە ساڵی (١٩٩١)ەکەوە توشی نەخۆشی شەلەلی هاتووە. و هەردوو قاچ و دەستی کار ناکەن .
- ئێستا لە ناحیەی ڕزگاری( کۆمەڵگای تۆبزاوە) دادەنیشێ.

..................................................................

تێبینی

تکایە هەرکەسێك هەر ڕەخنە و پێشنیازێکی هەیە یان نیازی دووبارە چاپکردنەوەی ئەم کتێبەی هەیە دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات.

فەرهاد جەوهەر برادۆستی   ٠٦٦ ٢٥١ ٩٦ ٦٩

دلێر علی حمد   ٠٧٥٠ ٤٦٣ ٣٠ ٥٩

یان

پۆستی ئەلیکترۆنی dlerali@gmail.com

..................................................................

﴿لەسەر ئەرکی خێرخوازان چاپ کراوە﴾

## مامۆستای من

مامۆستای من مامۆستای مامۆستایانە ، پێغەمبەرە
وانەکانی ناگۆڕێنەوە بە هەرچی زێڕ و گەوهەرە
ئەگەر هەرکەسێکیش حەزی لە خۆشیی ئێرە و ئەوێرە
با بگرێتەبەر رێبازی ئەو مامۆستایە رابەرە

★ ★ ★

نەیارانی مامۆستاکەم ، بەناچاری ، لە زۆر لاوە
لەدوای زۆر لێکۆڵینەوە دانیان بەم راستیە ناوە
ئەگەر ئێستا لە ژیاندا با بەماوەی یەك فرێك فاوە
لە دونیا دەیکوژاندەوە گڕی تاوان و ئاژاوە

★ ★ ★

هەرگیز وێنەی نەبووە و نابێ ، بژاردەی پەروەردگارە
دین و ژیانی فێرکردم ، ئەو زانا نەخوێندەوارە
لە رێبازی لاناکەوم ، ترسم نیە لە سێدارە
رەزامەندی ئەو باشترە لە کورسی و دنیایەك پارە

★ ★ ★

گەر ئەو نەبا دەمگرتە بەر رێگایەکی بەمەترسی
یان دەبوومە داری دەستی یاسایەکی هار و برسی
بەڵام ، کاتێك ئەوم ناسی ، راوەستام و لەخۆم پرسی
نەمهێشت ببم بە بزمارێك ، زۆرداران بمدەن لە کورسی

دیزاینی بەرگ : دلێر علی حمد

نرخی تەنها ( 4000) دینارە

چاپخانەی رۆشنبیری / هەولێر